# حەفت ترینگە



## قامتێك لەوشەدانی وراتی کۆیە

وشە – پەند – دەستەواژە – مەتەڵ - جنێو – تووك-مەسەلۆکە

رەهبەر سەید برایم

ناوی کتێب:حەفت ترینگە
ئامادەکردنی: رەهبەر سەید برایم
دیزاین: هەرێم عوسمان
چاپ: چاپخانەی تاران
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
ساڵی چاپ: ٢٠٢٠
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٥٠٦) ی ساڵی ٢٠٢٠ ی پێدراوە

## سەراورد[1] وترنجاندن

زۆر لە شاعیرانی کورد وەک پێویست بایەخیان بە زمانی کوردی داوە بۆ نمونە حەزرەتی نالی:

**تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**
**ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لە عەمدەن وا دەکا**

---

**کـــەس بە ئەلفازم نەڵێ۳۱۰ خـۆ کوردییە خۆ کردییە**
**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکـــــا**

پیرەمێردی نەمر وەسیەتی کردووە گوتویەتی: (ئامۆژگاریم ئەوەیە شوێن مادە مەکەون، تا ئەتوانن خزمەتی ڕاست ومقابیلی قەوم وزمان و وڵاتەکەتان بکەن...)، لە (مستەفا سائیبی)خوشکەزای نیگەران بووە، چونکە نامەیەکی بە تورکی بۆ خاڵی نووسیوە. بۆیە بەو شێوەیە وەڵامی داوەتەوە:

**مستۆ وادیارە تۆش جل خوار ئەکەی**
**ئەستۆت ئەخورێ و مەیلی بار ئەکەی**
**نامە ئەنووسی بە زبانی تورکی**
**لە میللییەتدا مائیل بە شیرکی**
**ئێمە کە کوردین لەلامان وایە**
**کوردی زبانێکە زۆر بێ هاوتایە**
**ناوی پێغەمبەر حەمە ڕەسوڵە**
**نوێژمان بەکوردی لای خوا قەبوڵە**
**ئەگەر تەڵقینم بەکوردی نەدرێ**
**گوێی لێ ناگرم با کفنم بدڕێ**

تاکە مەلیکی کوردستان (شێخ مەحمودی نەمر)ئەولادی ڕەسول ونەوەی کاک ئەحمەدی شێخ زمانی کوردی پێ پیرۆز بووە. بۆیە شێخ مەحمودی نەمر بەنازناوی (نوربەخشی)لە شیعرێکدا گوتویەتی:

**گەر مانیعی حەققی میللەتی کورد بێن عەرەب**
**بێشک نوێژەکانم بەکـــــــــوردی قەزا ئەکەم**

---

[1] سەراورد: سەرەتای کار

لەیەکەم حکومەتی کوردی باشووری کوردستان، لە ساڵی ١٩١٨ لە زەمانی شێخ مەحمودی مەلیک زمانی کوردی لە شاری سلێمانی بەزمانێکی ڕەسمی ناسێندرا لە کاروباری ناوخۆدا.

***

زۆر لە نوسەر وشاعیرانی کورد بە عەشق وپەرۆشەوە سەوداسەری زمانی زگماکی کوردی بوونە وپەرەیان پێ داوە وەک گۆران گوتویەتی:

**لەپێش هەموو شتێکا چونکی کوردم**

**چۆلەکەی نـــاو هەزاران داوی وردم**

ئەمانە بێ درێغ هەوڵیان داوە هەروەک حوسێن حوزنی موکریانی وگیوموکریانی وشێخ محەمەدی خاڵ و د.نوری تاڵەبانی وهەژار وهێمن وئیبراهیم ئەحمەد و عەبدوڵڵای حەسەن زادە وعەلائەدین سجادی ود.جەمال نەبەز ود.کەمال فوئاد ود.عیزەدین مستەفا ڕەسول ومامۆستا عوسمان هەورامی ومامۆستا عەبدولکەریم شێخانی وحەمەسەعید حەسەن ومامۆستا عەبدول ڕەحمان فەرهادی...تەنانەت ئەفسەری سیاسی ڕۆژهەلاتناسی(مێجەرسۆن١٨٨١-١٩٢٣)بەریتانی وبێگانەبوو بایەخی بەزمانی کوردی داوە، چەند نموونەیەکمان لێ هەڵێنجا ناکرێ باسی هەموویان بکەین هەشە وەک حەزرەتی حاجی قادری کۆیی زۆر بایەخی بە زمانی کوردی داوە، لە شیعری (ئەی بێ نەزیر وهەمتا هەرتۆی کەبەر قەراری) ستایشی پەروەردگار دەکات لە کۆتاییەکەی دەڵێت:

**مەعلوومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی**

**تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری**

پەرۆشی زمانی کوردی ومیللەتی کورد بووە، تەنانەت لە کابرایەکی کۆیی توورە بووە، چابووە لێی نەداوە، بەڵام جنێوی پێ داوە، چونکە گوتوویەتی چ دەبوو گەر بە کوردی نەبوایە:

**کوردەکی کۆیی کەوتەوە یادم**

**پێم گووت: ئایا چلۆنە ئۆستادم**

***

کەس نەماوە بە غەیری کاک ئەحمەد
شەیخی مەعرووف و عالمی ئەرشەد
چاکە ئێستا دەکا لە بۆ کوردان
تەرجەمەی شەرع وئایەتی قورئان
واقیعەن خزمەتی لە بۆ خوایە
چ دەبوو گەر بەکوردی نەبوایە
هەر کەوای گوت وەها موکەدەر بووم
وام دەزانی کەوا لەدین دەرچووم
گوتم ئێستاش لەسەر کەری ماوی
چابوو مستم نەدا لەنێو چاوی
کوردی ئاخر بلێ چییە عەیبی
هەر کەلامی حەقە نییە عەیبی
لەفزی کوردی بڵاونەبوو گرد بوو
وا لەمابەینی ئێمەدا تێ چوو
لە فەساحەت وبڵاموعەر رابێ
چ قیامەت بە ئەرمەنیش نابێ
یا لەگەڵ فارسی چ فەرقی هەیە
بۆچی ئەو ڕاستە بۆچ ئەو کە چەیە
با وجودی ئەگەر بکەی دیققەت
تێی دەگەی کام لە کامییە سیرقەت
چونکە ئێمە قەدیمترین لە ئەوان
بەتەواریخی جوملەیی ئەدیان
ئاخر ئەم عەقڵەیان هەبوو بۆیێ
گەر سولەیمانی یە وەیا کۆیێ
بوونە ئوستادی فارسی وتازی
تاگەیشتن بە فەخرەکەی ڕازی

تازی واتە عەرەبی. حەزرەتی حاجی قادری کۆیی هێندە عەشقی زمانی کوردی بووە، پێی وابووە گەر مێژووی کورد بەکوردی بنوسرابا بایەخێکی زۆری دەبوو، جنێوی بەو کەسانە داوە کە زمانی باوکیان نازانن:

**ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانی**
**موحەققەق داکی حیزە بابی زانی**
**وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانی**
**تەفەننون خۆشە گەر چاکی بزانی**
**کتێب ودەفتەر وتەئریخ وکاغەز**
**بەکوردی گەر بنوسرایە زوبانی**
**مەلا وشێخ ومیر وپادشامان**
**هەتا مەحشەر دەما ناو ونیشانی**

یان لە شیعرێکی دیکەدا دەفەرمووێ:

**لە کوردی حەزنەکا کوردێ مەڵێ بۆچی وەیا چۆنە**
**لە دایکی پرسیارێ کە، ئەو بێچووەی لە کوێ هێنا**

شانازیی بە زمانی کوردییەوە کردووە، پێی وابووە زمانی کوردی زمانێکی شیرن وفراوان وپڕ بەلاغەتە وهیچ زمانێک نایگاتێ! بۆیە گوتویەتی:

**شەبیهی جۆلا کە ڕازی نەبێ بەسەردڕ[2]ی خۆی**
**مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا**
**بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ**
**لەبێ تەعەسوبی کوردانە بێ ڕەواج وبەها**
**کەخۆتی تێ نەگەیەنی لە نیکتەکانی نەگەی**
**دەڵێی هەموو هەزەیانە[3] خودا بەلای لێ دا**
**بەلاد ئەوانی کە سەڕافی زێڕ وقسەن**
**بەشەهرەوایی دەزانن چ سکەیەکە ڕەوا**
**چ حیکمەتێکە کە ئاساری کوردە ناموسی**
**نەکیمیایە نەعەنقا، لەبەینی ئێمە نەما**

***

---

[2] سەردڕ:جل وبەرگی چنراوی دەستکردی جۆلا

[3] هەزیانە: هورێنە، وڕێنە

لە شیعری حەزرەتی حاجی قادری کۆیی، نموونە زۆرە، بەگژ ئەوانەدا چووە کە زمانی کوردییان بەلاوە گرینگ نەبووە، ئەو بێ منەت ڕوونی کردۆتەوە کەدەبێت بایەخ بەزمانی کوردی بدرێت وبنووسین:

**کاکە ئێمە موئمینین نەرووسین**
**بۆ چ کفرە زوبانمان بنووسین**

ئەو کاریگەرانەی شیعری حەزرەتی حاجی قادری کۆیی وشاعیران ونوسەر وزمانەوانی گەورە ولیزانی وشەی کوردی هەیە لە کۆیە هەروەک (تایەر سادق- مەسعود محەمەد-عەبدولکەریم شێخانی-فوئاد تایەر سادق)بۆ ڕێنووس وخاڵبەندی (د.ئەکرەم خامۆش)! وایان کرد عەوداڵ بم بگەڕێم بەدوای وشەی کوردی وگوڵەوەچنی بکەم بۆسەر خەرمانی زمانی کوردی!

فەرهەنگ زۆرن، هەمەجۆرن، بەڵام دانەری یەکەم فەرهەنگی کوردی-عەرەبی(یوسف زیائەدین پاشا ئەلخالیدی ١٨٤٢-١٩٠٦) فەرهەنگی کوردی داناوە، ئەو فەرهەنگە کە کوردی-عەرەبیە ساڵی ١٨٩٣ لە ئیستانبوڵ چاپکراوە بە ناوی (قاموس الهدیە الحمیدیە فی اللغة الکردیة) واتە فەرهەنگی دیاری حەمیدییە کوردی-عەرەبی، هێشتا زانراو نییە ناوبراو بە مسۆگەری کورد بووە یان نا[4]؟!

***

بابم (سەید برایم) زور هۆگری وشەی کوردی بوو، زۆر وشەی بێگانەی دەکوردکرداند دەیسەلماند کە کوردییە، سیپارەیەکی دەستنووسی هەیە زۆر وشەی گەڕاندۆتەوە بۆسەر زمانی کوردی نوسیویەتی(فەلەستین)کوردییە لە (فەلەستاندی)یەوە هاتووە، یان (فەلەنشین)واتە فەلەجێ نشینن، یان (بەغداد)لە(باخی داد)ەوە هاتووە، دەجلە وفورات کوردین (دیجلە-دەچڵە-دەلقە) (فورات) واتە (فرەهات)، (موسڵ) لە (مووزل)ەوە هاتووە، چونکە ئێزیدی وکاکەیی لێی ژیاون وموویان زل ودرێژ بووە، جارێک لە ماڵەوە بووین ئێمە

[4] ڕۆژنامەی باس ژمارە(٤٢٠)ی ٢٠١٩/٣/٥، لە نوسینی(جان دۆست)بەناونیشانی (یوسف زیائەدین پاشا ئەلخالیدی)

گوتمان بابه ناوی هەموومان کوردییه ناوی تۆ عەرەبییه گوتی هی منیش کوردییه چونکه ئیبراهیم له (برای مه)وه هاتووه! واته برای ئێمه جا ئێمەش دەمانکرده پێکەنین دەمانگوت (بەرازیل) کوردییه له (بەرازی زل)ەوه هاتووه، (ئیسپانیا) له(ئەسپی پان)ەوه هاتووه، (ئەمریکا) له (ئەم ڕێگا)ەوه هاتووه! شکسپیر-له شەکەپیرەوه هاتووه، تاریخ کوردییه له تاریکەوه هاتووه، چونکه مێژوو تاریکی وتەم و مژی زۆر تێدای، یان دەیگووت (شارع)کوردییه له (شارێ)یەوه سەرچاوەی گرتووه، نوسینێکم بڵاوکردۆتەوه به ناونیشانی (هێشووەک وشه له باخچەی سەیدبرایم)بەدووروودرێژی باسی ئەو وشانەم کردبوو! ساڵی ۱۹۷۹ حاکم پێشڕەوی برام سەربازی عێراق بوو له (روتبه)، بابم چووه سەردانی گوتبووی کوڕم روتبەش کوردییه بای هات بوو! گووتبووی (روتبه)له (رووته باوه) هاتووه! (بەسرە) (بۆسەیره)یه، (تکریت)(تاکەڕێته).

حاکم پێشڕەوی برام له زانکۆی بەغدا خوێندکاری یاسا وڕامیاری بوو، جارێک له زانای مەزن (مەسعود محەمەد)ی پرسیبوو، (دەستوور) لەچی یەوه هاتووه؟ ئەویش گوتبووی:کوردییه واتای دەست ئەستوور، مامۆستا (تایەر سادق)لەکتێبی (ڕێنوس)له ل۱۳۱ نوسیویەتی(دەسته ستور-دەست ئەستوور-بەهێز).

ڕۆستەم حەوێزی زمانەوان وشاعیر دەیگووت(مەکه ومەدینه)کوردین واته (وامەکه ومەبینه)گەر دەسەڵاتم هەبوایه(بکەو بدینه)م دروست دەکرد!!

لەناوەندی کۆیه مامۆستا عەلی مستەفا چەلەبی ناسراو به عەلی کوردی (عەلی لاله) زۆر کوردیزان بوو، دەرسی کوردی دەگوتەوه، زۆر خوێندکار سەرکەوتوو نەدەبوون لەدەرسی کوردی، بەس من(مەعفو)بووم، چونکه زۆر حەزم له دەرسی کوردی وشەی کوردی بوو! ئەویش کاری زۆر تێ دەکردم کەدەیگوت فرمێسک-ئێستر-ڕۆندک-ئەشک-سرۆشک-رۆنکی-ئەسرین،رۆنتک. له نوسینێک باسم کردبوو کەوا (خائین-جاسووس-حەسود-مەلا-کامل-شامل-قەحپه- وەهم-شەرع-شەریعەت-قانون-وەسیله-قەناعەت-قەشمەر-کەفیل-غەریزه-تەزبیح-جەدەلی - مرجع-ئەمین-تەماح-حەرام-حەلاڵ...هتد).

لەکوردیدا پرپێست ودەقاودەق نییە وشەیەک نییە بەرامبەریان رەسەن بێ وداتاشراو ودروستکراو نەبێ! لەزمانی کوردی ستەم لە (جاشک وسیخوڕ)دەکرێ ئەو دوو گیاندارە بەستەزمان وبەسوودە بە خائین ناو دەبرێن.

***

کەبوومە پێشمەرگە گوێ بیستی هەندێ وشە دەبووم ودەمنوسی یەوە، لەسەر پارچە کاغەزێک، ساڵی ١٩٧٩ بە پێشمەرگایەتی یەکەم جارم بوو مهاباد ببینم، بەحەزوئارەزووی خوێندنەوە وگەڕان بەدوای کتێبدا چوومە کتێبخانەی (سەیدیان) مەلایەکی کەپووخڕ ومەندیل سپی وجبەی مەلایانە وجلکی کوردی لەبەربوو، (سەیدیان)کتێبە کوردییەکانی زۆر چاپ دەکرد وبڵاوی دەکردنەوە، بەشێوەزار، زانی خەڵکی ئەو ناوە نیم بۆیە گوتی: خەڵکی کوێی؟ گوتم:کۆیێ، گوتی:شێوەزارمان لێک نزیکە' باس هاتەسەر وشەی کوردی، زانیاری هەبوو گوتی: ئێوە دەڵێن (لاق) چونکە لقێکە لە جەستە لاق ڕاسترە لە قاچ یان (لینگ)لینگ کوردییە وئینگلیزیشە کورد دەڵێ لینگەفرتێ، لینگی لێ راکێشا، قاچ لە (قچ)ی تورکیەوە هاتووە!

گوتی: چاو-چەم-چەشم سەرچاوە، هەموویان یەکن، گووتی:پەنجە(پێنجە)دەست(دەهەست)ە! قوون واتە کون نزیکە لە گوون، سەرلە(سەرێ)یەوە هاتووە، سەلکەپەنیر، سەلکەپیاز، سەلکەتوور، (سەر)سەرۆک وسەرەکی!! عەرەب (سەر)ی پێچەوانەکردۆتەوە کردویەتی بە عەرەبی بۆتە (رئس). لووتی خڕ بوو گوتم ئەدی (لووت)گوتی(لوو)ەکە بەدەم چاوەوە نوساوە، (دفن)لە فن کردنەوە هاتووە، گوتم: ئەدی کەپوو، یەک بەخۆی پژمی گوتی:(هەپوو)واتە کەپوو!! هەمووی کوردیین.

بە گوێرەی کتێبی (ڕێنووس)ی تایەر سادق،پیتەکانی عەرەبی ژمارەیان (٢٨)پیتە، ژمارەی پیتە کوردییەکان (٣٤)پیتە، ئەلف وبێی ئاڤێستا لە(٤٨)پێکهاتووە، (ژ)و(پ)لە عەرەبیدا نین، لە گوشەیەکی تەنزئامێزی (د.شێرکۆ عەبدوڵڵا) یەکێک دەڵێ: پیتی (پ)و(ژ) لە عەرەبیدا نییە، ئەویش دەڵێ:بەجدیتە ئەی چۆن (ئەپژمن)!!

له سالی ١٩٨٧ گویزرامەوه بۆ تیپی خاڵخالان بەسەرتیپی، لەناوچەی شوان وشێخ بزێنی وقەلا سیوکە، هەستم دەکرد باش لەشێوەزارمان ناگەن! جارێک یەکێک بەردەمی گرت بووین پێم گووت (لاکەوه) مام برایمی کانی عەرەبان گوتی چووزانی (لاکەوه) یەعنی چی، بلێ لاچۆ! باواجی حاجی مەلامان لەگەڵ بوو زیاتر گاڵتەی دەکرد ودەیگوت:( بالیفێکم[٥] لۆ بینه لەبن هەنگر[٦]می دانێم)یان دەیگوت: کێشکە[٧] لەبن سابیتە[٨]ی جریوه جریویانه، دەبووه پێکەنین وراڤەکردن! لەکۆبونەوەی مەڵبەند کە قسەم دەکرد شەهید (جەلالی حەمەی محه) دەیگوت: توخوا قسەبکە قسەکانت زۆر خۆشن! دەڵێن: خۆشترین وجوانترین ئاخاوتنی زمانی کوردی، موکریانه. لەڕۆژهەلاتی کوردستان.

***

زۆرجار (مام جەلال) وشەی کۆییانەی بەکاردەهێنا، جارێک له کۆبونەوەیەک توورەبوو له فەرماندەکان گوتی:(ماڵتان بەقوڕ نەگیرێ تالانی گەیشتوته ئەوەی هەتا(بن ساپیته)ت بردووه، بەیەکێکی گوت که قەڵەو وقەلبگران بوو ها(حەپەتان)بەمووچەخۆری دەگوت(مەئموور)خۆی دەیگوت دەمەوێ بەسۆرمانجی قسەبکەم واته بەسۆرانی وبەکرمانجی، لەوتاردان ونوسین وچاوپێکەوتن هەمیشه (دە)ی بەکاردەهێنا نەک(ئە)هەروەک دەیگوت:(خەبات دەکەین)حەزرەتی (نالی) لەشیعرەکانی (دە)ی بەکارهێناوه نەک(ئە).
بەشێک له خۆشناوەتی ودیانەو ڕەواندز وهەندێ ناوچەی مەرگه وەک خورخوره ویاخیان(ئە)بەکاردەهێنن بەلام هەولێر وکۆیە وپشدەر ورانیه وموکریان(دە)بەکاردەهێنن!
نەوشیروان مستەفا وشێرکۆ بێکەس وئازاد جوندیانی ود.شێرکۆ عەبدوڵلا(ئە)یان بەکاردەهێنا!. بەلام د.بەرهەم ساڵح (دە)ی بەکاردەهێنا. دەبێت ساغ کرابێتەوه

---

[٥]بالیف: سەرین
[٦]هەنگر: هەنگل-بن باخەل
[٧]کێشکە:چۆلەکە
[٨]ساپیته:بن میچ

(ده)ڕاستره له(ئه) هەشه پەیرەوی ناکا. مامۆستا عەبدولکەریم شێخانی دەڵێ: لەسەرەتای حەفتاکان کە دەستکرا بە وەرگێڕانی کتێبەکانی قۆناغی ناوەندی، ئەوە بەتەواوی ساغکرایەوە بۆ فرمانی ڕانەبردوو(ده)بەکاربێت، ڕاستتره له(ئه)وەک: دەڕۆم، نەک ئەروم. بەڵام هەندێک کەس ناوچەگەرییان پێ خۆش بوو ویستیان ئەو بڕیارە هەڵگێڕنەوە.

***

ساڵی ٢٠١٤ ماڵ ومنداڵم لە هۆڵەندا گەڕانەوە کوردستان، ڕادی کوڕم لەدایک بووی ١٩٩٤ لە هەولێر، لە هۆڵەندا برادەرێکی هەبوووەک خۆی منداڵ ناوی (نیکی)بوو، هۆڵەندی بوو پێکەوە لەگەڵ ڕادی کوڕم گەمەیان دەکرد، (نیکی و ڕادی) زمانیان لێ تێک چوو بوو، نیکی وەک ڕادی بەخێزانەکەمی دەگوت: دایە ئاو دایە شیر، دایکی (نیکی) دەیگوت: زۆرم پێ خۆشە کوڕەکەم (نیکی)فێرە کوردی بێ، چونکە زمانێکی دیکەیە، زمانی هۆڵەندی هەر فێردەبێ وای بیردەکردەوە، بەتێکەڵی قسەیان دەکرد، (ڕادی) کە گەڕایەوە ئەو هەموو خەڵکەی دەبینی. پێی گوتم بابە زمانی کوردی (کەر)ی زۆر تێدایە هەمووی دەژمارد، هەروەک (میزکەر، فشەکەر، قسەکەر، گووکەر، نوێژکەر، یاریکەر، گەمەکەر، ڕاوکەر، پەڕەکەر، سەماکەر، شەڕکەر، خەنجەرکەر، سوارکەر، نانکەر، دەمامکەر، دەرزەکەر، بێزارکەر، گوڵکەر، مەراییکەر، کاربەڕێکەر، کارەکەر، نێرەکەر، جاشکەکەر، تەقەکەر، شاییکەر، تەماشاکەر، چاولێکەر، ڕێ خۆشکەر، دڵخۆشکەر، کەتنکەر، ناوبژیکەر، هتد...).

خێزانەکەم نازناویان عەسکەرییە وسەربە کەرکوکە. دەیگوت شوێنەکەی دایکم (دووکەر)تێدایە، (عەس-کەر) (کەر-کووک)، ئەوسا لەشاری سلێمانی زۆربەی شاگردەکانی ڕێستورانەکان بادینی وئێزیدی بوون، کەدەچووین شاگردەکان دەیانگووت (کەڕەمکە)ڕادی دەیگووت ئاخر بۆ (کەر)ی بکەین نەیدەزانی مەبەستی ڕێز وفەرمووە!

لە نووسینە هەرەباشەکان کەمن دیتبێتم نوسینەکەی مامۆستا عەبدولکەریم شێخانی بوو، بە ناونیشانی (کێشەی زمانی کوردی لە نێوان (کەر وگا)دا، چونکە

ئێستا بێ لێکۆڵینەوە وبریار دەیگۆڕن (کەر)بە(کار) (گا)بە(گە)وابەکار دەهێنن، مامۆستا بەڕاستی جوانی نوسیبوو، نیشانەی پێکابوو. چ خەوشێکی تێدا نییە، گەر پاشگری (کەر وگا)بەکاربهێنین ومایەی شەرمەزاریش نییە وەک هەندێک کەس هەستی پێ دەکەن

***

لە هۆڵەندا لە (ئەنیش خەدێ) بووین شەقی زەمانە فڕێی داینە ئەوێ ساڵی ١٩٩٦، هەمیشە پاسکیلمان لێ دەخوری جارێک مامۆستا (جوامێر کەرکوکی) و(سەروەر بابان) دەعوەتیان کردبووم، منیش درەنگ بوو هەر نەچووبووم نەیان دەزانی بۆ دواکەوتووم وبۆ نەچوم دەیانگووت بۆ هەر نەهاتی؟ منیش بەشێوەزاری کۆییانە وتم:وەڵاهی منداڕێکی تورک تایەی پاسکیلەکەی (فس)کردۆتەوە، پێم ناکرێ بێم! گوتیان چی چی (فس)! گوتم: ئا(فس)، هەر پێدەکەنین و منیش گوتم باشە ئێوە دەڵێن چی، گوتیان دەڵێین:(فش)، منیش گوتم: بۆ هەر دەبێ (فش)ی تێدا بێت، باشە ئەگەر پیاوێک گونی گەورە بێت چی لێدەکەن وچۆنی (فس)دەکەنەوە، گوتیان:بۆی (فش)ی دەکەینەوە، ئەوجا تێ گەیشتن وتێر پێ کەنین

جارێک یەکێکی خەڵکی سلێمانی دەیگوت: وشەکانتان بە ئینگلیزی دەچێت وەکو(ئەنگۆAngo)یان هەندێ وشەتان هەیە بە (هندی)دەچێت، کابراش گوتبووی:(کێهە)سلێمانییەکە گوتبووی ئەمەئەمە، حەزرەتی حاجی قادری کۆیی بۆ حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە گوتویەتی:

**بەغەیری جەدی ئێوە (کێهە)دانا**

**لە کوردستان ئەساسی عیلی دانا**

د.کەمال فوئاد لە دانیشتنێکدا لە بەرلین پێی سەیربوو کۆیی بە (سپڵ)دەڵێن (فاتەرەش)بەهەڵوورژە-هەڵووچکە دەڵێن(حەمەدەرەش). جارێک کۆییەک لە چێشتخانەیەکی سلێمانی خواردنی لەبەردەم بووە وکەوچکی لەبەردەست نەبووە بە شاگردەکە دەڵێت (مراکم لۆ بینە) شاگردەکە گوتبووی(مراک[1])چییە،

---

[1] مراک:کەوچک

کۆییەکەش گوتبووی(شیو[10])ی پێ دەخۆم، شاگردەکە گووتبووی سەرم لێ تێکچووە هەر تێ ناگەم.

(عەبدوڵلا کەریم) کۆیی بوو بە (عەبدەی سۆفی کەریم)دەناسرا لەناو کۆییان، کارمەندی فێرتێنەری بوو لە (هەڵەبجە)جارێک چووبوو لای میوە فرۆشێک لەوێ گوتبووی کیلۆی(گندۆرە بەچەندییە)کابراش نەیزانی بوو(گندۆرە)چییە، دوایی تێگەیشتبوو مەبەستی (کاڵەک)ە بۆیە ناونرا (عەبە گندۆرە)، نازناوی بە (عەبە گندۆرە)ڕۆیی.

هەندێ خوێندکاری ڕەواندزیمان لەگەڵ بوو دەیانگوت (ئهێ کاکێ شفتیین دەینان کووز کووزن دەنکردن دەنخواردن).

نەنکی خەسووم مابوو ناوی (فاتمە)بوو، خەڵکی گوندی عەسکەر بوو منی دەناسی، جارێک پێی گووتم دەستت خۆشبێ کچەکەت ناو لێناوە (ڕەندی خان) چونکە هەوارێک بوو لە گوپتەپە(٢٤)کەس لەو خزمانەی عەسکەر بەکیمیاباران شەهیدکران، گوتی: ئەو تایفە گەورەو گرانە کەس عەقڵی پێ نەشکا ناوی منداڵێکی ناو لێ بنێ(ڕەندیخان) مەبەستم زەینی باش بوو، جا دەمگێڕایەوە کەوا نەنکی خەسووم ماوە یان منداڵەکانم نەنکی نەکیان ماوە ئەوە نەنک دیارە بەڵام نەنکی نەنک چی پێ دەڵێن، یەکێک گوتی: پێی دەڵێن(نەدیتە ونەبیرە)نەکەس دیتیتی ونەکەس لەبیریتی! نەدیتە ونەبیرە تازەن نەم بیستبوو.

***

ئەو وشە ورستانە بە هەناسەی ناوچەچیەتی تۆمار نەکراون! بەڵکو دەمانەوێ وشە وزاراوە فراوانتر بکەین ونەشاردرێتەوە، کۆیە شارێکی کۆن وشوێنەوارە، گوندی واهەیە شوێنەواری سێ هەزارساڵی لێ دۆزراوەتەوە. لەڕاستیدا گوندەکان کانگای وشەی نایابن، دەوڵەمەندن لەپەند ورستە و وشەی ئاژەڵداری، کشتوکاڵی وسروشت، کوڕیژگەی شاری ڕەنگە هەندێ لەو وشانەیان هەر نەبیستبێ، یان لایان نامۆ بێت! گوندەکان زمانی کوردییان فراوان کردووە، مۆڵ

---

[10] شیو:چێشت

وهۆڵ ومووچە ودەرماڵە... لە لادێ کانەوە سەرچاوەی گرتووە! لە ئامادەیی شلەشاربیەکی خوێندکارمان لەگەڵ بوو، گێلۆکەبوو، پێیان دەگووت(وەرە)دەیگوت:(وەرم)نەیدەگوت:بێم، ئێمەش دەمانگووت:دەستوور ویاسای ڕێزمانی کوردیت تێک داوە.

***

(فاروق عەلی مەولود) بە گوزارشت و وشەی ڕەسەن وڕاستەقینە قسەی دەکرد جوان دەدوا، لە پێشمەرگایەتی دەیگووت: فەرموون با بچینە گوندی (داربەسەر) گوندی خۆیان بوو، (با قۆلنجی گیسێک وکاوڕێک بتەقێنین) مەبەستی میوانداریەتی ودەعوەت بوو، یان (کاکە حەمەی سوێرەڵە) کە مێوان دەهات بانگی (مێری)ی خێزانی دەکرد دەیگووت (مێرێ خۆش بە) واتە خواردنێکی باش ئامادەبکە (مێرێ) ناوی خێزانەکەی بوو!.

(شێخ مستەفای قازبەگیان)یەکێک مێوانی نەبووبا یان نەهاتبا کنی دەیگوت(بەنانی من زگی دێشی)یان دەیگوت: شاییکەرە، چونکە لەشاییی هێندە تەقە دەکاتن فیشەکی پێ نامێنێ وهەندەش شاباش دەدا پارەی پێ نامێنێ بۆیە (کەر)ە، کە لە کوردەواریدا باوە مێوانی درەنگ وەخت نانی لەسەر خۆیەتی، واتە چی ئامادەیە ئەوە لەبەردەم مێوان دادەنرێت، بەڵام شێخ مستەفای قازبەگیان: دەیگوت مێوانی درەنگ وەخت نانی لەسەر خۆیە، نەک لەسەر خۆیەتی، دەبێ نان وخواردنێکی باش ئامادە بکرێ بوی با ئارامی هەبێ لەسەر خۆبێ، درەنگ نان بخوات! یان دەیگوت مەسینە ودەستشۆر پێش هەموو شتێک دەچنە بەهەشتێ، چونکە موژدەی نان خواردنیان پێیە!. یان شێخ ڕەفیقی قازبەگیان خولقی کێکی بکردبا دەیگوت: حەزمان لە گۆشتە بەشکم بەهۆی میوانداریی تۆوە گۆشت بخۆین.

مام سابیری باخچەوان باوکی هونەرمەند (ئیبراهیم سابیر(دێوانە خۆم)باخی ئۆمەر خوچانی بەدەستەوە بوو لەکۆیە، کە (توو)ێ دەگەیی، دەگەڕا ودەیفرۆشت هاواری دەکرد (قەسپەتوو) یەڵڵا (هەڵقوومی کوردی)!

لە پێشمەرگایەتی دەچوینە گوندی (میرسەیدی) خارە عەبدەی میر سەیدی لۆمەی یەکێکی بکردبا دەیگوت (بەشەڕەفت، بەشەڕەفت کابرا هێندەی بێ کەڵکە

دیرهەمێکی کون کرای نایێنی!!. جاران لە کۆیە کە(شفتییان) دەفرۆشت هاواریان دەکرد شفتی[11]بەشەرتی چەقوو[12]ی، بەشەرتی خوون[13]ی کەپوو[14]ی.

***

شەهیدی سەرکردە (شەوکەتی حاجی مشیر) لە تەپی سەفای شارەزوورەوە هاتە بالیسان، بوود لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی هەولێر ناوی بێ تەلەکەی(هەورامان)بوو. لەشەڕێکدا لە گوندێک کە چەکداری ڕژێم بوون، بڕیاریان دا مەڕومالات وگاوگۆلکیان بهێنن بۆ پێشمەرگە وخەڵکی هەژار، جا بە شێوەزاری کۆییانە پێمان گوت ئەوە (گاڕان)ەکە هات، ئەویش ئەو وشەیەی نەبیستبوو نەیدەزانی مەبەستمان چییە گوتی: (گاڕان)چییە لەراهی خوای تانکە، زرێپۆشە، هێزە، تێمان نگەیەنن، ئێمەش پێمان گوتن (گاو مانگا وچێل) چی پێ دەڵێن لای ئێوە ئەویش گوتی: (گایەل) بووە پێکەنین وبەو وشەیە ئاشنابوون.

لەشەڕی جوندی ئیسلام لەگەڵ مام غەفوور لە گوندەکانی هەڵەبجە وەک (باخان) دەچووین بۆ هەنار کڕین وهەنار خواردن، (مام غەفوور) لە دوورەوە دەیگوت: ئەو (شەقەدۆر)ە، هەناری چاکی لێیە! (شەقەدۆر) واتە دۆڵێکی شەق کراو، پڕبوو لە هەنار!!

***

+/وراتی کۆیە وا ڕێکەوتووە بەیەک شێواز وشێوەزار نائاخفتن بەڵکو جیاوازی زۆرە، هەندێک گوند هەیە(لۆ)بەکارناهێنن دەڵێن (بۆ) لەگەڵ ئەوەشدا لە کتێبی (سێگردکان وسێبەر ونیشنەکانی)دا لەنوسینی (ئاراس ئیلینجاعی)هاتووە لە ل٢٠ بەناونیشانی (شێوازی دەربەندییەکان)نووسیویەتی:

(ئۆمەرگومبەتییەکان وسێگردکانییەکان بەشێوەزارێکی (دیالێکتی) لوڕی قسەدەکەن، کاریگەرییان لەسەر شێوەزاری خەڵکی گوندی (کانی لەلە)ش

---

[11]شفتی:شووتی

[12]چەقوو:چەقۆ

[13]خوون:خوێن

[14]کەپوو:لووت

جێهشتووه هەرچەندە دەربەندییەکانی کانی لەلە زۆرینەی دانیشتوانی گوندەکە پێک ناهێنن، شێوەزارەکانی(کرماشانی، کەڵوڕی، کولیایی، پیرەوەندی،لەکی ولوڕیی)هەموویان یەک دیالێکتی سەربەخۆ پێک دێنن وبەدیالێکتی(لوڕی)ناو دەبرێن.

دەربەندییەکانی ئەو دوو گوندەش خۆیان بە بن دیالێکتی کەلهوڕی دادەنێنن ودەڵێن بەشێوەزاری کەلهوڕی قسەدەکەن ولەرۆژهەڵاتی کوردستانەوە لە سنوری شاری کرماشانەوە هاتوون، ئەمانە بەدرێژایی مێژووی هاتنیان بۆ خوارووی ڕۆژئاوای کۆیە شێوەزاری خۆیان پاراستووە وقسەی پێدەکەن).

لە کتێبی (هەتا لە ویرمان نەچیون)لە نوسینی (ئیدریس عەبدوڵلا ئۆمەر گومبەتی)لە ل١٠ نووسیویەتی: (ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە لە ناوچەکانی (ئۆمەرگومەت وسێگردکان وکانی لەلە وسێکانی) بەجێ ماون، ئەم پەندو گوتانە گەوهەرێکی پڕبایەخ وبەهادارن ومایەی شانازین و زیندوویێتی ئەم شێوەزارە دەگەیەنن، تەنانەت ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە وەک لە پیاوە بەتەمەنەکان وبیرمەند وشارەزاکانی مێژووەکەیانەوە دەیگێڕنەوە کە زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ تێپەڕدەبێت بەسەر نیشتەجێ بوونیان لەم ناوچەیە کەچی تا ئێستاش پارێزگارییان لێکردووە هەربەم شێوەزاری لوڕی-کەلهوڕی دەئاخێون وقسە دەکەن.

+/ (حەفت ترینگە)چێشتێکی تێکەڵ لە باینجان و کوولەکە وتەماتە وپیاز و...حەوت جۆرە کەرەستەیە تێکەڵ دەکرێ لە بابەتی چێشتی مجەورە(مزەوەرە).

ئەو وشەو وتە وپەند وزاراوانە، زیاتر وراتی کۆیە دەگەرێتەوە، بەخۆشناوەتی ومەنتکایەتی وئۆرمزیار وجاف وشێروانی وئاکۆیی ولوڕیی وهەمەوەند وسورچی ومەنگوڕ وبلباس وبابان ومامەش ومەنمی وپالانی وشێخانی وجولەکە ودیان وزەردەشت...لەوێ ژیاون.

زۆر لە بنەماڵەکـان لە بـاکوور ورۆژهەڵاتـی کوردسـتانەوە هـاتوون بۆیە بەرفراوانە شـارو دەشـت ولادێیەکـان وپیشـەوەرەکان دەگریتەوە!. جـاران شـەقڵاوە وهیـران وخەلەکـان وبنـاری کۆسـرەت و... سـەر بە وراتـی کۆیە بـوون، کـۆیە کـاروان سـەراو جێـی بازرگـانی وبـازارێکی بەهەرمـێن وپرتەکیەوخانەقای شێخەکان ودیوەخـانی ئاغایەکان وخوێندن وحوجرەی فەقێیان وخـان وکەسـایەتی گەورە بـوو ئەو تێکەڵیە وایکردبوو فراوان بێ لەڕووی زمان وکەلتوور وکۆمەڵایەتی وپێشکەوتن ورەوشەنبیرییەوە.

ورده تێبینی وڕوونکردنەوە هەروەک:

+/ لە شێوەزاری کۆیە زۆرجـار (وێ)دەبێتە(و) لەهەمـوو بارێکدا وانییە چـونکە سەیرە(نوێ ونوێژ وخوێری وکوێستان)بەکاردێت نـایگۆڕن وەک خۆی بەکاری دەهێنن هەرچەند لە هەولێر نوێ دەبێتە (نوو)وشەی (خوێری)دەبێتە (خـۆری)ئەو وشانەی دەگۆڕدرێن هەروەک:

(گوێز:گـووز، دروێـنە:دروونە، سوێر:سـوور، خوێن:خـوون، شوێن:شـوون، خوێندن:خووندن، دوێنێ:دوونێ، کوێر:کۆر، جوێن:جوون، خوێندەوار:خووندەوار، هتد...).

لەهەندێ وشەدا (و)نامێنی هەروەک:

(گوێ:گێ، خوێ:خێ، کوا:کا، چوار:چار، توانی:تانی، کوێخا:کێخوا، کوێ:کێ).

یان دوو (وو)دەکرێتە(ی)هەروەک:

(ڕۆژوو:ڕۆژی، تێنـوو:تێنی، سوێند:سـووند، سوێسکە:سووسـکە، خانوو:خـانی، هێشوو:وشـی، وەکـوو:وەکی، بێزوو:بێـز-بێـزی، زیندوو:زینـدی، ماندوو:مانـدی، مۆروو:مۆری، مازوو:مازی، هتد...).

دهۆکیش هەندێ وشەی (وو)دەکەن بە (ی) هەروەک:

(خەسوو:خەسـی، موسڵ:میسـڵ، تـومەن:تیمەن، بروسکە:بریسـکە، حوکمەت:حیکمەت، هتد...).

هەروەها (و)لەهەندێ وشەدا دەبێتە(ی)هەروەک:

(فەوتاوە:فەوتـــایە، ماوە:مـــایە. برژاوە:بـــرژایە، سوتاوە:ســـوتایە، نەماوە:نەمـــایە، هەتیو:هەتیم، نەمدیوە:نەمدیتبە. هتد...).

لەهەندێ باردا (ێ)دەبێتە (ی)بۆ نموونە هێنان:

(دەرهێنان:دەرهینـــــان، ژن هێنـــــان:ژن هینـــــان، واز هێنـــــان:واز هینـــــان، وەبەرهێنان:وەبەرهینان، درەنگ هێنان:درەنگ هینان، نامێنێ:نامینێ، نایهێنێ:نایینێ، هتد...).

** ,

لەکۆیە هەروەک شێوەزاری بادینی (و)دەبوو بە(ف) هەروەک:

(پـێخەف، شـفتێ، کەفـت، ئەشـکەفت، مزگەفـت، حەفـت، حەڤـدە، نەفـت، نـوێژی خەفتنان)

لامی قەڵەو لە ئاڤێستا ومادی کۆن نەبوو، زانای مەزن (مەسـعود مـحەمەد) لە کتێبـی (زاراوە سـازیی پێـوانە) لە ل١٢ نووسـیویەتی(وەک دەشـزانین لە کـۆن کۆنەوە دەنگی (ڵ) لە کوردییدا نەبووە چونکە ئاڤێستا دەنگی (ڵ)ی تێدا نییە، لەبەری سۆران (کەرەباب)ی پێدەڵێن لە(کەهرکەباب)ەوە هاتووە، بەواتای (مەلی بابـــان) تەنـــانەت (کەڵەشـــێر)یش لە(کەهرکەشـــێر)ەوە بەواتـــای (مەلـــی وەک شێر)هاتووە، بەڵام دەنگی(ر)ی لاواز تێدا گۆڕاوە بە (ڵ) لەکتێبی (هەندێ بابەتی زمان ورێنووسی کوردی) لە ل٢٤٠ نووسیویەتی(ئاڤێستا زمانی دێرینەی هەموو کوردسـتان بـووە) زانـای ئەکـادیمی وزانسـتمەند مامۆسـتا تۆفیـق وەهبـی بەگ (١٨٩٠-١٩٨٤) ساڵی ١٩٢٣ ریزمانی کوردی ئامادەکردووە، سـاڵی ١٩٢٩ کتێبی (دەسـتووری زمـانی کوردی)بەچـاپ گەیانـدووە، شـارەزای هەشـت زمـان بـووە، چاکترین فەرهەنگی زمانەوانی تا ئەو دەمە بەهەردوو زمـانی کوردی وئینگلیزی بڵاوکرابێتەوە لەگەڵ (ئیدمۆنز)ئامادەیان کردبوو، دوایی لەگەڵ (ئیدمۆنز)نێوانیان تێـک دەچێـت لەسـەر کەرکـوک لەسـاڵی ١٩٦٦، لەدیدارێکـدا گوتـویەتی (بـۆم دەرکەوت کە بنـاغەی زمـانی کـوردی ئاوێسـتایە کە لە هەمـوو زمانەکـانی تـری ئێران زمانی کوردی لەهەموویان پتر پەیوەندی خۆی پاراستووە... زۆر وشـە کە لە کوردییـدا هەیە وخەڵـک بە عەرەبـی یـان بە فارسـی دادەنـا بـۆم دەرکەوت

ئاوێستایی یە وکوردییە)[15]، لەدەڤەری کۆیە. زۆر (ل)دەکرێتە(ر)ی ناسک خەڵکی سلێمانی پێی سەیرە ماڵ بکرێ بە (مار)، لامی لاواز ناکەن بە(ر)ی ناسک هەروەک(مل، کل، خولانەوە، پل، شل..هتد)، کۆیی هەندێک وشە زۆر بەخەست وقورسی(لامی قەڵەو)بەکاردەهێنن هەروەک:

(شقاڵتە، قۆڵتێ، گڵۆپ. هەڵقووم، شەپڵتە، سەڵتە،هتد....).

لەهەندێ وشەش بەکاردێت هەروەک:

(وەڵڵاش، ئەرێ وەڵڵا. بەرەڵڵا).

وشە دینییەکان:

(ئەستەغفرڵڵا، لائیلاهەئیلەڵڵا، رەسولەڵڵا، حاشاوەلیللا، هتد...).

خالید دلێر پێم وایە یەکەم نوسەرە کە چیرۆکێکی بەشێوەزاری کۆییانە بڵاوکردۆتەوە بەناوی(کەوای نەکرای) لە ساڵی ١٩٥٨ چاپیکردووە لە بەغدا.

**

هەندێ لە نووسەران دەیسلەمێنن کەوا (ل)نییە (ر)ناسکە، نموونە دەهێنەوە هەروەک:

پێراو:پێڵاو نییە، چونکە پێی دەرۆی، لەپێ رۆشتنەوە هاتووە.

سمێر:سمێڵ نییە، چونکە (مێر)واتە پیاو.

بار:باڵ نییە، هەروەک باری کەر وهێستر.

چرک:نەک چڵک مامۆستا(تایەر سادق) لە کتێبی رێنووس نووسیویەتی لە ل٨٧ لە تورکی وفارسیش هەر(چرک)دەگوترێ وشیرەی شەکر لە فارسی وتورکیش شیرە دەگوترێ نەک شیلە.

+/لەشێوەزاری کۆیە (د)قووت نادرێت چۆن بنووسرێت وا دەخوێندرێتەوە بەڵام بەغداد دەبێتە بەغدا یەک (د)نامێنێ، یان زۆرجار دەگوترێ(پەیا)نابێ لەجیاتی (پەیدا) کۆیی زۆر (تیێدایە)بەکاردەهێنن.

---

[15] لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی دا وتار وبیرەوەریی هاوار ل٥

گرپە:نەک گڵپە، پێ دەچێت لە(گڕ)ەوە هاتبێ تەنانەت (ئەحمەد موختار جاف) لەدیوانەکەی لە ل١٢٩ گوتویەتی:

**گرپە وگڕەی تە نوورە بڵێسەی هەناوەکەم**

**سیروان وتانجەڕۆیە خوڕەی ئاوی چاوەکەم**

دڕۆپ:نەک دڵۆپ، بە ئینگلیزی وهۆڵەندی (Drop)ە.

وەرام بەکارهاتووە نەک وەڵام، (هەژار موکریانی)لە دیوانی (بۆ کوردستان)لە ل١٣ لە شیعری (هەر کوردم)لە بەغدا (١٩٤٨/٧/٩)نوسیویەتی:

**بەکوردی دەژیم بەکوردی دەمرم**

**بەکوردی دەیدەم وەرامی قەبرم**

لەهەمان دیوان لە ل٧١ ناونیشانی شیعرێکی بەناوی (وەرام بۆ کچێکی سۆڤیەتی) لەگیرتسن-موسکۆ (١٩٥٩/٢/٢٨)نووسیویەتی، (لەوەراما ئەمەم بۆ نووسیوە) لە ل١٧٩ نووسیویەتی (وەرامی پێشمەرگە).

پێ دەچێت مشتومر هەبوو بێ، هەبێ پێی وابووبێ (ل)، (ر)یە، بۆیە لە(جەمالاغای حەکیماغای سلێمانیم) بیستووە، گوتوویەتی:جاران ژنانی سلێمانی بەشێوەزاری کۆییانە قسەیان دەکرد و(رێ)ناسکیان بەکاردەهێنا، ئەو دێڕە شیعرەی پیرەمێری نەمریشم لەوێ زانیوە هەرچەند لە دیوانەکەی نەمدۆزیوەتەوە گوایە پیرەمێردی نەمر گوتویەتی:

**هەرکەسێ ئەگەر (لامی)پێ (رێ)یە**

**ئەزانێ پیری شەوکێل[16] لە کوێیە**

لە وەختی شاخ حاکم پێشرەوی سەید برایم وفازیل قەساب لە راگەیاندنی (ی.ن.ک)بوون، گفتوگۆیان دەبێت لەسەر(ل)و(ر)حاکم پێشرەو دەڵێ:لامی قەڵەو، (رێ)ی ناسکە! چەند نمونەیەک دەهێنێتەوە بۆ سەلماندنی، فازیل قەسابیش دەڵێ:باشە دەیسەلمێنم بەلام چ لەو دروشمە دەکەی:

**کەم بژی وکەڵ بژی**

---

[16] شەوکێل:شەوکێر

له مامۆستا عەبدولکەریم شێخانیمان بیستوە، (برادەرێک دەیگوت: جاران لە سلێمانی لامی قەڵەو (ڕ)سووک بوو، بۆ نمونە ئەگەر بیانگوتایە دەبێ هەیکەلێکی بۆ بکرێ، دەیانگوت هەیکەرێکی بۆ بکرێ).

***

وشەی(ط)لە کوردیدا نییە کەچی زۆرجار لە شێوەزاری کۆیە بەکاردێت هەروەک:

فلتەفلت، شقاڵتە، ناطانی، شەڵتە، سەڵتە، سوڵتان، قەڵتارە، چەڵتووک، سەڵت وقۆڵت، تەڕ. لەسەر زاران دەبێتە (ط).

قورگ لێراهاتن بۆ فۆنەتێک گرینگە، هەندێ وشە هەن وەک خۆیان دەرنەبڕدرێن، هەموو کۆیە و هەولێر کۆبکەینەوە، ناتوانی وەک سلێمانیەکی بڵێت: هەنگوین-گۆیژە-چنگیان، چونکە گەرووی لێ ڕانەهاتووە! بەجۆرێکی دیکە دەردەبڕێت، هەروەک سلێمانییەکیش وەک کۆییەک ڕەنگە ناتوانی بڵێ(ناطانی)!، یان وەک کچە کۆییەک پڕبەزاری خۆش نەبێ بڵێ:بەرێ-توو بەشقی خوای-برنجی دەپارزنم!

کەسم نەدیوە وەک هونەرمەند (بورهان محەمەد) بتوانێ وەک کۆییان قسەبکات، زۆرجار دەیگوت (وەکی برێ ی)واتە (وەکو بڵێ ی)یان لاسای سێوەی هونەرمەند بەو شێوەزارەی خۆی بکاتەوە، وشەکانی وەک خۆی بڵێتەوە.

***

کتێبی (حەفت ترینگە)سالآنێکە پێوە ماندووبوویم لە گوند وشاران، لە کتێب ولەفەیسبووک ولەکۆڕ ودانیشتن ودابەش بوون وگەشت وگەڕان وگفتوگۆ وخوێندنەوە، تا تەلەفۆن، ئەو وشە ورستە وپەندانەم نوسیویەتەوە، (دەزانم **زۆریش ماون ئەوەندەمان پێکراوە)** هیوادارین پترو زیاد پەرەی پێ بدەین خەرمانەکەی بە بەرەکەتتر بکەین. من بەتەنیا نەبوویم هاوکاریم زۆربوون گەر ئەو زاتە خۆشەویستانە نەبوونایە ڕەنگە ئەو بەرهەمە وەک پێویست نەدەبوو

سوپاســیان دەکەیــن وبەهەڵەبــڕی وپێــداچوونەوە وزیــادکردن ولابــردن وساغکردنەوە وڕاستکردنەوە بۆ ماندووبوونی ئەو زاتانە:

١- مامۆستا عەبدولکەریم شێخانی

٢- مامۆستا عبدلرەزاق بیمار

٣- مامۆستا مەولود ژاکاو

٤- مامۆستا محمەمەد داریاس

٥- نەرمین عوسمان

٦- رەفیق عەبدول رەحمان

٧- د.دەریا حەویزی

٨- چەلەنگ ڕۆستەم حەویزی

٩- ئاراس عەبدولخالق

١٠- ئارام ساڵح غەفووری

١١- جەمال ساڵح خۆشناو

١٢- باوان محمد صدیق

١٣- هەرێم عوسمان

١٤- سەرمەد صلاح صابر

هیواداریـن چێژ لە کتێبی (حەفت ترینگە) وەربگرن، بۆ زمانی یەکگرتووی کـوردی بەسـوودبێ وگـوڵبژێری لێـبکەن وزمـانی کـوردی پـێ دەوڵەمەنـدتر وفراوانتر وشیرینتر بێت. گوڵزاری زاراوەکان پەسەندتر ورەنگینتربێت

**رەهبەر سەید برایم**

نەورۆزی ٢٠٢٠

# أ

ئاشچی : – چێشتلێنەر ـولێنەر، کابان. (ئاش وئاشپەز–دوو وشەی فارسین) مەنجەڵی زنجیردار بوو، هە ەنجەڵەی ژنێکی (ئاشچی) لەسەر بوو (مێژووی کۆیە – تاپەر ئەحمەد حەوێزی) ل ١٠

ئاشچی: بۆ کەسێکی چێـ تلێبنێ کوردییەکی ڕەسەنە! کە دەگوترێ ئاش واتای لەخورێنی لەناناشت هاتو، چونکە (ئاش))لەو شەکەدا واتای خواردن دەگەیەنێ (زاراوەسازیی پێوانە–مە ،سوود محەمەد ل١٥٩–١٦٠)

---

ئێلچی : – باڵیۆز – پەیا ،ـری تایبەت، ڕاستپێدراو، نوێنەر (وشەیەکی تورکییە).

حاجی قادری کۆیی دەڵێ

خانەتان وێران دەکا قەسـ ، قسوری لێ دەکا

بۆ ئەوەی نەچنە عەجەم ـلچی لە تاران دادەنێ

---

ئاگری قودرەتە: – واتە هـ ـ هاجە، نفوراتە،جانداره

---

ئۆخژن: – هەست بە خۆشـ کردن: ئۆخەی، مرتاح

وەك: (بتکولاندبا ئۆخژ نەدەهات)

)شەوچەرە ل١٠٠ – تایە ـەوێزی )

---

ئارچاغ: – ئاڵچاغ ڕەزیل ـبسکە، قرچۆك، دەبێت لە تورکیەوە هات بێ

---

ئاراو: شوشتنی جلوبەر ـ دەڵێن:

بەئاراوێکی خاوێن بۆوە

یان:

ئاراوێکی گرتەوە

---

ئاوزە: هاوتەمەن، پێکەوە لەدایکبوون:

لەبیرمە پوورە (زەکیە)خێزانی شەهیدی نەمر (مستەفا خۆشناو) هاموشۆی دەکردین، ئازادی کوڕی وپەری کچی ئاوزەی من بوون، بەڵام پرشنگ وشیرین هەراش بوون.
(حاجیلەکانی دەشتی هاموون-ئازاد دلزار ل١٠)

---

ئەویٚ ڕۆژیٚ : - ئەو کاتی. ئەویٚ دەمیٚ، ئەو وەختی ئەو ڕۆژە، (مام جەلال) (ئەویٚ ڕۆژیٚ)ی زۆر بەکاردەهێنا و بۆ ئاشنا بوون بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی هەبوو بەناوی (ئەویٚ ڕۆژیٚ) مام جەلال ناوی لێنابوو!
(هەنگینیٚ) نجیبەخان بەکاری دەهێنا...هەنگینیٚ: ئەوسا، ئەو کاتە، هەینیٚ

---

ئەفەندم: - (بۆ ڕێزلێنان بەکاردەهات، لە تورك و عوسمانییەکان فێر بووبوون !

---

ئەفەندی: - هەرکەسێك چاکەت وپانتۆڵی لەبەربا پێیان دەگوت: ئەفەندی، بۆ مامۆستا بەکاردێت بۆ پەلارهاویشتن بەکاردێت هەروەك: کاکم ئەفەندی دەزانی-ئەفەندی ڕازی نییە! لە ئەفەندی بپرسە!
وەك سید، مسیۆ،مستەر. ئاغا (فارسی)
بەپلاو گۆشتی ئاغان ڕازی نەبوو ئەفەندی
لەگەڵ بێگانەیان بەست دۆستایەتی وپەیوەندی
(ڕۆستەم حەویزی)
ئەفەندی حۆقەی ترت بەچەندی
ئەفەندی: وشەی ئەفەندی یەکێکە لە ناسناوەکانی سەردەمی حکومەتی عوسمانیەکان وشەکە لە (ئەفناسی)یۆنانیەوە سەرچاوەی دەگریٚ، کەواتای گەورە (سەید)ی عەرەبی دێت کە هاوتایە لەگەڵ وشەی (ج بحج ٣ة) ی ئینگلیزی. تورکەکانیش ئەم وشەیان لەدەسەڵاتی بیزەنتیەوە وەرگرتووە، لەجیهانی عەرەبیدا ئەفەندی بە فەرمانبەری میری دەگوترا
(چەپکیٚ حاجیلەکانی دەشتی هاموون-مام هەژار ل٤٣)

---

ئەفەندیلە : - کورتکراوەی ئەفەندییە، نازناویش بووە ئەفەندییە.

---

ئایاغ: واتە عەیبدار جیاکراوە لەبەر خراپی، بێکەڵك، خەوشدار! بەمانای هۆشیار بوونەوە لە مەستی دێت
ئایاغ: بەلاوەنان
گەر جەبەل لوبنان ببینم بێشك ئایاغی دەکەم

---

هەر بەسەرچاوەی حەماموّك سەد هەزار داغی دەكەم

(عاصی )

---

ئەم حەلە: ئەو كاتە

تەواو پێویستی خۆی بتوانێ بكرێ

هەموو كەس ئەم حەلە دنیا بەهەشتە

(ڕۆستەم حەوێزی-خەبات وبەرژەوەندی ل١٧٦)

---

ئاخزوون: – بە ڕەزوانە ، ئاسنی پێلاّو بۆ داخستن .

---

ئولا هەر ئولایە، ئێمە لەئولا بووین دەمانگوت كاسی خۆی هێنایە (لە یەكەمەوە وەرگیراوە)

ئولا یەكەم قوتابخانە بووە لە كۆیە لە یاری كردن بۆ پشتیوانی وایان دەگوت .

---

ئیمامی حەسەن و حوسێنان كوللە با لۆكە، كوللە سەوزەكە، دەڵێت: گەنمی حەسەن و حوسێنان، هەموو قربوون لە تێنان،لە بۆ ئاوی قولە تێنان (مندالآن وەكو نوێژە بارانە دەیانگۆت).

---

ئاكو كولیا-ئاكوكولیای لێ هەڵسێ: واتە تووشی گەلێك عەیب وشورەییان بێ

---

ئاویژە: – بەراو – تەڕ و ئاودار. وەك تەرۆزی ئاویژە، ئاسكە جەمیلە

---

ئایشێ و فاتمان: – پەلكە ڕەنگینە، كۆلكە زێرینە، پەلكەزێرینە

---

ئاری باری: – هەلۆژە – گوتراوە (ئاری باری، گووت بەزاری) ئالوبالۆو، هەروچكە

---

ئەتەگلغ: – ژێركراس، جلكێكی تەنكە ژنان لەبەری دەكەن

---

ئیستیكان: – پیاڵە

---

ئافەت: واتە نەخۆشی،دەڵێن كشتوكاڵەكە ئافەتی لێداوە

دەرد وئافەتیش بۆ دار ودرەخت

سەرما وسۆڵ دێنێ بەمالاّت قران

(ڕۆستەم حەوێزی-چوارینەكان ل٢٩٣)

---

ئاوگەلە: – مەڕێك یان گیسكێك تێكەڵ بە مێگەل بێ.

---

ئولفەت: هۆگر، خو پێوەگرتن

---

ئیستیفراق: ڕشانەوە

---

ئێختـه: -ئهسـپی خهسـاو. ئـهو دارهی پـهلوپۆی بـڕاوه قـووت کـراوه، قوتـورم، خوتورمه! ههروهها بارگیریشی پێ دهڵێن

---

ئهلکه: گێژووێژ، بێمێشک، گێل، گهمژه، هێڕ

---

ئهنگوتک: - گونک، تهپه ههویر بۆنان کردن

---

ئهستووک: کولێرهی نان، دهبێت له (ئهستوور)کهوه هات بێ!

قوبادی جهلیزاده له هایکۆکانی قوباد ل ١٥٨

دهڵێت:

(پارووێک ماستی ههولێر به ئهستووکه بهرۆنی کۆیهوه)

دواتر مهلا تههای نانهوا ئهو ئهستووکهی کۆیهی دروست دهکرد.

دهشڵێن: پێش مـهلا تـهها (حهمـه سـهلیم)ی نانـهوا هـهبوو لـه کۆیـه ئهسـتوورك زۆر زووتر ههبووه.ماڵی حهمهگرانی خهجێی ژنـی که دهکاته پلکی مـهحمود شێخانی و وهسـتا سمـایلی نـهجاری شـێخانی، بهتـهنوور ئهسـتووکی کـردووه وزۆر کـهس ڕۆن وکونجی دهبرد بۆیان به ئهستووکهکهوه دهکرد.

---

ئهمن، من. خۆم، ئوستاد بهشیر مشیر دهیگووت (ئهمین) -ئهز

ئهگهر گیرام ئهزم

ئهگهر نهگیرام دزم

ئهگهر دیتت ئهزم

ئهگهر نهت دیت دزم

هێمن دهڵێ:

گهرچی تووشی ڕهنجهڕۆیی حهسرهت و دهردم ئهمن

قهت له دهست ئهم چهرخه سپڵه نابهزم مهردم ئهمن!

---

ئاچوغ: والاّ، بهتاڵ، کراوه. ڕهنگێکی کراوه دژی تۆخ

بهردهرگاکهمان ئاچوغه

---

ئحم: دهنگدانێکه بۆ تهشقهڵه وشهڕ فرۆشتن (منداڵ بهکاریان دهینا)

بۆ ئاودهستیش بهکاردێت مانای وایه خهڵکی تێدایه، بۆ جهختکردنهوه

ئحم ئحم دهکۆکم

کاك کهریمه سهرۆکم

---

(شوعیەکان وایان دەگوت)
کەس بەدەست پانکردنەوە هاتوە بەئاواتی بگا
ئحمێکی پێ دەوێ بێ سور نییە وتراوی کورد
(ڕۆستەم حەوێزی-دۆستی کورد ل٨٨)

---

ئۆین: - مەکر . حیلە. گەرێکی دیکە . گەمەیەکی دیکە، ئاین وئۆین: فرۆفێڵ، ئۆینباز مەکرباز، تەرەکەباز (تەڵەکەباز) سیاسەت
حاجی قادری کۆیی دەڵێ
گەر هیچ نەبێ بە (ئۆین) تابع بە دەوڵەتێ بن
بێگانە چاکە دوژمن، نەك دوشمنێ لە خۆتان
لەکن خۆتان فلأن ئیبنی فلأنن
لەدنیا (ئاین و ئۆین) دەزانن
ئۆینەیەکی دیکە بابکەین -زۆر بە ئاین و ئۆینە !
ئاین و ئۆینی زۆرە

---

ئەورۆ: - ئەمرۆ . ئیمرۆ حەسەن زیرەك گۆرانیەکی هەیە:
ئامینە گیان ئەورۆ ئەورۆ ئەورۆ

---

ئەهوا: - ئەوها، ئاوا، وەها

---

ئۆدە: - دایە، دایك-کورتکراوەی (ئۆ دایە)یە

---

ئەستیو: بێرۆکەیەك بوو کلکی هەبو لە ئاسن دروست دەکرا بۆ پشکۆ دەردان

---

ئەنگوستیلە: - مستیلە

---

ئاوی تەماتە: - دۆشاوی تەماتە

---

ئێمەنی: - جۆرە (کەوشێك) بوو. پیشەوەرێك لە کۆیە هەبوو پێیان دەگوت حەمەدی ئێمە ندروو. لە شەوچەرەی تایەر حەوێزی ل ٢٦ دەڵێت:
(جۆتە ئێمەنییەکم لە موسڵێ لۆ هاتبوو) ڕەنگە لە (یەمنی)یەوە هاتبێ.

---

ئیش: کار لە کۆیە زۆر بەکاریدەهێنن

---

ئەسرە مۆك: - بەرەکە. لە نێوان پەسیرە و ترێ، واتە بەڵەکە

---

ئەژمەت: - لە داخان. لە حەسرەتان، لە مەراقان، لە خەمان

---

ئەشتەبا: - هیچ، هیچ شتێك (ئەشتەبای خوا شك نابەم)

ئاودامان: - كراسی درێژ

ئەنگوست: - پەنجە. قامك

شەوی ئەنگوستەچاو: واتە زۆر تاریك

ئەنگۆ: ئێوە. جارێك یەكێ سلێمانی دەڵێت زاراوەی ئێوە بە ئینگلیزی دەچێ وەكو (ئەنگۆ) پبپ

ئینشەلاٚ شەموو لەیەكتان دەبێ! (شەمووله) (داهۆڵ) ە تووك و دوعایەكی نارازی بوونە، بە كورتە بالاٚیانیش دەڵێن: شەمووله (عاجباتی)

ئامان: زۆر واتای هەیە بەلاٚم لەكۆیە دەڵێن ئامان لەدەستی، واتە بێزارە لەدەستی

ئۆخەی لە خۆت نەكەی: تووك و جنێوە واتە خۆشی لە خۆت نەبینی

ئێقە: - یەخە. ئێخە

جا وەرە ئێقەی كێی گرتییە،ئێقەی خۆی دادڕێ لە داخان

ئاغەڵ: شوورەی وشكە، كەلەك بە بەرد

ئاشەگڕە: - چوست و چالاك (ئاشەگەڕە)وەك ئاش هەڵدەسووڕێ

ئاسنجاو: - قاپ و قاچاخ قاپ وقاچاغی مس (نحاس) واتە لە نایلۆن نەبێ

ئامانە: - پاس

ئاروو: - خەیار

ئاوەڕووت: لێكردنەوەی پەڕەمووچ (پەڕ) لە مریشك

بەعس لەگەڵ ناحەز ودوژمنی خۆی جووت دەكا

بەوەزیفەو بە پارە هەموویان دەم كوت دەكا

لەبەر چاوی خۆشی كورد لە شەرفیان قووت دەكا

وەك مریشكی مەسلەحەی چاكیان ئاوەڕووت دەكا

(چوارینەكانی ڕۆستەم حەوێزی ل٢٩٤)

ئەلعان: - ئێستا، هەنوكە

ئێخسیر: - دیل، ئەسیر

ئێکانە: – بەرازی نێر. لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان هەر تیپەی ناوێکی هەبوو تیپی خاڵخاڵان کە چالاکیەکی دەکرد ئێستگەی دەنگی کوردستان هاواری دەکرد یەکانەکانی خاڵخاڵان. بە ستایش و ئازایەتی ناودەبرا !

ئیشکەکەلەك : – دیواری بێ قوڕ وبێ چیمەنتۆ بە بەرد هەڵچنراو

ئەوچەلە: – ئەو جارە. ئەو کایە، ئەو هەلە

ئەوشۆ: – ئیمشەو، ئیبراهیم سابیر لە گۆرانی (ئۆف سەلام) دەڵێ:

خەونەکەم بۆ گێڕاوە بە راستی ۆ بەبێ درۆ،

فەرمووی وەڵاهی ئەمنیش ئەو خەونەم دیوە ئەوشۆ

ئیتقات: بڕوا، ئیمان (دەڵێن ئیتقاتی پێیەتی)

ئەدەبخانە: – تەوالێت خەلا، ئاودەست

ئەستێور: – نا ئاوس بۆ ماڵات بەکار دێت.

مەتەڵۆکە، دەڵێ: (هەر لێرە هەتا مەککە، هەمووی کاوڕی ڕەش بەڵەکە هەمووی کچی چاو بەڵەکە)

ئۆبار: – ئۆباڵ، تاوان خەتا (ئۆبار بە ملت)

ئەدەب سز: – جنێوە واتە بێ ئەدەب لە تورکییە یەوە هاتووە

ئەیاخ: خاپەڕۆك، بەشی خراپی شتێك، پاشماوە

ئاگر لە مارت بەر بێ (تووکە)

ئینشەڵڵا عاجباتییەکتان دەبێ (تووکە)

ئۆیە:

دایکی ئەميناغای ئەختەر ناوی حلیمە خانی کچی حاجی یاسینی بووە پێی گوتراوە (ئۆیە) واتە دایکی گەورە

ئۆیە: – نەخشی دەرزی چنە یا تلیشەیەکی تەنکی بەنەخشە یان کون کونە بە دامێن کەواو هەندێ جێ کراس و کەناری دەسماڵی ئافرەتان دەچندرێت یا دەدرێت. حاشیەی کراس وکەواو. یا (کۆبە)

ئاگاداری تڕ و فسی یەکترن،تڕ و فس بە نهێنی دادەنرێت

واتە ئەوەندە لێك نزیکن

ئاگر بە زمانت کەویٚ، لغلغەت بەزمانی کەوی-لغلغەت لەزمانی بیٚ

ئەوەی چاوی پێم هەرنایە. ئاگر لە هەناوی بەربی خوایە

ئـەوەی هـەرم دەگـری و دامـدەنیٚ خوایـە بـەمن بـی (ژن بـەکاری دیـنن) واتـە ئـەوەی غەیبەتم دەکا

ئادارتان بەسەر پادارتانەوە. نەمینیٚ

ئاداری بەسەر پاداری نەماوە. تەفر وتونا بن

ئەوەل سەحەرە

ماریٚ سیوەی پڕ لە گورگ و چەقەرە

ئەوە چییە لەبن پێم عاردە. هەر کەس لۆ ماری خۆی غاردە

ئێلیٚ کنێریٚ: - واتا درۆیە زیاتر لەناو مەنتکان وا دەڵێن

ئەزیا ماری قوت دایە: - واتـە شەڕواڵەکە لـە پشتەوە، لچکی پاشـەوەی شـەرواڵەکە چۆتە نێوان دوو سمتەکانی. جوویتیەوە.

ئەسقی: - حەلاقەی جل هەڵواسین، عەللاقە

ئیشکەرم بمریٚ تەگبیر کەرم نەمریٚ: یا دەڵێن:

| بەڵام مشورگێڕم نەمری | ئیشکەرم بمری |
|---|---|

ئاوی پیسیش ئاگر دەکوژێنێتەوە!

ئەو دڕکەت لە بن پێی هەر دەردەینم: واتە تۆڵەت لێدەکەمەوە

ئەو قسەیە قاویت و ڕەشەبایە

ئەگەر لە خۆت نەخەفتی. وەکی کوندەی بە جەفتی

ئیشی ژنان کورتانی دەجالییە هەر بنی نایە!

ئیلنجاغ بهێشتە، کۆلکەی دارە بنێشتە، کۆربم بەجێم هێشتە، ئیلنجـاغ گوندێکەلـە ولاّتـی کۆیـە ٩ کیلۆمـەتر دوورە لـە شارۆچکەی تـەق تـەق بهێشـت، بـە هەشـت واتـە ئیلنجاغ بۆتە بەهەشت کۆربم کە جێم هێشتووە، (مێرجار-ئاراس ئیلنجاخی ل ١٩)

ئاخرت خێر بیٚ، نۆبەرەت نێر بیٚ

ئانە مانە لە پانە

مێردی ئەحمەد شەقانە

ئان، مان،پف

دەبێت هی جوولەکەکان بووبێ چونکە واتە من وتۆ پێکەوە،پیاوی ئەحمەد بەرشەق بدەین

ئان، مان،پف واتە

من وتو تفی لێ بکەین

---

ئەتوو بیبینەوە، ئەمن پیشانت دەدەم

واتە تۆ بیدۆزەوە من نیشانت دەدەم

ئەمە بۆ خۆشەویستی رابواردن بەکاردێت !

---

ئەهێ برا لەوێ بنە باوی چەند گەورەیە

واتە درۆیە، لەناو مەنتکان بەکاردێت

(بنەباوی) شاخێکە لە دۆلی سماقولی، بەهاران مەڕدارە مەنتکەکان لەو دەوروبەرە ڕەشماڵ هەڵدەدەن دەشکوترێ (بەنەباوی)

---

ئیشکە مەلابرایم: کابرایەك لە گەڕەکی گردی جوان لە کۆیە مێشکی تەواو نەبوو پێی توورە دەبوو. دوو واتا دەداتە ئیشکە: وشکە کارێك

---

ئاسمان تەبەق تەبقە- کەلیمەی زارم هەقە

---

ئاش بەنۆرە، نەك بەزۆرە

---

ئاغاژن هاوار، تورگە وهەم ساوار

توورگ بەمانای ڕێوی دێت، واتە گۆشتی توورگە بە ساوارەوە خۆشە، یان بەمانا (تۆڵەگە)دێت

---

ئەقر (ئەقڵ) لە داك وبابی چاترە

ئەگەر لەهەر کات ئەقڵ رەهبەر بێ

ناشێ ئەو کەسە توشی زەرەر بێ

(داریاس)

دەڵێن درێژ واتە کەسی کەڵەگەت ئەقڵی لە چۆکیتی

---

ئەگەر بەختت بوو، تەختت بوو

---

ئەگەر بەماری، بەمام وخاری-ئەگەر بێ ماری-بێ کەس وکاری (مار-ماڵ)

---

ئەگەر بووی بە میر-خوا، نەکەی لەبیر

---

ئەگەر خەوت هات- بالیفت ناوێ

سەیری لەم دنیا پان وبەرینە

ئەگەر خەوت هات بەردیش سەرینە

(دارياس)

(باليف: سەرین)

---

ئەگەر هەموو شت لەبەرکا قەت ڕووت نابی، ئەوەی هەموو شت بخوات قەت برسی نابی.

---

ئیشی پەلەپەل- ساحێبی پێ دەشەلی

---

ئیشی ژنان بیست وچارە- هەرنان وهەویر دیارە

(چار-چوار)

---

ئیشی دیت: واتە تەگبیری لێکرد

---

ئیشەکەی قوز مراکیە: واتە نابەجێ وناتەواو

---

ئۆخەی تری خۆم وسری خۆم، لەبن کەچە بەری خۆم

---

ئەوەی گۆسکان دروست بکا، دەزانێ قورفی لۆبکا

(قورف-قوڵف)

(لۆبکا-بۆ بکا)

---

ئەو کۆرانەی تەسکا وتەسکە

تێکەربوون سمێر وبسکە

خۆی لێ مەدەن کەوای کەسکە

(کۆرانە-کۆڵانە)

(تێکەر-تێکەڵ)

(سمێر-سمێڵ)

(کەسک-سەوز)

(بسک-زولف)

---

ئەوەندەی ئاومان لە دوو بێری بڕوا: چەندی بۆمان کرا

(بێر: بێڵ، خاکەناس)

---

ئەوەی خاوەن دوو ژنە- جەرگی کون کونە

یان: دەڵێن ئەوەی دوو ژنە، خڕپن وگوپنە

---

ئاسنە کون کونە

دایم بە دەستی ژنە

(کەوگیر)

---

ئەملاتات وئەولاتات

وەی بابە جیقم دەرهات

(مەتەڵە بۆ ئەسپێ کوشتن)

---

ئەلفێ گوتی بەجیمی

قافێ بەرە لۆ میمی

(قورئان)ە

(ئەلف-اللە)

(جیم-جبرائیل)

(قاف-قورئان)

(میم-محەمەد)

---

ئاسنی سارد دەکوتی: وتەو کاری بێمانا دەڵێتەوە

---

ئاگر نییە دەتسووتێنێ

وەك بەڕوو دەتپیشێنێ

-هەتاو-ە

---

ئەو تاقە دەکا ئەو تاقە دەکا

چاو لە هەموو کەس دەکا

-ئاوێنە-یە

---

ئاو دەدا لەدار بەرد دەدا لەتل

سۆردەکا سپی قلی لۆسەر قل

-ئاشی ئاو-ە

---

ئەگەر دێ پیرە

دادەنیشێ دەرێی میرە

کە دەڕوا فەقیرە

(بەفر)ە

---

ئەگەر دێ میوانە

دادەنیشێ وەزیرە

ئەگەر دەڕوا فەقیرە

(بەفر)ە

***

ئەگەر دێ گەدایە

دادەنیشێ پاشایە

کە دەڕوا بێ جێگایە

(بەفر)ە

---

ئەستێرەی ناو مەنجەڕێ

بەڕۆژ لە دەرێ

بەشەو دەخەوێ

-چاو-ە

---

ئەسپی تۆپی جۆ دەخوا

(ئاش)ە

(تۆپی: تۆپیو)

---

ئەگەر بکەویە بەر هێرشی شێر

قەت پەنا مەبە لۆ ڕێوی بێ خێر

---

ئەوەی لەکن توو سووک وبەدناوە

لە کراسی خۆیدا وەکی تۆ پیاوە

---

ئەو سەرەی تەماح بیبڕێ دیارە

جودا لەو سەری وا لە سەر دارە

---

ئەگەر باری کەر تفەنگ بێ پاکی

گورگ تووشی بێ دەیخوا بە چاکی

(پاکی: هەمووی)

---

ئەگەر ئەتوو بمری کفن زۆرە.

---

ئەگەر کەرەبابیش نەبێ، خوا هەر ڕۆژ دەکاتەوە.

(کەرەباب: کەڵەشێر)

---

ئەحواڵی شەریفت: واتە تەندروستیت چۆنە بۆ ڕێزگرتن بەکاردێت.

---

ئاخیری عومرمە، ئەوەڵی کاسبیمە.

---

ئەگەر خێرت هەبایە ناوت خێروڵڵا دەبوو

---

ئاردی ناو درك خڕنابێتەوە

---

ئاسمان بووبیتە لێفە دای ناپۆشێ

---

ئاسمان سەری بە پوش نەگیراوە

---

ئاسن بەژەنگی خۆی نەبێ ناڕزێ

---

ئاسنی سارد بە فوو گەرم نابێ

ئاسن بە فوو نەرم نابی

تێبینی: فووکردن بۆ ساردکردنەوەیە

دەڵێن: حەمام بە تڕان گەرم نابی

ئاسن بە فوو نەرم نابی

---

ئاغا چل کوڕی هەبوو وەچاغی کوێربوو

واتە کوڕێکیانی کە ناوی (وەچاغ)بوو چاوی نەبوو، کوێر بوو

وەجاخ کوێر پێچەوانەی وەجاخ ڕوونە، ئەمەش واتا ئەو کەسەی لەدوای خۆی منداڵی باشی هەبێ، بەڵام وەجاخ کوێر مانای وایە هیچ کوڕی نەبێ.

وەجاخ واتای (ئاگردان)و (منداڵی نێرینەیە)

(فەرهەنگی خاڵ-شێخ محەمەدی خاڵ)

---

ئاو هیچ کات ڕێی بزر ناکات

---

ئەسپی دیاری وپێشکێش. دەم وددانی تەماشا ناکرێ

---

ئەگەر لە پشتی کەر بڕۆی. دەبێ بۆنی تەرسیشی بکەی.

---

ئیشی بەبێ زەحمەت ئەستەمە بوونی

پیاو ماسی بگرێ تەڕ دەبێ قوونی

(قوون: قینگ-سمت)

---

ئەوەندە (سڕ)وماتە، دەڕێی ماری زستانە

---

ئاو دەڕوا، زیخ دەمێنێتەوە

---

ئەگەر نەتبو بچۆ بەرهەتاوێ، ئەگەر بۆت کرا خەرکی بنێرە بەر هەتاوێ

---

ئەتوو های دەکەی ئەمن هوو دەکەم

ئەتوو ژن دەینی ئەمن شوو دەکەم

---

ئەقر لەداك وبابی چاکترە

---

ئەگەر بەختت بوو، تەختت بوو

---

ئەگەر بە ماری، لۆ دەماری

(مار: ماڵ) (دەماری: دەماڵی) (لۆ: بۆ)

---

ئادار ناچێ بێ دۆ، نیسان ناچێ بێ جۆ

---

ئادار مەشکە لەدار، لێرە نا لەژەنگار

---

ئەوە چییە چی پێ دەڕێن، تەپکە بە کونجی پێ دەڕێن

عەبای نارنجی پێ دەڕێن (تەماتەیە)

---

ئەوجلە هی ئەو گایە نییە: واتا لێك جیاوازن وبۆ یەك نابن

---

ئاشی ئاغەرێ: لەڕۆژئاوای کۆیە بووە دەڵێن دێوی لێ بووە

(شنەی هەیبەسوڵتان- جەلال جۆبار ل٢٠٧)

---

ئەرجوم: بۆت باس بکەم، دەیانگوت عومەر ئاغای شەوگێڕ کە قسەی دەکرد دەیگوت ئەرجومت کەم!.

---

ئەسپۆن: ڕەگی گیایەکە کە وشك بێتەوە، جاران جلکیان پێ دەشوشت گیایەکە بەکاردێت بۆ گێژکردنی ماسی بۆ گرتنی

هاری هاتەسەر لاشەو دەماغی

بەکەپووی دەخوا ئەسپۆنی شاخی

(باخچەی پیرانی سامی عەودالی شاعیر)

ئیفتیرا: بوختان

ئەگەر زۆر هات قەواڵە بەتاڵە

ئەندەر: لەناو

سەفەر ئەندەر وەتەن چ کەلك دەگرێ

سەیری ئاکەی شەمەندەفەر دەفڕێ

سەفەر ئەندەر وەتەن: زاراوەیەکی سۆفیانەیە بە واتایی گەشتی ناو دەروون دێ

(دیوانی حاجی قادری کۆیی) ٠

ئیچقەلا: قەڵایەکە لە کۆیە

بەقەدی ئاوەگردە دەردی دووری

نەزیری ئیچقەلایە بێ حزووری

(حاجی قادری کۆیی)

ئیچ قەلا: قشلەی کۆیەیە لە ساڵی ١٨٢٠ز-١٢٢٥ك لە حکومەتی محەمەد بیگی ڕۆمی دروستکراوە، کە بەدەست خەتێکی فارسی نووسراوە، ئیچ قەلا واتە قەلای ناوەوە

(مێژووی کۆیە-بەرگی دووەم-بەشی یەکەم، تایەر ئەحمەد حەوێزی ل٥٠)

ئاون: دەسکەوان، جۆرە دەفرێکی قوڵە لە زەرد دروست دەکرێ.

دەسکەئاون: ئەو دەسکەیە کە لە هەمان مادده دروست دەکرێ ئەوەی لەناو دەفرەکەدابێ پێێ دەهاڕدرێ، بەڵام لە سلێمانی بە ئامێرەکە دەگوترێ دەسکەوان

ئەگەر ماتی، لۆ دەهاتی

(لۆ-بۆ)

ئەوەڵباب: یەکەم، ئایاب

ئاشەوان چ دۆست بێ چ دوژمن

ئەگەر بەشینی نەخورابێ

ئەوەش بووە فشە

ئەو تەنیشت وئەوتەنیشت

هەر دوو قۆر وڕاستە پشت

ئەوڕۆ ئاش، ڕووی تەڕاش

ئەوەی هەق بڕێ (بڵێ) کراوی (کڵاو)ی دەپەڕێ!

---

ئاخ! لەدەست کۆییان داخ! لەدەست کۆییان!

پەندی کوردی: چیرۆکەکەی

عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی

---

ئەگەر نەدا مەعبوود

ئاخر چ بکا مەحمود

مەحمود مەبەست لە سوڵتان مەحمود غەزنەویە.

---

ئاوەکوڵ: سیخوڕ وکوڕە بەشە، ئاوەکوڵ دەکرێ چەرمی نییە!

---

ئەگەر ئێواران کێشکە (چۆلەکە) زۆر بجریوێنێ، بەیانی

سارد دەبێ وبەفر یان باران دەبارێ.

---

ئەگەر کێشکە وڕیشۆلە خۆیان چەقاند بە ئاودا بەتاقی کردنەوە دەرکەوتووە ئەو ساڵە بەفر وباران زۆر دەبێت

---

ئاوەریس: جۆرە قوماشێکی بەقیمەت بووە

ئەنواعی قوماشی بەقیمەت هاتۆتە شاری کۆیە. بەڕاستی بڵێم من خۆم نازانم ئاوەریس لەچی دروست کرایە!

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلیزادە ل٤٠)

---

ئەستێرک: لە گەچ وبەرد دروست دەکرێ، ئەستێرەکەکان سێ چاون (زۆر بڵند نییە)زستانان کە ماڵ لە ژووران دەنوون نۆینیان لەسەر ئەستێرکی دادەنێن!

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلیزادە ل٥٩)

ئەستێرک، ئەستێل: گۆمە ئاوێکە لە بەردەمی ئاوێکی کەمدا دروست دەکرێ، بۆئەوەی کەپڕبوو بە ئاسانی شینایی پێئاو بدرێ.

(فەرهەنگی خاڵ-شێخ محەمەدی خاڵ)

---

ئەلپەرچەمە، دول پەرچەمە، ئەسمەر غەزالی پەرچەمە، شیرینێ لەیلانێ، شیرینێ هەم گوڵ هەم ڕەیحانێ

وەستا عەبدوڵڵا جەیدی سەرۆکی (تیپی گەمان)بوو ئێواران کە بەرەو ماڵ دەبوونەوە هەر ئێکە ئێکەکی لەقیل وقاس دەکرد بە چەپڵەڕێزان ودیلانە گۆتن ئەو دیلانە زۆر باو بوو.

(مێژووی شاری کۆیە- نەجیبە خانی جەلیزادە ل١٠٩)

ئەگەر تێچینە باراش بەرکەوێ: واتە نۆرەی بێ

ئێك ئێك: ئابرووی یار. ئەگریجەی یار

دووی دوو دوو: دیدەی یار، دەمی یار، دڵی یار

سێیەی سێسێ: سێیەی یار، سەرپۆشی یار

چاری چار چار: چاوی یار

پێنجی پێنج پێنج: پەنجەی یار.

شەشی شەش شەش: شێوەی یار

حەوتی حەوت حەوت: حەمایلی یار

هەشتی هەشت هەشت: هەناسەی یار، هەیاسەی یار

دەی دە دە: دیداری یار. دەسرۆکی یار

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلیزادە ل (١٢٨)

ئاچووغە: والآ، کراوە

هەروەك سینگم ئاچووغە، مێشکیشم ئاچووغە. لە وتەکانی مەلا عەبدوڵڵا جەلیزادە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلیزادە ل (٥٠)

ئی من عالمێکە وەکو جەلی

شێخێکە وەکو عەلی

وتەی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە باسی خێزانەکەی خۆی کردووە،کە زەینەبی کچی شێخ کەریمی کۆییە. شاعیربوو نازناوی (حەزینە)بووە.

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلیزادە ل٦٧)

ئەوەی رەگی نەبێ-لقی نابێ

ئێك پێ لەدەستی: دوو پێ گەیشتی، سێ خستیە سەر پشتی! (دروونەوەی دەغڵ)ە

ئاڵدم وبڵدم: شەش پای دوسم، ئەگەر هەڵی نەهێنی پێت دا فسم! (تەرازوو)ە

ئەولا پەرژین، ئەولا پەرژین، تێیدایە کۆترەکی رەنگین (چاو)ە

ئەولا دیوار، ئەملا دیوار. تێیدایە سەگێکی هار. (زمان)ە

ئەوەل دەست ئی کافرانە

ئەوپەڕی پێویستی: قرورە قصوی

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٩٢)

---

ئەگەر چێر بە دۆ دەبوو، لە دەرکەی ماری خاوەنی دەبوو

(چێر: چێڵ-مانگا

(مار: ماڵ)

---

ئاسمان بە خێوەت دەزانێ: واتە ڕۆحی زل وبەفیزە

---

ئاغاژن، پێویستی دەبێ بەسوژن

---

ئۆمەرمەندان ڕازی نییە بە گیسکێ، خاڵ خاڵان مەمنونە بەنیسکێ.

---

ئاستەوار: کوردی ڕەسەنە بەواتای شوێنەواری کۆن هاتووە وئاساری عەرەبی لەوێ وەرگیراوە

(زاراوەسازی پێوانە مەسعوود محەمەد ل١٧٧)

---

ئەگەر مەلا وسەید دەعوەتی عالەمێ بکەن

لە عاسمان دۆڕ وزوڕنا لێ دەدرێ

---

ئەو کەروێشکە بە چ تاژییەك دەگیرێ!

تاژی: تانجی

---

ئەو قسانە لە قوودووی هیچ عەتارێك نییە

---

ئەو لەبەر نەوسی، ئەم لەبەر نەفسی

---

ئەوەی دۆڕا، بەگوو شۆڕا

---

ئەوی دەرزییەکی نەبێ. دەرزییەك ناهێنێ

---

ئەوەی گەڕا، مێشکی زڕا

---

ئەوەی لەگەڵ بووك دەکرێ، لەگەڵ بەربووك ناکرێ

---

ئەوەی گا ومانگا بەخێو بکا دەستوپلی بەریخ دەبێ

---

ئەگەر ببی بە پۆلا، دنیا بدەی بە کۆلا، هەر دەڕزێی لەبن خۆلا

---

ئەگەر لەکن گۆ رووڕەشم، لەکن خوای رووگەشم

لەکنەگۆ: لەلای ئێوە

ئەگەر ئەتوو دوڕی من دوڕناسم، ئەگەر ئەتوو تیغی من ئەڵماسم

ئەگەر حەز دەکەی لە گۆزەی پڕم، خۆت لۆ خۆم کچەکەت لۆ کوڕم

ئەگەر هەیبەسوڵتان لەپشتم بێ، بەگڕ ئاسمان دا دەچم

ئەگەر ئازای کوڕەکەت فێرکە، نانی کەم بخۆ فەقیرت تێرکە

ئەگەر خەو دەبوو بەمایە. کەروێشك دەبوو بەگایە

ئەگەر دنیا ئاو بیبا لەکەیف وسەفای خۆی ناکەوێ

ئەگەر دەنگ بکەم بەدناوم، ئەگەر دەنگ نەکەم تەنگاوم

ئەگەر کەر بەقادرمەی دار سەرکەوێ، بووك وخەسوو ڕێك ناکەون

ئەرز نییە سیو سیوەی دەرگای لێ نەگێردرابێ

ئیسپات: سەلماندن

ئەفلاتوون تۆ دەڵێی دنیا قەدیمە

لە خمخانەت نێن وەك خۆت لە خەم نا

(حاجی قادری کۆیی ل ١٦)

ئاوەنیا: مەڕدارەکان زەوییە بەراوەکانیان پێش بارانی پەلە دەکێڵن دەیکەن بە جۆ بۆئەوەی زوو پێبگات بۆمەڕ وبەرخەکانیان

(گوندی قازبەگیان -شێخ ئازاد قازبەگیان ل١٢)

ئیمان دوو بەشە بەشێکیان سەبرە، ئەو بەشەی دیکەش شوکرانەی قەدرە

ئیشی بەوەختی، پاشای سەرتەختی

ئیش شێرە، کە دەستت پێکرد ڕێوییە

ئەوەی چوو چوو، لە دوو چوان مەچوو

ئەوەی نەزانی کوڕی کێیە

لەگەڵی مەچوو بۆ هەموو جێیە

ئەوەی خزمەتی خەڵکی پێ دەکرێ

لەتاواتاوی بەچاکە دەبرێ

ئەوەی جڵەوی دایە دەست خەڵك

زەلیل وزەبون دەبتە بێ کەڵك

---

ئەوی لەوی دورە، ڕەنگی سوورە

---

ئەوی ناوکی بووێ، دەبێ تویکڵ بشکێنێ

---

ئەوەی هەرکەسەکی راوبنێ، خۆشی ناحەسێتەوە

---

ئەوەی کە حەیای نا بەتاقەوە

کاتێکی زانی بوو بە فاقەوە

---

ئەوەی گوو دەخوات دەبی مراکی پێ بێ

(مراك: کەوچك)

---

ئەوەی بە مێژوو کراوە. بە قەحپەش نەکراوە

---

ئەوەندە گەڕاوە، دڕاوە

---

ئەوەی پێم دەکرد وخێر. لێم بویتە گورگ وشێر

---

ئەوەندە شیرینە لەگەڵ ژەهریش دەخورێ

---

ئەوەندە بەرز مەفڕە بڵێن بێ باکە، چونکە بێ باکی هەر لۆ خودا چاکە

---

ئەوانەی بەدوو پارە دەکەون

بەو مەراقەوە شەویش ناخەون

---

ئەوانەی فێرە درۆ وغەیبەتن

ڕوویان مەدەنێ شووم ونەگبەتن

گردی غەیبەتان لە کۆیە هەیە

---

ئەوانەی دوونێ کە بەروو دۆست بوون

وا ئەوڕۆ دەرچوو بەتەمای پۆست بوون

---

ئەو کەسەی بێ شایی هەڵپەڕێ

وەك ئاشی بێ (دان)لۆ خۆی دەگەڕێ

---

ئەو کەسەی ئاگری دەخاتە بن کا

وەها بزانە خۆی بە دوکەر خنکا

دووکەر: دوکەڵ

ئەو کەرەی هەوسار دەپسێنێ، کەبەر بوو لووشکە ڕادەوەشێنێ، باری گران کە بەشی لێدان کە

ئەو کەسەی غەیبەت دەکرێت، غەیبەت بۆ خاوەن غەیبەت دەبردرێت.

ئەو کاروانچی، من خانچی

ئەو کاربەدەستەی کە کار شوناسە، کردەوەناسە، خاترنەناسە

ئەو قەسپەی ئەتوو خواردت، ناوکەکەی لەکن منە

ئەو چاوە کوێربی دژمن نەناسێ

ئەو سەرە، سەری خۆی نییە

ئەو ردێنەم بەلاش سپی نەبووە

ئەو دونیایە چڕە وبەری زۆر دوورە

هەتا بەدوای کەوی هەر خوار وژوورە

ئەو ترەکەرە سەرناگری

ئەو تفەی روت کرد مەبلێسەوە

ریسێ کە ڕستت قەت مەیرێسەوە

ئەو ئیشەی بەخۆت دەکرێ، بەکەسی مەکە

ئەوی تراندیە، ئەتووش دەترێنێ

ئەمن لۆ توومە، ئەتوو لۆ کێتە

ئەگەریان چاند، نەیان دوورییەوە

ئەگەر لەترسی سەی نەبی، گورگ دەتخوا

ئەگەر کەڵبەی گورگ نەشکێنی بەدار، قەت وازناهێنێ لەمەڕی هەژار

ئەگەر کەر نەهاتە بەرێ، باری ببە بەر کەرێ

ئەگەر کاوێژی بکردایە، گۆشتی دەخوارد

ئەگەر فیل هەیە کەرکەدەنیش هەیە

ئەگەر خودا بیداو وئەتوو بیدە خەڵك، بۆ هەردوو دونیا دەبێ بە کەڵك

ئەگەر بەعیلم وعەمەل پەسندی
لەوە چاکترە کە دەوڵەمەندی

---

ئەگەر ئینگلیز پەرسیلەیەکت بداتێ مێوژ وترێ ودۆشاویشی لێت دەوێ.

---

ئاوی کانی لەڕووبار پاکترە، کەچی ئاوی ڕوبار زیاترە

---

ئاوی زۆر ئاوی کەم دەبا

---

ئاو لەناو جۆنی دەکوتێ

---

ئەرێ ئەو قەوانە هەر نەبڕایەوە

---

ئاش گرمەی دێت، ئارد دیار نییە

---

ئاو دەی با دەست بەکەفەوە دەگرێ

---

ئاوەکی بەو ئاگرە دا بکە

---

ئاغا ونۆکەر لێک ڕاست بوونەوە
قوربان بەقوربان لەبیر چوونەوە

---

ئاگر لە کۆنەکاش بەر دەبی

---

ئاش بەبا دەگێردرێت

---

ئاسن وپۆراش دەتوێتەوە
(پۆرا: پۆڵا)

---

ئازار بەئازار دامەمرکێنە
بشرەنجێ ئەتوو قەت مەیی ڕەنجێنە

---

ئازایی نەژاد بەوارس نابڕێ
زۆر وەچاخ زادە لەترسان دەمرێ

---

ئازادی لەژیان بەقیمەت ترە

---

ئاخوڕی خۆی لێ تێک چووە

---

ئاخ خوێندەواری فریامان کەوە
لۆ خەرکی ڕۆژە لۆمە هەر شەوە
(لۆ: بۆ)

(خەرك: خەڵك)

(مە: ئێمە)

---

ئاسمانی لەپێش چاوی تاریك بوو

---

ئیشکەوەرد: ئەو زەوییەیە لە کۆتایی زستان دەکێڵدرێت لە پێش کەوتنی پەڵە دەچێندرێت.

(گوندی قازبەگیان-ئازاد قازبەگیان ل١٢)

---

ئەگەر هەوەسە، بەسە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٩٨)

---

ئەگەر شوان نەبی مێگەل ناوەڕێ

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٩٩)

---

ئاوی دەکاتە ناو بێژینگ

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٩٠)

---

ئاگر وبایان نەگۆتییە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٩٢)

---

ئارەقەی لەپشتی قوونی دەهاتە خوارێ

---

ئاوە،لەئاو دەخنکێ

(بەفر)ە

---

ئەوە چییە بۆنی شیری خاوی لێ دێ

---

ئەوهانا: بەو شێوەیەنا بەو جۆرەی نا

---

ئاوخۆرەوە: ئەگەر یەکێك لە گوندێك بوایە، زەوی وزاری نەبوایە پێیان دەگوت (ئاوخۆرەوەیە)

---

ئاغابان: بەخانووەك دەگوترێ، بانەکەی تەخت سەرەکەی بەخۆڵ وقوڕ پەست رابێ

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٩)

---

ئاژینە: چەق چەقەی ئاش، بۆناو گەرووی بەرداش بۆ هاڕین

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل١٠)

---

ئاگرەزار: پاوان وشوێنی ئاگرتێبەربوو وسوتاو

تاقە هەسپێك دوور دوور دیارە

لەدەم ڕەوگەی

ئاگرەزاری

مەرگی خۆیدا

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل١٦٨)

---

ئاڵەمان کوردی: کابرایەکی شێتۆکەی کۆیی بوو، نازی بووە دژی ئینگلیز، ناوی عەبدول ڕەحمان حەمەد بووە، لەچایخانە وبازاڕی کۆیە خەڵکی لێی خڕ دەبۆوە قسەی بۆ دەکردن پڕ وپاگەندەی نازی وئەڵمانیا دەکرد، دەیگوت: لەگەڵ هێتلەر بەبێ تەل قسە دەکەین بەکوردی چونکە هێتلەر هەموو زمانێکی دەزانی، دەیگوت: لەخەوا یەکترمان دیوە وای لەخەڵکی دەگەیاند پەیوەندییەکی گیانی بەگیانیان لەگەڵ هێتلەر هەیە دەیگوت: هێتلەر گیانی بە موسڵمان خولقاوە نەك هەر موسڵمان بەڵکو پێغەمبەرە ئەوە محەمەد مەهدییە کە خەڵکی چاوەڕوانیەتی دەیگوت ئەڵمان دەگاتە کۆیە ئەوە لەڕێیە هەمووی چاوقوچێنێکە، گرتوویانە لە دادگا لێیان پرسیوە چۆن ناوت ئەڵمانە گوتبووی بۆ مام بۆکانی عارەق فرۆش و ما فرەنس وئیسرائیل هەیە ناوی منیش ئەڵمانە کوردم.شتی سەیر وسەمەرەی لێ دەگێڕنەوە، سەرەنجام بێ سەروشوێن کراو گۆڕغەریب کرا هاواری دەکرد (کێر دەرمانە، قوز خەرمانە)!.

دکتۆر مارف خەزنەدار کتێبێکی هەیە بەناوی ئەڵمان کوردی ساڵی ١٩٦٩ چاپکراوە کورتە چیرۆکە یەکەم کورتە چیرۆکی بەناوی ئەڵەمان کوردی یە

ئەڵەمان کوردی شێتۆکەی سیاسی

مەلافیتەی خۆی لەدوور دەناسی

(بەبەختی حاجی- ڕەهبەر سەید برایم ل٤٨)

---

ئەگەر لەماڵەوە خۆت ڕێك نەخەیت، لەدەرەوە ناتوانی بە هیچ بگەیت

(د.کەمال مەعروف)

---

ئەهلی کۆیە مەرد ومەشهور ولەسەرخۆن، حەزیان لە چرپ وچۆپان فشار وخۆهەڵکێشان وخۆپێشاندان نییە، تەبیعەتیان قورسە، هەرچی نییە لەلایان شتێکی تەبیعی یە.

لەوتەکانی نەجیبەخانی جەلیزادە

(هەواڵی کوردەواری ساڵانی ١٩٦١-١٩٦٢-١٩٦٣ - نوسینەوەی نەجیبەخانی جەلیزادە-پێشەکی ولێکۆڵینەوە وساغکردنەوەی د.کەمال مەعروف ٢٠١٨)

---

ئەگەر (بێر)خاکەناس حەیای ببایە کلکە دارێکیان لەقونی نەدەنا.

---

ئێسکن: بۆ مرۆیەکی ئێسك ئەستوور، نەك لەبەر لەڕی ولاوازی ئێکی لەبن پێستدایە دیارەوە بێ

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٢٨)

---

ئاسنی سارد لەکونە دیوار، گیتا وگیت، گیت خەپیتە

واتا (مار)

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٧٤)

---

ئاوماڵك: ئاوماڵك هەیە بۆ پەژویاڵێکی ئاوی جۆگە یان ڕووبار یان لافاو هەڵی بگرێت

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٣٢)

---

ئامۆژناك: کوردییەکی پەتییە بەواتای خاوەن سەبر وخۆگرییە لەکۆێ دەگوترێ فلانەکەس زۆر ئامۆژناکە!

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٨١)

---

ئەمن لەکێ، ئەو لەکێ

(کێ: کوێ)

---

ئینەکی تێدایە: واتە سرێکی تیایە

---

ئیشی بەزاری، خۆم چومە یاری

---

ئازادی بیروباوەڕ بەولاوە بناغەی دیموکراسی ومافی مرۆڤایەتیە

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣١)

---

ئادەمیزاد لەهەموو فەلسەفە وباوەڕێك بە نرختر وبەشەرەفترە وناشێ ونابێ بکرێ بە بەندەی باوەڕ

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٢٥)

---

ئەوەندەی مێژوونووس سوود وەردەگرێ بۆ گەیشتنی بەڕاستی ڕەنگە هەر هێندە سوودمەند بێ لەخەبەری ڕاستی پاتەو پات

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٢٦)

---

ئایین خۆرسکە، سیاسەت وئابووری دەستکردن

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٦٢)

---

ئاواتم خواستووە بریام کێشاوە (لینین) ١٠ دەساڵ پتر ژیا بایە، (ماو)یش (١٠)ساڵ زووتر مردبایە

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٤٦)

---

ئێستاش سەرم لەوە سووڕ دەمێنێ چۆن زانایانی فەلەك بەر لە (٢٥٠٠)ساڵ توانیویانە نەخشەی بزوتنەوەی ئەستێرەی زوحەل وەیا مەریخ بکێشن، فەرموو سەیرێکی ئاسمان بکە وپێم بڵێ کوا زوحەل وکوا مەریخ؟

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٨)

---

ئەوەی خۆی دەکاتە لەمپەر لەپێش هەنگاوی کوردایەتی، بەقەناعەتی من نوێژەکەشی قبووڵ نییە، حەجەکەشی دروست نییە، ئەوە فکری من وئیمانی منە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٢)

---

ئادەمیزاد بەهەموو عەیب وعار وبەرز ونزمی کەلە سنووری فریشتە هاتە سنووری ئەهریمەن دەگرێتەوە، دروستکەری واقیعە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٨)

---

ئەو باوکەی لەسەر پشتی لانك کچە شیرەخۆرەکەی لە منداڵێکی شیرەخۆرە مارە دەکات کەمتر ناواقیعیەتی بەکارهێناوە لەو شۆڕشگێڕەی کە دەیەوێ سەرمایەی لەدایك نەزاو هەر لە منداڵدانی کۆمەڵایەتیدا بخنکێنێت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٦)

---

ئەو زاڵمە هێرشبەرەی کە بەچاوی کراوە دەست بەسەر گیان وماڵی خەڵقدا دەگرێ نەفسی بەدە بەڵام هۆشەکەی تاریك نییە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٥)

---

ئەگەر فیکری ڕۆشن خەفە نەکرابایە ڕێگەی لە چەندین فیکری تاریك وتەسك دەکردەوە ونەزۆکی دەکردن.

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٢)

---

ئەو عەقڵەی وای لەمۆرۆ کرد تەپڵ بۆ مانگیران لێ بدا تالەدێو ودرنج ڕزگاری بکات، هەر خۆی بوو مرۆڤی لەسەر مانگ دابەزاند

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٠)

---

ئیمکان هەیە ئەوەی بەئازادی قەناعەتی لەدڵی خۆیدا پەیدا کردووە بەئاسانی واز لەمەڵەی خۆی بهێنێت'

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٧)

---

ئامۆژگاریم بۆ ڕۆشنبیری تازە پێگەیشتووی کورد ئەوەیە خۆی نەکاتە پاسەوانی فیکرەی قالب بەستوو

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٧)

---

ئەتۆ سەیری ئەم جیهانە چەند سەیرە (مافی ئیعدامکاران)یش ئیمتازێکە هەل ومەرجی خۆی هەیە، بەلام مێژووی کورد بەدەست هەندێك لەڕۆشنبیرانی کوردەوە لەسەر پشتی لانکۆڵە فەتوای ئیعدامکردنی بۆ دەردەچێت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٦)

---

ئەوانەی لەدوای ئاودا دەگەڕێن ئەگەر لەودیمەنی وشك وبرینگی دەشت ودەرپەیامی بێ ئومێدی وەرگرن' دەبێ لەسەرەتاوە خۆبدەنە حەسانەوەی دەستەپاچەبوون ودامانەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣١)

---

ئاگات لێ نەبێ، ئەتووش دەفرۆشێ

(ئەتوو: تۆ)

---

ئەسپە ئەسپ نییە، دوو پێی هەیە سمی نییە، وەك ئەسپ دەڕوا ڕوحی نییە (پایسکل)ە

---

ئیتر تورك وعەرەب بووینە کورد یاخود کورد وفارس بوینە عەرەب! خۆ دانیشتوانی ئەمریکا بەتایبەتی هەرەمەیەکە وەك چێشتی حەفت ترینگە، ئەگەر سەقافەتی هاوچوون وزمانی ئینگلیزییان لێ بستێنەوە دەبنە سەد کەرت وپتریش.

((زاراوەسازی پێوانە- مەسعوود محەمەد ل٣٩)

---

ئەو زمان هەراشی ودرۆ وبوختانی ڕامالّم کراوە لەلایەن کەسانی حەیاتکاوەوە چ دەرمانێکی نییە غەیری ئەوەی کە لە ئاست ئەو نامەردانە نیوە بەتێکی فارس دەلّێمەوە:

قحبه بە مسجد افگند گفل حرامزادهرا

واتە قەحپە منداڵە بیژۆەکەی دەهاوێتە مزگەوت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٢٠٩)

---

ئەمریکا یەکی تاکە هێزی کاریگەر بێ لەو وڵاتانەی تێدا دەژین وشێخو لکێکی خەلیج بەسەرۆك دەوڵەت ڕاست ەکاتەوە وئیسرائیل بەسەر دنیادا بەسەپێنێ، بەئاسانی دەتوانێ پارێزگاری لە کوردێك بکات کە سودی ئەمریکای تێدابێ، بەڵام دەرکەوت بەسە هەمووردا چوو بوون وماشەیەك بوون، بەداخەوە کیسیخجەر پۆلووی پێ دەرهێنان لەبری ماشە. لەماموٚستا جەلال تاڵەبانیشم بیست کیسیخجەر پەشیمانی خۆی لای ئەو دەربڕیوە لەوەی بەرامبەر کورد کرا

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٧٩)

---

ئەوەی پێی دەڵێن جیهانی مەسحی مەشووره بە پێشکەوتن لە ئینجیلەوە ئەو پێشکەوتنە نەباری، بگرە قەشە شەڕی لەگەڵ زانست دەکرد بە گوتنەوەی دەقەکانی ئینجل وتەورات، خۆو تالعی مەسیحییەت، مەڵبەندی سازگاری ئەورووپا تۆدی ئینجیلی لێ ڕوا، خەڵکەکە بە ئەرکی خۆی دەبوو بەرەوشەنبیر وزانا ولێهاتوو. تەنانەت زۆریان لەدڵداوە دەهاتن لە ڕاگەیاندنی قەشەکان

مەسعوود محەمەد

(لــە وتــە بەنرخــەکانی مەســعوود محەمــەدی فەیلەســووف-ئامــادەکردنی حەیــدەر عەبدوڵلا ل)

---

ئیتر مـەلاکان بـەپێی تێگەیشتنی خۆیان فـەرمان شـەریعەتیان دەستنیشـان کـردووە، لەمەشدا (فراوانی)هەیە نەك (تەسکی) کە دەزانین لە دەمی دەسەلاتی لینین وستالین وماووکیم ئیل سۆنگ ڕێ بە کەس نەدراوە ڕەخنە لەو وەکیلانەی (خوای سەر ئەرز) بگرێ وە یا تەئویلی تێدا بەکاربهێنێ، تا ئەو دەمەش سۆفی و دەروێش شیوعییەتی نســکۆ هێنــاوە، مادییــەی تــەئریخی وئیشــتراکیی ببێتــە کێڵگــەی هــەوەس وتاقیکردنەوەی نامرۆڤانە وئاگری جەنگی فێنك وکڵپەدار بکات، ئەفغانستانی خاوەن حکومــەتی چــەندین ســەد ســاڵ دەســت لەبینــە قاقــای خــۆی بنێــت وبــەدەوری یــەك ئایندەوە شاپڵتە خۆی بکات.

مەسعوود محەمەد

(لــە وتــە بەنرخــەکانی مەســعوود محەمــەدی فەیلەســووف-ئامــادەکردنی حەیــدەر عەبدوڵلا ل٦٤)

---

ئەوسا مەلای دوازدە عیلم ولێزانی تەواو لەوانە بوو هەموو جیهان بە قوربانی (حجر الاسود) بکات بەلأم هەر لەدڵ وفکری خۆیدا، چونکە دەسەلأتی لەگەڵ نەبوو، ئێستا حسابەکە گۆڕاوە. سەقافەت دەشێ چ دەخلی بەسەر کاری سیاسەوە نەبێت وە یا سیاسەت بە تەواوی سەربەخۆ بێت وپەکی لەسەر سەقافەت نەکەوتبێ!.

مەسعوود محەمەد

(لــە وتــە بەنرخــەکانی مەســعوود محەمــەدی فەیلەســووف-ئامــادەکردنی حەیــدەر عەبدوڵلا ل٦٦)

---

ئەفسانەی دێوی سپی وقودسیەتی چەکوەچ وداس کە خوێریترین وسەرەتایترین هۆی بەرهەمێنی سەردەمی قالوبەلان، کزکز بەرەو ژێردێن ولـەزار قەڵەباڵغی کـەم دەکەنـەوە دێنە سەر باری رازیبوون بەلێکتر خامۆش بوون بە ئومێدی هـەلێکی داهـاتوو، نـەك باوەڕهێنان بە (لکم دینکم ولی دینی).

مەسعوود محەمەد

(لــە وتــە بەنرخــەکانی مەســعوود محەمــەدی فەیلەســووف-ئامــادەکردنی حەیــدەر عەبدوڵلا ل٦٩)

ئەو کاروانچی، ئەمن خانچی

ئەوەی تۆرایە، دۆڕایە بەش خورایە

(تۆرایە-تۆراوە)

(دۆرایە-دۆڕاوە)

(خورایە-خوراوە)

ئەوەی چاك وەناوپاکە، قونپانی بسمی دەنگ ناکا

ئەوەندەی پێناچێت، وەك شیر هەردەچیت

ئەگەر لینین نەگەیشتبایەوە ڕووسیا، شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ئیمکاندا نەدەبوو

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٧)

ئەورووپا بە درەنگەوە (مەبەستم شیوعیەتی ئەورووپایە) جورئەتی دابەرخۆی، دیکتاتۆریەتی چینی ڕەنجدەری لە ناوەڕۆکی بیروڕاو پێڕەوی سیاسی خۆی بسرێتەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٤٥)

ئەلمانیای نیوەی یەکەمی چەرخی بیستەم دووجار سواری چەرخ وفەلەکی فەنا بێت، زۆر فێڵت پەندی چەرچل هەلنەگرێتەوە لەسنوورکێشان بۆ پرکێشی ستالین وپتر لەچل ساڵ ئەورپای شەرق وناوەڕاست

ئاخوڕی خۆی لێ گۆڕایە-گۆڕاوە

ئاخوڕی پیری-جۆ بەتیری

ئاسمان دوورو زەوی سەخت

ئاگای لە خشەی مارو مێرووە

ئاو بەبێژنیگ دەبنی

ئاوی ڕژاو خڕ نابێتەوە

ئاوی خوڕ، زەوی دڕ

ئەسپێکی لەڕ، نەك تەویلەیەکی پڕ لەکەر

ئەو ڕۆ بە حازر، سبەینێ بەقەرز

ئەولای دایە بەولایە، گووی دا بە هەردوو لایە

ئەوە تڕێکی پێیە

ئەوە ملی من وچەقووی تو

ئەورۆ دونیایە، سبەینێ قیامەتە

ئەگەر مێیە، بەرکەی لێیە، ئەگەر نێرە، گۆشتی خێرە

ئەگەر نەتخورێ بەری ڕانی
چ ئیشتە بەنانی شوانی

ئەوەی تۆرا، شۆرا، دۆڕا

ئەوڕۆ هەورە، دەمی گورگ چەورە

ئەو هەرایە گەردەشە، هی ئەوەیە بێ بەشە

ئەوی برادەری کوورەی ئاسنگەران بی یان دەستی دەسووتێ یان کراسی.

ئەوی دەستی لە هەموو کونان رابکا، جارێك شتەکی هەر پێوە دەدا.

ئەوی لە ئاشی بێ، ئاشەوان نیە

ئەوڕۆ ئاش، سبەی تەڕاش

ئەوەی دات دیتتەوە، ئەوەی خواردت تیتەوە

ئەگەر بای هات هەموو دارەك دەلەرێتەوە، ئەگەر بای نەهات هەر ئەسپیندار دەجولێتەوە

ئەگەر عەردەك پووشی نەینی، کوو لۆتوو دەغران دەینی
کوو: چۆن
دەغر: دەغڵ)

ئاو دەباری، قسە لەزاری

ئەگەر کەر بەنەوسە، مستە جۆیەکی بەسە

---

ئەگەر گوربای لۆ منت بۆن دەبوو

گور: گوڵ

لۆ: بۆ

---

ئەگەر لۆ توو هەبی کراس ورەشێ

لۆ منیش دەبێ ئەنگوچك بەشێ

---

ئەگەر مەلەی نازانی، خۆت لەزێ یە مەدە

---

ئەگەر موو، بەقیمەت دەبوو، لەسەر گونان شین نەدەبوو

---

ئەگەر مێرد نەیکا ترۆ، بەخەڵکی ناکرێ خرۆ

---

ئاردی خۆمانی بێشت

کەپەکی خۆمانی رێشت

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە ورێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەولاد ئازاری هەیە، بێزاری نییە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە ورێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر دەسەڵاتت نەبوو بە (جوو)ی دەڵێ:

بەریشی مەردانەت قەسەم

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە ورێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ (کۆیە-دەستنووس)

---

ئەستێرەی کلکدار سارێ جارێ هەر دێ

(سار: ساڵ)

(هەردێ: هەڵدێ)

---

ئەگەر دزی، گورگی پەزی

---

ئەگەر رێگا دوورە، پێچکت ئەستوورە

---

ئەگەر (سە)بایە، پاسی حەفت مارانی دەکرد

(سه: سهگ)

(ماران: مالآن)

---

ئهگهر خڕنووك نیـ حوشترا لووك مهبه

---

ئهگهر شێخیش نهبێ بهسهر شاخاندا ڕۆیشتووه

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

---

ئاغا ژنی سهر چهپهڕێ

باوهشی کلکی کهرێ

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

---

ئهوهی ئاشێ، بیدهنه کراس ڕهشێ

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

---

ئیشمان کرد ولێ بووینهوه

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

---

ئهوهی بهسهر ئهوان هاتیه، بهسهر ژنه دۆمان نههاتیه

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

---

ئهوهی له ماران نییه ئاگای حاران نییه

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

(مار: ماڵ، حار: حاڵ)

---

ئاو لهڕێی کابه دراوه

(پهنـد ومهتـهڵی کـوردی-کۆکردنـهوه وڕێکخـهری تـاهیر ئهحمـهد حـهوێزی/ کۆیـه-دهستنووس)

---

ئـــــــەوەی لەســـــــەر ســـــــەبرانە، لەســــــەر خێرانـــــــە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئـــــەوەی بیخـــــۆی ماڵـــــە، ئـــــەوەی بمێنـــــێ میراتـــــە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر نەگەیشتیە کوێستانێ

خۆت بگەیەنە فەقێ یانێ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر هەژاری خێرت پێ ناکەن

ئەگەر دەوڵەمەندی حەزت لێ ناکەن

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوەی بە ترێ کەرێ پێ نکەنێ، لێوی دەقەڵیشتەوە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوەی بکا لۆمەی کودەران یا بەسەرخۆی دێ یا بەسەر جگەران

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئاگری جەرگی گەرمترە لە ئاگری پشتێ

هاتم گەیمە پێ دەشتێ

خەبەرەکی دیشم گەیشتێ

ئاگری جەرگی گەرمترە لە ئاگری پشتێ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەو مەشکە قابیلی ئەو دۆدانەیە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئیشی شەوێ، زۆری دەوێ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئاوەدان بێ هەریرە. هەر گوندەکە ونۆمیرە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر گوڵن، بەرانبەرن. ئەگەر زێڕن سەربەسەرن

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر عەجەم هات (ئێرانی) نانی لەسەر سێڵێ بفڕێنە

ئەگەر (ڕۆم) تورکی عوسمانی هات باغێ دا چێنە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوەندەی پێ خۆشە. گوندۆرەی بەدەمیەوە ڕاناوەستێ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوەندەی پێ خۆشە. لە مێوژە ڕەشکانی پێ خۆشترە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوی کەونەکی نەبی. نوێیەکی نایینی

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەمن حەقم چییە داکی عەزرەی کوڕی دەبێ یان کچ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر هەژاری، هەڕووە بەیاری

هەڕوو: برۆ

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەو پەڕەمان بەکلکێوە مابوو

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوەی ئەو ڕۆژی دا بەدوونێ

دارێکی دەچێتە قوونێ

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوی گەندومەندە، بەشی ئێمە هەر هەندە

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەسپێ لەدەست کۆری نایەتەدەر

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەسپی ئیشکەڕۆ، ژنی خێرا ڕۆ، باش نییە

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەگەر قەرزی بیست وشەشم کردبێ، بۆت جێبەجێ دەکەم

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوەندەی جوو فسێ بکەنێ، چوو وهاتەوە

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوەندە ترشە دەڵێی بزۆتە، لەقوونی (جوو)ی بکەی موسڵمان دەبێ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئێسك لەدەمی سەی وەرناگیرێ

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوی خڕم کردبۆوە بەکچی وبەکوڕی

هەمووم لەقوونێ هاتەدەر بەخڕی

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر شەعبانە وئەگەر رەمەزانە

مووچەی کوڕەکە چەڵ هەردوو نانە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر لاوی بەتاقە، ئەگەر حیزی بەباقە

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەگەر پێنج وئەگەر شەشین

هەموو میوانی مەنجەڵی رەشین

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئاو دەڕوا لە ڕووخانان

خۆیی نابی بە بێگانان

(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئەوەی خۆی نا پارێزی

ئارووی لێ دەکەنە تەرۆزی

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئاشی بەترێ دەگێری

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوی دەستی لەگەزی بکێشی

خوا بۆ جەهەندەمی رادەکیشی

گەز: پێوانەیە بۆ کوتاڵ وەك مەتر

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوە دەردە گایە، دەگاتە ئێرەش

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئێکیان ناڵە ونرکە، ئێکیان کورەلەزگە، ئەدی ئیشی ماڵی کێ بیکا؟

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەوەی بەسەپەنای ببرێ، دانەوێڵەیە

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئەگەر ومەگەر، بێ ئەولادن

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئینسانی بێ بەخت لەسەر دۆشەکیش دانیشی، پووشکەی لە قوونی رادەچی

(پەند ومەتەڵی کوردی -کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە- دەستنووس)

---

ئیشی گەیشتە ئێرگاینێ

(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئاخیری هەر دێتەوە سەر پەتك وسنگی خۆی

ئاگات لەخۆت بێ، حەوشەی دەمت گەورەیە

ئاگری کۆرە دێیان، لەشکری فەقێیان

ئاو شێلوش بی رۆن دەبێتەوە

ئاویش زۆر بمێنێتەوە بۆگەنی دەبی

ئەو مانگەی سەرانسەرە، مانگی دیش خوا خێرکەرە
(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئیش بە چەور وشیرینی بڕێتەوە
(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئەمن جوو نەبم، شەمووی لۆ بگرم
(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئیشکەری شیرینی، نوێژکەری نووڕینی
(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئەوی لە بۆ خۆی نەژی، خوای بکوژێ
(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئاسمان گەزۆی لێ دەباری، گوڵباتمان دێتە ریزی جەواری
(جەوار: جەواڵ)
(پەنـد وەمەتـەڵی کـوردی-کۆکردنـەوە وڕێکخـەری تـاهیر ئەحمـەد حـەوێزی/ کۆیـە-
دەستنووس)

ئۆخەی نەمردم، بە چەکمەی زەرد گووکردم
چەکمە: پێڵاو، کەوش
نازناوێك هەیە لە کۆیە (چەکمە ڕەق)
(پەند ومەتەڵی کوردی-کۆکردنەوە وڕێکخەری تاهیر ئەحمەد حەوێزی/ کۆیە-دەستنووس)

---

ئاخ لە دەستی زەمانە، مەشکە ڕەق وەمبانە، کەوتینە دەست ئەمانە.

---

ئاش بەتاڵ، ئاشەوان بەتاڵ.

---

ئاش نانەوە چییە؟ ناکەی وپاکەی وکوناکەی.

---

ئاوی دوای هەنار، وەك ژەهری مار

---

ئەسپ وهێستر لەقە لەیەك نادەن. لەبەر ئەوە یەك قەومن.

---

ئەسپی شێ یان دەترێ، یا دەفرێ

---

ئەگەر شووکردن لەبەر نان دەبوو ژن لەماڵ بابان قات نەدەبوو.

---

ئەوانە سەر وقوون کلاشێکن، بارەنگا وڕەنگ، لە قوماشێکن.

---

ئەیەوێ شانەکە لەسەر من دا بشکێنێ.

---

ئاخۆران و گاخۆران

---

ئاش ئاوی نەمابوو، ئاشەوان دەیگۆت: ئەوشۆ ئەوەندەی لێ دەکەم

---

ئاش بێ ئاشەوان نابێ

---

ئاوێ لە دوو قەزوانی، شیرن بە لەکن هەوگیانی

---

ئای چەندت لەبن سەری دایە
ئەخوا نانی هۆزان، دەکا لەقەپۆزان

---

ئەستێرەی بەکلك سەت سار جارەك هەردێ

---

ئەگەر دەتەوی لەناو پیاوان دیاربی، پیاوبە

---

ئەگەر ڕاستە، کەرە لەماستە

---

ئەگەر ڕوون هەبی لەدیزە، کابان چ حیزە؟!.

---

ئەگەر سەبووایە، پاسی حەفت مارانی دەکرد

ئەگەر عەردەك لۆخۆی پووشی نەینی، لۆتۆ دەغری نایینی

ئەگەر قسە لە زاری، ئاو دەباری

ئەگەر کەر بەنەوسە، مستە جۆیەکی بەسە.

ئەگەر کیژ ناسکە، کوڕ ناسکترە

ئەگەر گریان نەبێ، قەدری پێکەنین نازانین

ئەگەر گور بوای لۆمنت بۆن دەبوو.

ئەگەر گورگ نەمینێ، سەگەل ڕاناگیرێ.

ئەگەر لە خۆت دەخەفتی، دەرێی ماینێ بەڕەختی، ئەگەر لە خۆت ناخەفتی، دەرێی کوندە بەجەفتی.

ئەگەر لەماری باوانم هەبی دەنگ، لەماری خەزوورانم دەبی ڕەنگ

ئەگەر ناپیاو دوا، ئەتۆ بێ دەنگ بە.

ئەگەر نەت خوری بەری ڕانی، چیشت لەنانی شوانی

ئەنجامی پەلەکردن، بەهەڵە چوونە.

ئەو بەردە گەرمە، بە قوونی من ناکەوێ.

ئەو کەسە قازانجی کرد، سەر برند ژیا

ئەو هەرایە وگەردەشە، هی ئەوەیە بێ بەشە

ئەوی دەستی خۆی دیت، بابی خۆی ناناسی.

ئی چاکی بە گونێ کاکی، ئیزو پرێ بەگونی مرێ.

ئیشی نۆران، ڕێی کۆراز

ئینسان بوخچەیە، هەتا نەی کەیەوە، نای ناسی.

ئەلە جولەکەبوو

ئیشکەبیرۆ: ئەگەر کەسێك ئیشکە بیرۆی لەدەم وچاوی یان دەست وقاچی پەیدا بووبا ئەوە دەچوونە لای کەسانێك کە ودمیان هەبوو بۆ ئەو نەخۆشیە ئەوجا کەسە خاوەن ودمەکە چەند جارێك تفی بۆ لەوشکە بیرۆیەکە دەدا بۆ چاك بوونی.

(کەلەپوری کوردەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٣٩)

ئیشکەکەند: کێڵانی زەوی بەئیشکی پێش بارانی پەڵە لەزەوی بەیار یان پەرێز
(کەلەپوری کوردەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل١٠٩)

ئیخە: بۆ لێخوڕینی بزنە
(کەلەپوری کوردەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٩٤)

ئایا ڕژێمی شیووعی هیچ کوێرەڕێی بە کراوەیی هێڵابوۆوە بۆ ئەوەی شیووعییەك فەتوای بدات دژی بیر و ڕای لینین و ستالین و ماو؟

ئاکامگری: إستنتاج

ئاردێ دەبێژی قوونی بادەدا، مارێ دەمارێ لەخۆی هەردەدا

ئاردی بدە ئارد بێژی، با نیوەی بڕێژی.

ئاردی بێژراوە وسۆسی ڕژاوە

ئاسمان لەبەر چاوم تاریك بووە.

ئاشی بەوشکی دەگەڕێ

ئاشی درۆزن، بەفوو دەگەڕێ

ئاشی شل بێ، کاوانەکەی بڵ دەبێ، هەر کەس بیخوا گول دەبێ

ئاگر نەگەیشتە جێگا، دووکەری لێ هەردەستا.

(دووکەر: دووکەڵ) (هەردەستا: هەڵدەستا)

ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەوە

ئافرەت ئاواتی پیاوە

ئالیکی دوو وراغانی، پێ بەش ناکرێ

(وراغ: وڵاغ)

ئاو بڕوا، زیخەکەی دەمێنێ

**ئاو چەند بۆشە، ئاش ئەوەندە خۆشە.**

**ئاو لە ئاونگ کوتان نەبووە.**

**ئاو لە دنگا ئەکوتێ.**

**ئاوی بیریش ئەگەر بە ئابووری نەبێ، هەر بنی دێ.**

**ئاوی پایزان، بدە ئازیزان.**

**ئاوی ڕۆیشتوو، ناگەڕێتەوە.**

**ئەسپ پایەکی ڕەنجە. پایەکی گەنجە.**

**ئەگەر بابیمان نەدیتایێ. دەیگۆت بەچکە وەزیرم.**

**(باب: باوك)**

**ئەگەر بزن هاتە مردن. چەقووشی لۆ زۆر دەبێ.**

**(لۆ: بۆ)**

**ئەگەر پیاو کەوتە بیرێ. چ گەزێك بێ وچ نیو گەز.**

**ئەگەر خوا بدا سەد سوڵتان بە هیچ، ئەگەر خوداش نەدا لەهیچ کەس مەپێچ.**

**ئەگەر خوا بناسی بەدل. مورادەکانت زۆر دەبێ حاسڵ.**

**ئەگەر دەترسی، چیتە لە لووس وپووسی.**

**ئەگەر دەرسە، حەرفێك بەسە.**

**ئەگەر دەستت کەوتە بن سەری خەڵکی، بەئەسپایی دەری بینە.**

**ئەگەر دمدمی لۆ بیگێڕیەوە گریانی دێ.**

**(لۆ: بۆ)**

**ئەگەر دێر هاتی، بەلام شێر هاتی**

**ئەگەر قەلەڕەش ڕێ نیشاندەر بێ، دەبێ گەورە دەربەردەربێ.**

**ئەگەر قورئانێ ئەوها بخوێنێ، ئابرووی موسلمانان لەبن دەردێنێ.**

**ئەگەر کاریتە نەما، دەستەك ڕاناوەستێ**

**ئەگەر کەرن، بەرامبەرن. ئەگەر ئێسترن سەر بەسەرن.**

ئەگەر دێر بەبایە، سەگ دێ لە بەغدایە

(دێر: سەگ، دێڵە سەگ)

ئەگەر هەنگوین بێ، مێش دەتخوا.

ئەگەر هەوەس بوو، یەك جار بەس بوو.

ئەگەریان دا بە مەگەر، کوڕێکیان بوو ناویان نا (شەڵلا).

ئەقڵی سووك باری گران، ئەقڵی گران باری سووك.

ئەقڵی کەسك وسۆری پەیدا کردووە؛

(سۆر: سوور)

ئەم پەندە ڕاستە جێگەی باوەڕە، دوو زمان دیارە ئاگر خۆشکەرە

ئەو هەموو کونە بەمن ناگیرێ

ئەوەندە مینگە مینگ مەکە

ئەوەی بە توندی لە جێی خۆی هەستا، کاتێك ڕوانی ماندوو بوو وەستا

ئەوەی لە سامان نزیك بێتەوە، ڕەوشتی بەرزی بیر دەچێتەوە

ئەگەر ڕەشە، خاوەن بەشە

ئینساف وقالە ڕووتە، هەردەپەڕن بە جووتە.

(هەردەپەڕن: هەڵدەپەڕن)

ئەگەر کوندە بەبۆ کەڵکی ببوایە، ڕاوکەر بەجێی نەئەهێشت.

ئەوی تەڕبێ، لەباران ناترسێ.

ئەوی گەڕا دڕا، ئەوی کردی بردی.

ئیش ئیشی خاتوونێ، ناو ناوی مەیمونێ.

(ئیش)وەك کەرە، تالێی نەخوڕیت ناڕوا.

ئاسمانێکی نزمۆکە، لێی دەبارێ بەفرۆکە.

(هێللەگ: هێلەگ).

ئەوە چییە؟ ئەوە چییە؟ دوو دیوە کۆڵەکێکی هەیە.

(لووت).

ئەوە چییە؟ ئینسان دەیبنێ، خودا نایبینێ.

(خەو)

---

ئەوە چییە؟ سپی وەك کەشکێ، قوتە وەك مشکێ.

(شەیتانۆکە).

---

ئەوە چییە؟ شتێك هەیە، هەموو شتێکی تێدایە.

(پیتی ئەلفبا).

---

ئانیشك: بەندی نێوان قۆڵ وباسك

---

ئەگەر دەمزانی کەی دەمردم،خانەی ئاوەدانی وێران دەکردم

---

ئەگەر هیچ دەزانی خۆت دەگەینیە ئاگری پاش نانی

---

ئەوی لەبو خۆی نەژی،خوای بکوژی

---

ئاسمان گەزۆی لی دەباری،گوڵباغان دێتەریزەی جواری (جەواڵ)؟

---

ئەگەر شتەکت نەزانی،سەیرکەجیرانی

---

ئێسك لەدەمی سەی وەرناگیری

---

ئەگەر ئیشەکەمان وا بڕوا،دەبێ کلاوی تێ بنێین

---

ئاغا گانی دەکا،منەت لەسەر ئاوایی دەکا

---

ئەگەر یەکێك بە ئیشێك ڕانەگەیشت هەردەبێ بڵێ: حەیدەرم قەلەندەرم

---

ئەوەی لەپڕێ ببتە کوڕی،هەردەتڕی

---

ئێمە زوبان درێژی دەست کورتین

---

ئاو لەڕێ ی کابەی دراوە

---

ئاوی دوا بەرووی.نەوەندە شیرن بام لەکن خەسووی

---

ئەوەی بکالۆمەنی خاوەن کودوران کودەڵان یا بەسەر خۆی دی یا بەسەر جگەران

---

ئاردی خۆمان بێشت.کە پەکی خومان ڕشت

---

ئەوجا کڵاوێ دانی و سلاوی لێ بکە

---

ئاگر بەبووە حەویجەی قەراجی لەگەر سوتایە

جێگای مراز وەقسەدان تەکیەی مەلا عەولایە

ئەمن دەست هەڵناگرم لەبەژنەکەی یار ئۆرمزێ

هەتاوەکو عەردنەروات وخێشین نەبێ وسێرنەزێ

حاجی حەمەدەمین ئیلینجاغی

ئەگەر دەتەوێ نوێژی سبەینەت نەچی، خۆت قەرزاری کرەنجی بکە.

ئاتەگ: شەقەڵ، داوێنی کەوای شۆڕ: (نوێژ لەسەر ئاتەگی دەکرێ). ئاتەگ نەك هەر بۆ داوێنی کەوا، بۆ داوێنی کورتەك وسوخمەش دەگوترێت. کەچی ( (تەشك) جگە لەو سێیانەی سەرەوە کراس وعەباش دەگرتەوە.

(عەزیزی مەلا ڕەش، هەنبانە بۆرینەم داواد، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧) لە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

ئاشانە: دەیەکی مزاش کەبەشی خاوەن ئاشە. ئاشەوان دەیداتێ، ئاشانە تەنیا بۆ خاوەن ئاشە. ئاشەوان کرێی تایبەتی خۆی هەبوو. کەمانگانە لەمزەی ئاشەکەی دەدرایە.

(عەزیزی مەلا ڕەش، هەنبانە بۆرینەم داواد، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧) لە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

ئاوڕێژ: جێی میز، ئاودەستخانە.

(عەزیزی مەلا ڕەش، هەنبانە بۆرینەم داواد، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧) لە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

ئاقار: شوێن جێگە، دەوروبەر، مەڵبەند وناوچە، ئاقار=دەشت وزەوی وزاری دەرەوەی ئاوایی.

(عەزیزی مەلا ڕەش، هەنبانە بۆرینەم داواد، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧) لە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

ئالیك (ئالك): جەمە جۆی ولاغی یەك سم ئالیك جەمەکاو جۆرپووش و...بۆ ولاغ ومەڕ وماڵات دەگوترێت.

(عەزیزی مەلا ڕەش، هەنبانە بۆرینەم داواد، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧) لە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

ئاودز: درز وقڵشی ئاو. ئاودز دوای تەرکردنی برین تەشەنە بکات.

(عــەزیزی مــەلا ڕەش، هەنبانــە بۆرینــەم داواد، گۆڤــاری ڕامــان ژمــارە (٦٧) لــە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

---

ئــاوینگ: پڕیشــکە ئــاگری وردیلــە. کــە لــەکۆتایی ئاســنی ســوورەوەکراو دەپــەڕێ.
ئاورینگ گرێیەکی خڕی بچووکە ولەتاوژانی برینان لەبەری ڕان یان ژێر هــەنگڵ یــاخۆ بناگوێ پەیدا دەبێت.
(عــەزیزی مــەلا ڕەش، هەنبانــە بۆرینــەم داواد، گۆڤــاری ڕامــان ژمــارە (٦٧) لــە ٢٠٠٢/١/٥) ل٦)

---

ئەگەر لۆ خۆت نەتزانی
برۆنە کن جیرانی

---

ئاغا ناردی لۆ مەڕەکی دەخۆی ناخۆی قشپلەکی
((یاریەکی منداڵانە))یە

---

ئاوگەلە یان ئاوەکی ئەو ئاژەڵەی لە مێگەلی خۆی دادەبڕێ ودەچێتە نێو مێگەلی دیکە، ئەو ئاژەڵەی ئاوگەلە دەبێ، لەنێو مێگەلی بێگانەدا خۆی بە غەریب دەزانێت.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٥)

---

ئەستەویر یان قسر ئەو مەڕ وبزنانەنی بەران وتەگە ناخۆن ونازێن.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٥)

---

ئاومارك: پۆشوپەلاش وچیلکە داری ڕامالدراوە بەهۆی ئاوی ڕووبار وباران.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨٧)

---

ئەسپ بخەسێندرێت. ناحیلێنێ.

---

ئاشەبا: ئاشێکە بەهەوا کاردەکات.

---

ئاوەڕووت: ڕووتکردنەوە بەئاو، پەڕداماڵینی پەلەوەر بەئاوی گەرم.

---

ئاوەگر: بەدەمی سەگ پیس بوون، دەڵێن ئاوە گربوو. لەبەر ئەوەی ئاوی دەمی سەگ پیسە، جاران بەگڵی سۆریان دەشوشت.

---

**ئاوبەند:** ١. کۆبوونەوەی ئاو لەزگ. ٢.تونێلی کارێز پێشەکەی بگیرێت. جا وەستای تایبەت بە کارێز دەچووە ناو تونێلەکە وبەندەکەی دەشکاند و ئاوەکەی بەردەدا.

---

**ئاوخواز:** زەویەکە ئاودانی زۆر بوێت.

---

**ئاوخۆرەوە:** کەسێکە لەگوند نیشتەجێ بێت، بەڵام زەوی نەبێت

---

**ئاوشنگ:** هەر مەڕو بزنێکی بەرخ وکاری نەمابێ وشیریشی هەبێت و وشك نەکات یا لەدوای وشك بوونی شیری بێتەوە.

---

**ئاوشۆر:** شووشتنەوەی برنج و نیسك... بەر لە لێنانی.

---

**ئاو وئاوچی:** بڕۆی قەت نەگەڕێیەوە، بمری.

---

**ئاوی لێ مەخۆوە:** جێبەجێ بکە بەبێ ئەوەی بیری لێبکەیتەوە.

---

**ئەبو دوجانە:** نووشتەیەك بووە هەق دەستەکەی زیاتر بووە لە نووشتەی ئاسایی کە واتاکەی خاوەنی دووگیان دەگەیەنێت .

---

**ئەسپەرە:** ئەو دارەی لەسەری ئاسنی پێمەڕە دادەنرا بۆ ئەوەی پێی لەسەر دابندرێ بۆ کارکردن جاران زیاتر لە داری توو دروست دەکرا بەهۆی پتەوی ئاو هەڵنامژێت.

---

**ئەشرەفی:** گوڵێکی ڕەنگ پەمەیی بۆنخۆشە.

---

**ئەوپەڕی:** بەزۆری، ئەوپەڕی ئاگاتە سەری مانگێ

---

**ئەوجێ:** ئەو جێگایە

---

**ئەهوەن:** ئارام، نەمانی کێشە: با دنیا بڕەك ئەهوەن بیتەوە

---

**ئەیەبا:** ئەی بابە وشەیەکە بۆ سەرسوڕمان بەکاردێت، بەواتای چیت کردووە، چیت وتووە، لەوانەیە لە (یابە.یابابە) ی عەرەبیەوە هاتبێ.

---

**ئۆغەن:** حیسابێکی ساڵە. کەوتۆتە دوا هەفتەی چلەی گچکە.

---

**ئیستەرەم:** هەر ئێستا هەر ووشەی ئێستایە پێ دەچێت تورکی بێ.

---

**ئیغدان:** جۆرە سندوقێکی لەدار دروستکراو بوو تایبەت بوو بەقاپ وقاچاغ تێکردن لەشێوەی کەوەنتەری ئەمڕۆکە بوو.

---

**ئاخری پیری، جۆ بەتیری**

---

ئیزرەم: کێشی عەتاری کۆیە وسلێمانی بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٩٠

---

ئەلیدەرەم: لە ئیزرەم بچووکتر بوو، تایبەت بوو بەکێشی کۆیە وسلێمانی.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٩٠)

---

ئاوەگر: ئەگەر کەسێك دەستی بەسەگ کەوتبایە، دەستی ئاوەگر دەبوو، دەبووایە دەستی بە خۆڵە سوور بشوات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٩٩)

---

ئاگرۆکە: جۆرێك بوو لە نەخۆشیی پێست ومنداڵان تووشی دەبوون.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٣)

---

ئەسپۆن: ڕەگی جۆرە پنچکێکە وشکدەکرایەوە وبەجۆنی دەیانکوتاو لەجیاتی سابوون جلوبەرگیان پێ دەشۆری.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٥)

---

ئەسرەمۆك: پەسیرەی ڕەش وسپیی ترێیە وەك مێوژ هەڵدێخرێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢١)

---

ئاریندار: داری باریك ودرێژە کە بۆ سەری کەپران بەکاردێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٢

---

ئاولەمە: کورپەی نێو سکی دایکە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٣٩)

---

ئاوی دەینم لە مەینێ.

کای دەینم لو کادینێ.

قوڕی دەینم لە قوڕشینێ.

ئەوەی هێلانەم لێ خراپ کا.

خوا لەداك وبابی خۆی بستێنێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٥٥)

---

ئیترواسك: باڵندەیەکە وکەمێك لە کۆتر گەورەتر وقاچی درێژە وڕەنگی مەیلەو شینە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٥٦)

---

ئاوی زێیە ودەبڕەی لێیە.

---

ئاخر دێیەك چەند کەسە؟ بانگەوازێکی بەسە.

---

ئاخری پیری تانجیم پێدەگرێ.

---

ئاخری پیری+داخی ئەمیری.

---

ئاخری خێربێ+نۆبەرەی نێر بێ.

---

ئاخری مەلایی+ئەوەڵی گەدایی.

---

ئاخوڕی لێگۆڕاوە.

---

ئارەزوو، سنووری نییە.

---

ئاڕەقی نەڕشت، سامانی هەڵڕشت

---

ئاژەڵی فەقیر+دەکەوێتە گیر.

---

ئاش، بێ ئاش وەستا کار ناکا.

---

ئاشتی لە دوای قین، خۆشتر لە هەنگوین.

---

ئاشنایی، ڕۆشنایی.

---

ئاشی ئاو بەئاو، ئاشی با بە با.

---

ئاغا بە کش وفشی، ختە ناکا لە پشی.

---



ئاغاژنی نەشمیلە+خت ناکا لە پشیلە.

ئاغای نەزان نۆکەرە+نۆکەری ژێر سەروەرە.

ئاگر وئاو. هەم ژیانن هەم زوخاو

ئاگر ولۆکە نابن بە برا.

ئاگر ونەخۆشی ودژمن، کەمیش بن هەر زۆرن.

ئاگری تێ بەردا.

ئاگری دوور، تینی نییە.

ئامۆژگاری گورگیان دەکرد، وتی ڕانەکەم ڕۆیی.

ئاو بەرەو خوارە بۆزەوی و زارە.

ئاو لە بیابان و نان لە گرانی.

ئاو و ئاگر+دژی یەکتر.

ئاوی پاییز، هەوای بەهار+لەبەر دڵە وخۆشە لە زار.

ئاوی جۆگەلە خۆشترە لە ئاوی دەریا.

ئاوێنەی بێگەرد+دەترسێ لە بەرد.

ئەجەل هات+ژیان هەڵهات.

ئەدەب پەرژینە.

ئەسپ بۆ مەیدان کەر بۆ کا کێشان.

ئەسپ و پاڵەوان+بۆ ڕۆژی مەیدان.

ئەسپ و هێستر شەڕ دەکەن+گچکە لە لەوەڕ دەکەن.

ئەسپی چاک، قەمچی ناوێ.

ئەسپی شێ، لە دڕک دەترسێ.

ئەسپی غار+نابێ بۆ بار.

ئەسپی کوێت+یەکی ناکەوێت.

ئەستەمە. وەسواس+خۆی بکا خەلاس.

ئەقڵ، تاجی زێڕینە+لەسەر هەموو کەس نینە.

---

ئەگەر بەکەڵکی+جێی هیوای خەڵکی

---

ئەگەر خوا یار بێ+با دنیا بار بێ.

---

ئەگەر خوا یار بێ+ با شمشێرت دار بێ.

---

ئەگەر شەریك بی+ دەبێ خەریك بی

---

ئەگەر کوڵك و موو دەبو بە بەخت+بزن دەچوە سەر تەخت.

---

ئەگەر کەر ببێ، کورتان هەر دەبێ

---

ئەگەر نیمانە، خۆ بینیومانە.

---

ئەم تەنشت و ئەو تەنشت+ هەموو قوڕ و کووڕە پشت.

---

ئەم دار تا ئەو دار+ خوا دەگۆڕێ بار

---

ئەم عەرزی خوایە، وەك چەرمی گا بۆ هەمو کەس راخرایە.

---

ئەم کاسەت دا بەو کاسە+هەڵمەکێشە هەناسە.

---

ئەوە بابی هەموانە.

---

ئەو تڕیوە و ئەم دەرپەڕیوە.

---

ئەو خوا بکا بمرێ، خەمی تابووتی نەبێ.

---

ئەو سەرە سەرە+دایم لە سەرە.

---

ئەو کێشای جەفا+ئەم بردی سەفا

---

ئەو کەسەی کەری نییە+لە جۆ خەبەری نییە.

---

ئەو مارەمان کوشت کە لێی دەترسای.

---

ئەو گوڵە+دەمار زلە.

---

ئەویندارى حەرەمی؟+لە بیابان بی خەمی.

---

ئەوە دز و ئەویش بزن.

---

ئەوە یارە+هەڵگری بارە.

---

ئەوەندە ئازیزە+وەك ڕۆنی دیزە.

---

ئەوەندە فیشاڵی کرد+هاکا ئاش بەتاڵی کرد.

ئەوەندە هارە-دەڵێی مارە.

ئەوەڵ پەند+دوایی بەند.

ئەوەڵ فیز دوایی زیز

ئەوەڵ گەڕ+دوایی شەڕ

ئەوەی بەچکەی بوو بە دوو، تێر ناخوات بە ئارەزوو.

ئەوەی دەدوێ بە مەکرەوە+دەچن بۆلای بە غەدرەوە.

ئەوەی دەستی ڕەش نابێ+ تامی دەمی خۆش نابێ.

ئەوەی دەیدەم بە کرێ+دەیدەم بە ترێ.

ئەوەی دەیکا بۆ جێگە+نایکا بۆ ڕێگە.

ئەوەی قەرزارە+سەری لە خوارە.

ئەوەی کاروانچییە+هاوەڵی خانچییە.

ئەوەی کراوەیە+براوەیە.

ئەوەی لە خۆشیدا، یارە+زێڕێکی کەم عەیارە.

ئەوەی لە خێزانی بگرێتەوە+خوا لێی دەگرێتەوە.

ئەوەی نان دەرە-فەرماندەرە.

ئەوەی نانی خۆی پێیە+ناپرسێ باوان لە کوێیە.

دەیچنێ و دەیجنێ.

ئیشت بدەی بە ئاشی، تێکی دەدا بەباشی.

ئیشکەر سەربەرزە.

ئیمڕۆ بیچێنە-سۆزی لێی بێنە.

ئیمڕۆ تێکۆشە سۆزی بنۆشە.

ئەورۆ قۆزی+سبەی تۆزی.

ئینسان دووجار لەدایک نابێ.

ئێستە هەژارە+بارەکەی لارە

ئێشاندت دڵ+لێی بکە سڵ

ئێمە تێروپڕ+دنیا ببێ قڕ

ئێمە لەمبەر+ئێوەیش لەوبەر

ئێوارە وەختە+کەچەڵ بەجەختە.

ئیشی حەواڵە بە گەواڵە، کردنەکەی مەحاڵە.

ئەوەندە گەڕایە، دڕایە.

ئاردی بێژایە، کەپەکی مایە

ئاسمان لێفەبێ، داینا پۆشێ

ئاش بەفوو ناگەڕێ.

ئاشتی بەئاشتی،چێشتی بەچێشتی.

ئاش هار بێ، ورد ودڕشت دەهاڕێ.

ئاسن هەرچەندە ڕەق بێ، هەر پێویستی بە تەختەیە.

ئاشتی دوای داوا، خۆشترە لە حەلوا.

ئەمانەت وقیامەت.

ئاگری بن کایە، بۆنسۆی لێ نابە.

ئاگات لە دەمت بێ.

ئاگر بەر بێتە لێری، تەراشی تەڕیش دەسووتێنێ.

ئەگەر ڕووتی، مەڵکەمووتی

ئەگەر ڕۆستەم بی لە نەوەی زالی، هیچ قەدرت نییە چونکە بێ ماڵی.

ئاو ببڕێ لە ڕۆخانە، قەوم باشترە لە بێگانە.

ئەوی تێر نەخوا چی لە ئاو بکا؟

ئاو کە پەنگی خواردەوە، ڕێ لۆ خۆی دەکاتەوە.

ئاو بە هەورازدا هەرناگەڕێ.

ئاو ڕووناکاییه.

ئاو زۆر بێت، کانی و ئاو دەژێتەوە.

ئاگری جگەر هەری گرت.

ئاو وئاگر، لەکەس نەبن حازر.

ئاوی لێ ناخواتەوە

ئەوەی لە پێشم تێ ی هەردەکێشم.

ئەتۆ لە ماری خۆت. ئەمن لە ماری خۆم.

ئەستێران دەژمێرم شەوێ

خەو بێ لەچاوم ناکەوێ.

ئەگەر دەولەت هاتە سەرێ، بزەڕێ وەکی کەرێ.

ئەگەر دەتەوێ مێشکت ساواکەی

لەگەڵ گەوراندا شەر وداوا کەی.

ئەگەر بای هات. هەموو کونان دەگرێتەوە.

ئەگەر هەتبێ، دەورت پڕە.

ئەگەر پیر بەنوێژە. شەوگار درێژە.

ئەگەر خودا بدا، تۆ بنوو.

ئەگەر خودا باری حوشتر بدایە، ئەبوا سەربانمان گشت برووخایە.

ئەگەر گوریە بۆر شاخی لێ برووێ، دەنگی بولبولمان نەدەهاتە گوێ.

ئەگەر خەجە، ئیشی وی قنجە.

ئەگەر خەو دەبوو بە مایە، کەروێشك دەبوو بە گایە.

ئەگەر دڕ چووە سەر دیواری، لێت دەبێ بە قەندی شاری.

ئەگەر دڵ گرتی سۆزەی قۆریانی، نە چۆڵ دەپرسێ نە ئاوەدانی.

ئەو کاتە زانیم کار گووبەگووە، سەرۆکی بازاڕ یاقوبەجووە.

ئەم بۆ ناو هۆز، ئەو بۆناو کۆز.

ئەم چاوی بەو چاوی نازانێ.

ئەورۆ لەمنە سبەی لەتو.

ئەم ڕێیە، ناچێ بۆ ئەو دێیە.

ئەو حەوشە، نەك ئەو درەوشە.

ئەو هەوارە، نەك ئەو بوارە.

ئەورۆ پێت دەڵێن لەدەورت گەڕێد. پێت هەرخلیسکا دەرێن لادە لێم.

ئەورۆ دنیا، سبەی قیامەت.

ئەم لا دەکەم ئاو دەمبا، ئەولا دەکەم گورگ دەمخوا.

ئەمن ئەزم، هەردەبەزم.

ئەو بلوورە شکا کە کێرت تێ دەخست.

ئەو بایە لە گوێت دەرکە.

ئەو لۆ خۆی دانیشتیە لەوێرانەی وێری، خەڵکی تەموورە لێ دەدەن بە گون وبەکێری.

ئەو بەنە بەتۆ با نادرێ.

ئەو تاجە زێرەی لەسەر منیان دانایە، با لەسەر توی دانێن.

ئەو تڕانە هەر دەکەنێ.

ئەو چاو وڕووە، هی خۆت بێ.

ئەو ژنەی ددانی جوان نەبێ، بەچاو پێدەکەنێ.

ئاردی بێژرایە سۆسی ڕژایە.

ئەو قوونە، ئەو کۆزەرەی ناکوتێ

ئەو کەسەی سەربانی زیاتر بێت، بەفری زیاترە.

ئەو کەسەی ماری نییە، خزمیشی نییە.

ئەو مارەی بە تۆم دا، بەرد بوو لە ئەژنۆی خۆم دا.

ئەو مرد وگەییە جێی حەق، ئێمەی زیندوو لەجێی ناحەق.

ئەو هەموو کەرە هەیە وئێمە پیادەین.

ئەوە دەردت بێ!.

ئەوەندە کشتی مەکە بپسێ، ئەوەندەش شلی مەکە نەنووسێ.

ئەوەندەی بدە بەر داسی، تێدا نەمێنی عاسی.

ئەوەی دۆست بە دۆستی دەکا، دوژمن بە دوژمنی ناکا.

ئەوەی دەترسێ، هەر ئەو دەپرسێ.

ئەوەی شیری پاکە، لەشێر بێ باکە.

ئەگەر پاکی. بێ باکی.

ئەوەی دەکەم وتۆبەی دەکەم.

ئەو نزیکە خوایە، نزیك بەرایە.

ئارەقی ڕەش وشینی پێوە نەکردیە.

ئەوی منارە بدزێ، کیفیشی لۆ دەکات.

ئەوی نەبێ لە دەرپێی شرم، نابێ بە کوڕم.

ئەهلی پارێ. ناچنە هاڕێ.

ئێرانم کرد، توورانم کرد، کەسی وەك تۆم پەیدا نەکرد.

ئێواران هەوری سوور، بەیانیان ڕێگەی دوور، بەیانیان هەوری سوور، ئێواران قوون تەندوور.

ئۆخەی ماری خۆم، مەیلم بێ دەتخۆم، مەیلی بێ ناتخۆم.

ئەوەی دەکا دەیزانێ، ئەوەی هەر دەیخوات چوورزانێ.

ئەوەندە ترشە. بزن دەخاتە تەگە.

ئەوەی تووی درك بچێنێ، تا مایە گور نابینێ.

ئاهێکی مایە ونەمایە.

ئەوەندەی خوێندیە دەرسی شەیتانی، لەخوا ناترسێ لۆ بێ ئیمانی.

ئامۆزا وپوورزا قسەی ژنانە، دڵسۆزت دەوێ ئەوڕۆ لە قڕانە.

ئەگەر گوتی: نا، نا.

ئەوەی بەنانی بەڕوو ڕاهاتبێ، بەنانی گەنم قەبز دەبێ.

ئەوەی چووە سەر ماری بابی ژنێ، هەردوو دەستی بەوی گونێ.

ئەوەی لای بەندە خەیارە، لای خودا بەتارە.

ئەسپ وزین، کەر وقەراشە.

ئاوی زۆر، ئاوی کەم لوولای خۆی دەکێشێ.

ئەمن و ئەتۆ لە بەینا نییە.

ئاوی شیرین لە گری سوور دەرناچێ.

ئاشی بە درۆیان بە فوو دەگەڕێ.

ئاگر لە کۆلکەداری دەمێنێتەوە

ئاخوڕی بەرزە.

ئاوڕێژ: شوێنی لێژبوونەوەی ئاوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان -حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٦)

ئاغابان: خانوویەکی بچووکی شارستانی بوو کە لەسەری دەخەوتن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان -حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٨)

ئازادی ژانێکە بەیەك پارچەیی لەدایك دەبێ بەخۆ خۆری لەبار دەبرێ

(د.کەمال مەعروف)

ئاخری عومر و ئەوەڵی ترۆی

ئەگەر کردت نان و نمەکی.

لەگەری مەکە بێ ئەمەکی .

(لەگەر: لەگەڵ)

ئەوەندەی بدە بەر داسی،

تێیدا نەمینی عاسی.

ئاخوڕی بەرزە.

ئاغا ژنی سەر چەپەرێ، پشیلە هات
دوونگەکە بەرێ، بێزی نە هات ختەی کەرێ.
ئەوەندە ساغە، وەك داری ئیلینجاخە .

---

ئەوەی لە کۆشیدا بوو، بە گۆڕێی وەر کرد.

---

ئەگەر دەتەوێ عەقرت ساواکەی،
لەگەر گەوراندا شەڕ و داواکەی.
(عەقر: عەقڵ، لەگەر: لەگەڵ)

---

ئاخ و ئۆخی لێ بڕی.

---

ئەو باوکەت مرد.

---

ئەو کاتە زانیم کار گوو بە گووە،
سەرۆك بازاڕ یاقووبە جووە.
ئەو ماڵەی بە تۆم دا، بەرد بوو لە ئەژنۆی خۆم دا.

---

ئەگەر ڕەمەزانە وئەگەر شەشەکانە، مووچەی کەچەر هەر دوو نانە.

---

ئەگەر پێنج وئەگەر شەشین، هەموو خورامی دێزە ڕەشین.

---

ئەوەش، با لۆ حەماغای کۆیە بیت.

---

ئاو کە ڕژا کۆ نابیتەوە.

---

ئەم لادیوار،ئەولادیوار،تییدایە سەگێکی هار (زوبان)

---

ئەمڕۆ پێت دەرێز لەدەورت گەڕێم،
پێت هەرخلیسکا دەرێن لادە لێم.
(دەرێن: دەڵێن)

---

ئەوەی دەگوترێ لە دیوەخانان،
مەڕی هیچ پێغەمبەرێك تا ئێوارە نا لەوە ڕێنی.

---

ئاگر لە کوولەکەی تەڕدا دەکاتەوە.

---

ئەگەر بە تەمای سێبەری خڕنووکی بیت،
هەتاو دەتسوتێنی

---

ئەگەر خەو چا دەبوو

کەروێشك بە گا دەبوو

---

ئیمشـی: پـەمپی دەرمـان ڕشـاندن کـە لـە کۆڵـدەکرا لـە سـتیل دروسـتکرابوو، دەرمـانی ( : * *) کـە بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی مـەلاریا، لـە شەسـتەکان وحـەفتاکان بەکاردەهات.



# ب

برسکێ: دروستبوونی

ئەندامانی برسکە لە مەیدانی شەڕێ پارت

وردە وردە هەر دەشەڕ پەیدا بکات دەسەلات

(چوارینەکانی ڕۆستەم حەویزی ل٢٩١)

---

بافت: قوماشی چندراو (بافت لەبنەڕەت فارسییە)

چەند غەزەل بوو تازە بافتی کارگاهی موشتەری

تاجیر وگەوهەر متاع وشامی غوربەت تاجیری

(دیوانی حاجی قادری کۆیی)

---

بە لەش مێش. دەنگ گامێش

---

بڕك: لق وچڵ ودڵ بڕکە شووتی وبڕکە باینجان-شەتڵ یا بڕکە نۆك، بڕکە دار

---

بەشکم: بەڵکو. لەوانەیە، بەشکم وابێ

---

باڕێژە: باران بەبادە. باسریشك، باوبۆران، زریان

---

بەعەزم: بەهێز

بەعەزمی دیتنی ئامی ئێرەم هاتوینە سەر کانی

کەرەوشەین کەیف دەماغ ودڵ بەبۆنی زوڵفەینی ڕەیحانی

(شیعرێکی هاوبەشی ڕۆستەم حەوێزی و ئەحمەد دڵزار ل ٢٥)

---

بێ لەگەمە: بەراستی. بەجدی، بێلەسوعبەت

---

باداری: نەخۆشیە واتە ڕۆماتیزم.

---

بیژی: زۆڵ، ناپەسەند هەم بە منداڵێك دەڵێن کە باوکی دیارنەبێ کێیە

ئەی لەو هەتیمە بێژییەی

ئەوە بیژییەکە. و تۆ زۆر زانە

---

بەركوت: تا دەردەچێت، تاكو دەبێ بە گەنم پێش درونەوە ساڵی نان گرانی بەدەسكەئاون دەی كوتن بۆ خواردن

دڵداری شاعیر لە یادەوەرییەكانی دەڵێ (ئیدارە بكەن تا خەرمانی تازە)

(بەركوت) ئەبێ!. (دیوانی دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی كورد)

بۆنسۆ: بۆنی سوتان

---

بیور: تەور، ئامێری داربڕین، تڕی بە (نۆ) بیوران ناشكێ

---

باقۆ: هەنجیرەكە هەر سەوزە، پێ نەگەیوە

---

بەرانەكینێ: بەلام

---

بندۆك: خلت وخاڵی ڕۆنەكەرە

---

بۆنبا: واتە بۆنی كردووە و ناخورێ، واتە بۆگەن بووە

---

بەركور: خواردنی كەمێك بەر لەوەی شیوەكە بكوڵێ (بەركوڵ)

بەركوڵە: قابل للفلی بەركۆڵ ئەو نەختە چێشتەیە مرۆی برسی پێش كوڵانی تەواوی بەپەلە دەیخوات

---

بەفری شوباتێ وەك تڕی پورە فاتێ

---

بەسەروەرێ وبەپەروەرێ پێكیان هێنا تەنگەی كەرێ

باران بڕە: جۆرە پەپوولەیەكە شەوان دەدرەوشێتەوە ودەكوژێتەوە لە كۆتایی وەرزی باران پەیدا دەبێ، كە باران ئەما نامێنێ، زیاتر لە مانگی شەش دەبیندرێت، باڵدارێكی دەشتە لە شێوەی پەپولە، (گوڵە ئەستێرە)

---

بڕشت: واتە ئەناو بێ وپووچ نەبێ، واتە ناوك پڕ

لەسەر ئیشان كەسێ وریا ووڕشتە

خودی ئیشی خۆشیە سود وبڕشتە

(ڕۆستەم حەوێزی خەبات وبەرژەوەندی ل١٧٦)

---

بالیفی كوركن: ئەو سەرینەیە توركی نەرمی مریشكی تێ ئاخنراوە

---

بەلارووك: درەختێكی كێوی ئەرداره بەرەكەی زەرد وسوورە

یارەكەم دەڵێی بووكە

جوانی شاری كەركوكە



لانکێکی بۆ دەنێرە

دارەکەی بەلالووکە!

---

بزگوڕ: پارچە بەڕەی کۆن بەکارهاتوو، پارچە ڕایەخی شڕو دڕاو

---

بۆگە: ئەوگیا شێلراوەیە مەڕومالاَت نایخوا دەلێن بۆگە بووە.

دەبێت لە (بۆگەن)ەوە هات بێ- گیایەك کە بووبێتە پێخوست

---

برینگ: مەقەستی مەڕبڕینەوە

---

بان بانکە: جۆرە دەعبایەکی عەجوولە بانەوبان دەگەڕێ

---

بەرچیغ: ئەو دارانەی بۆ ڕاگرتنی چیغ بەکاردێن وەکو سیتکلێکی درێژن

---

چیغ بێبەرچیغ ڕاناوەستێ: مەترەق

حەیف نییە بە بەرچیغیان تێی هەلنەدەی

---

بەیار: بە زەویەك دەگوترێ کە ئاوی نەبێ، واتە پشتاو

---

بڕوش: بڕوێش

---

بەجرەجڕ: بەهەزارحالْ، زۆر بەزەحمەت

---

بەپای پیلان: بە هەموو شێوەیەك بۆ خەرجی بەکاردێت

بەپای پیلان شتیان بۆ دەنێرن یانی زۆر بە ئاسانی

بەپای پیلان، واتە بەزیادەوە وبێ دەست لێ گرتنەوە

(بیرەوەری وروانینەکانی مەلای گەورە)

ئەو ڕستەیە د.فوئاد مەعسوم لە کۆنگرەی یەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە سالْی ١٩٩٢بەکاری هێنا!

---

بەکاوەخۆ: واتە هیچ پەلەم نییە کەنگێ بوو

---

باشووکە: بالندەبەکە زۆر گەورە نییە، بەلاَم تیژڕەوە لە تیرەی دالاَش- مراد شاخە پیسکەیی (دیار- دلْپاك) لەسەر بلْندان نزیکەی باشووکە جۆگە لەمنالْ بۆ ئاش ئاشۆکە

---

بەختی هەندە ڕەشە: بچێتە سەر زێی سیروان ئیشکی دەکات (ئیشك واتە وشك)

کەسێکی ئیشکە: واتە ڕەزیلە

---

بەقلْتەکی قوونێ لێ یان دەرهێنام! واتە زۆر بە ئاسانی لێیان ستاندم

---

بارتەقای جاران: بەقەدەر جاران

دیسان بارتەقای جاران خەریك دەبنەوە بەکار

(ڕۆستەم حەویزی-بانك-ل٣٥)

بەبیلە: کۆرپەلە

باوەخوند: یەکەم سەفەری هاتنەوەی بووك بۆ ماڵی باوکی دوایی بە بووك چوون

باجەر: فرۆکەیەکی بۆمبا هاوێژی وێرانکەر بووە

بۆ سووکایەتیش بە جاشایەتی دەڵێن باجەر،

بەهەندێ کەسی دێیەکانیان دەگوت

باجەر، باجەری واچییە حسابی بۆ بکەن.

بەرماوە: پاشماوەی خواردن

باڕۆکە: مریشکی تازە پێگەیشتوو: نازناوە

بالۆرە: ئاوازێکی مەقام ئاساییە- ئاوازی جۆرە گۆتنێکە بەیتوبالۆرە

بەیت وبالۆرەش دەگوترێ

دەڵێن: ئەو بەیت وبالۆرە مابوو

مسعود محمد لە گەشتی ژیانم باسی راستی حەسەنی کوێخا خدری کانی کەند دەکات دەڵێ: (هەتا دنیا دنیا بێ، دەنگ نییە ونەبووە، وەکو دەنگی ئەستی (بالۆرەی)گوتبێ

بە پشیلەیان گۆ: گووت بەدەرمانە. گۆتی: دەچم لە سەروچاوی حەماموکێ دەرێم

بەتران: ئەوانەن قسە دەکەن وگلەییان هەیە چیان لە باردانییە. ئەم وشەیە عەرەبیە واتە ئاگای لە دنیا نییە

باڕۆ: ئەو شوێنەی بابیگرێتەوە. بەرەوبا

بنگرە: بەربا، ئەو بەفرەی کە لە شێوەی باران دەبارێ بە باوە.

بادەمچە: لە چەقەلە وردترە: شواشینك، واتە بادەمی بچووك. ئەو (چە)یە نیشانەی بچووك کردنەوەیە.

یەڵڵا با دەمچە

شرقەی دێ وەك دەمانچە

باول: سندوق، جۆرە سندووقێکی تەنەکەبوو لەجیاتی جانتای ئێستا بۆ سەفەر بەکار دەهات.

بارگین: بارگیر ئەسپی خەسیو، یەختە.

بارو بوو: یارمەتی وهاوکاری

بارن: باپێچ-بابەبەفرەوە

باژێر: بازار

باژەرە (باژەڵە) منداڵی تازە لەدایك بوو زگی با دەکات ودەگری، ژنی سەرە ولێزان ئەو بایەی لەزگی دەردەکەن تابجەسێتەوە وبەکوردی دەیترێنن.

بارتەقا: ئەوەندە. بەقەد، بەئەندازەی

بۆرژان: وەنەوز- خەوەکوتکە (تۆزێك چاوی دەچێتە خەو)

بەپان وپۆرین: بە سەڵتەنەتەوە

بارستیان: ئەستووریان

بر: هەندێك

بچێ: برِوا

باتمان: زۆر ئەستوور

بێڵێ: بهێڵێ

بەخری: بەکۆی

بەغەیرەز: جگە (بێجگە)

بێئامان: ترسناك

بەرزەپێ: گورج هەڵسان، یەك پێ هەڵسانەوە

بەرەکی باوە مزگەوتێ: واتە تۆش قسەکی بکە

بەست: شیوی بە بەرد وچەو وەك بەستی شەرغە هەیە لە کۆیە، ڕووباری وشك هەر لەزستان وبەهاران ئاوی پێدا دێ،بەستێ قائمقامی لەبیتوین (خڕ)یشی پێ دەڵێن...بۆ سەر لێ تێکدان دەڵێن: ئەوە چییە خرو درێژ؟

به چاوی (کێشکه) سەیری دەکەم: چاوی چۆن به هێز وتیژه زۆر شت دەبینێت.
(کێشکه: چۆلەکە)یه

گوتراوە: کێشکۆره سەمام بۆ بکه بەرتدەدەم، نانت دەدەم، ئاوت دەدەم (پاساری)

---

بێ مزەڕەت بی: سەلامەت بی، بێ زەرەربی، وەڵامی سەلامە! بێ وەی بی

---

بەتالع ومراد بی: به بەخت وبه ئاوات بگەی

---

بەڕادان: حازرایی-سپاردن بۆ جێبەجێکردن- بەکردن دان، بەرادانم داوە دەڵێ: مێزو کورسییەکم بەڕادان داوە. تۆ شتێك به کردن بدەی، واته بەڕادان دەدەی.

---

به قوزی دایکی عەزرەیەوە: ئیشێك ببێته فشه. (عەزرە)جوولەکه بووە فەراشی قایمقام بووە کۆیی شتەکیان بەدڵ نەبێ ئەو ڕستەیه بەکاری دەهێنن، یان دەڵێن هەقم چییه دایکی عەزرە کوڕی دەبێ یان کچ؟! (دایکی عەزرە ژنەجوولەکەیەك بوو قەدری گیراوە لای لێپرسراوان)

---

بڕمان: دەنکه هەناری وشکراوە لەناو سرکەنراودا دوای سرکەکەی لێ دەگیرێ، هێندە ترشه دەڵێی بڕمانه

---

بەرەکه: پێش ئەوەی ببێته ترێ. واته لەنێوان پەسیو (پەرسیله)وترێ، دوای پەسیره دەبێته بەرەکه ئەوجا ترێ

---

بۆره زەردە: تەماته بەر له گەیشتن. کارکه تەماته

---

برنجی پووشك: چەڵتووك

---

بێ موبالات: بێ گرنگی دان، گوێ پێ نەدان، کەمتەرخەمەمی

---

بیلامانێ: عەیب نەبێ، بیلاتەشبی

---

بەرانی تێبەردایه: بەران لەمەڕاز بەربوو بۆ تەلقیح، واته زاوزێ

---

به (با)و به بارانێ هەر له عومری بەفرێ کەم دەبێتەوە

---

بەروشڵدم: بەرو هەناو، تەنگەستوور، ورگ زل، ورگن

---

بەرەواژ: بەپێچەوانەوە

---

بەختەقوونه: بەبەخت، بەختدار

یەکێك شتێکی باشی بۆ بێ دەڵێن: بەختەقوونەی هەیە!

بیو: تری بچووک، ورده فس

برێشکه: گوڵەبەڕۆژەی برژاو، جاران گەنم و تۆ گندۆره (کاڵەك) وتۆ شووتی ونۆکیان لەسەر ناوی سێڵ دەبرژاند پێیان دەگوت برێشکه.

بزۆت: داری سەرئاگر–کۆلەوژ، سەلکە بزۆت

بلعات: ئیش وکردەوەی زیاتر بەخراپی بەکاردێت

بلعاتی قۆڕی هەیە

بلعاتی چاکی نییە

هەندێ بلعاتی خراپیشت هەیە، تەرکی بکە!

(شەوچەرە ل ٢١ تایەر حەوێزی)

دەزاندرێ کەژنەکەی بلعاتی خراپە

(شەوچەرە ل ٤١ تایەر حەوێزی)

بەرغەبابە: خوارچەناگە: گۆشتی ژێر چەناگە، غبغەبە

بەدەن: جەستە، لەش، قەلب .

بەندەن: دەشت ودەر،بەلاشەش دەگوترێت.

هەموو بەدەنم دێشێ، هەموو لەشم دێشێ. لە بەندەنان دەگەڕێم

بەهەزار حار: واتە دوای چەند وچونێکی زۆر

بەقا: باوەڕ، متمانە

ئیبراهیم سابیر لەگۆرانییەك دەڵێ"

بەقا مەکەن بە کچەتیوان

بێ دەرپێ لە ماڵێ دەرپەڕی: واتە پیاوی بێگانە بەبێ دەرپێ لەماڵەکە بێتەدەرێ.

بابم مەلەوانە ئەمن چی

بەڕیشی مەردانەت قەسەم. (لەموحتاجیان بە جوولەکە دەڵێن)

بێرایی: پێش دەرکە، بەرهەیوان

بەربووك: پێخەسوو: ئەو ژنەی لەگەڵ بووك دەبێ لە شەوی گواستنەوە

بانگۆره: فەرخە ئەسپێ

به حه‌له‌حه‌لا: به‌هه‌زار حاڵ، به‌حه‌لاٚ حه‌لاٚ ده‌رچووم. یان بۆ هاوار وده‌نگه ده‌نگ ( (ئای چ حه‌شروحه‌له‌لایه‌که)

---

بێر: خاکه‌ناس، بێڵ، هه‌روه‌ها بێری بۆ مه‌ڕ دۆشین

---

به‌ڕه‌شاوت بێ: تووك وجنێوه، به‌قولنژه‌قورتت بی.

---

به‌کوشتنچی بێ شوشتن چی: به گولله‌ی قه‌ده‌رێ بچی

---

به‌ختت وه‌ك حه‌مامێ ره‌ش بێت

---

به‌لاقی خێوییه‌وه

---

بتبینم به‌مراکان له کفنت بنێن

(مراك: که‌وچك)

---

به لۆکه‌ی ئاوت له زاری که‌ن

---

بزرکان: تێك چوونی شیر وئاره‌ق

ره‌نگ زه‌رد بوون

ئه‌و هه‌واڵه‌ی زانی ره‌نگی بزرکا وگۆڕاو ره‌نگی زه‌رد بوو- هه‌روه‌ها هه‌ڵبزرکا

---

بووکی سارێ ده‌ریده‌که‌ن له‌مارێ بێ ئاوێنه وبێ کلدان:

(مه‌لای گه‌وره)

ده‌بینی بووکی ساڵێ ده‌ریده‌که‌ن له‌ماڵێ

به‌تای سۆل وبه‌رماڵێ بێ ئاوێنه وبێ کلدان

(مه‌لای گه‌وره‌ی کۆیه)

---

بژ: یاڵی ئه‌سپ، مووی سه‌ر ملی ئه‌سپ،ژنانیش به‌کاری دێنن: سه‌ر وبژی تێك چووه.

---

بناوان: ١. ئه‌و کابانه‌ی خواردن ئاماده ده‌کات کاری ناوماڵ ڕاده‌په‌ڕێنێ.

٢.هه‌ڵبه‌ستنی سه‌رچاوه وجۆگه‌و کانیاو له‌بناوانه‌وه ته‌واوه!

---

به‌فیفی به‌رائه‌تێ: واته گوناهی تێدانییه له (براوه)ی عه‌ره‌بییه‌وه هاتووه

---

به‌فرانگ: ساڵی به‌فراوی! ساڵی به به‌فر

---

بمکوژه،به‌س حه‌یام مه‌به.

---

بوو به کێچ چووه کەوری یەوە

(کەور: کەوڵ)

بووک نیەتی نانی شەوێ

ئەنگوستیلەی دەستانی دەوێ

بوو بە مانگی بز هەوری

بیگرە وبەری مەدە، خۆیەتی هەوە

بێری پڕ قوڕ بەدەست خەرکیەوە سووکە

(بێر: بێڵ) (خەرك: خەڵك)

باوی: بادەم، جوالە: لە دۆڵی سماقوڵی چیایەك هەیە بە ناوی بەنە باوی دەبێ باوی زۆری لێ بووبێ

بە گوللەی گەرمەوە بی

بەختت ڕەش بێ

بەڕانی شکاوی بێنیتەوە

بەجەرگ سووتاوی بتانبینم

بتبینم مجرۆ بی. واتە کوێربی وچاوت هیچ نەبینێ (مزمەعیل)

بە ئاگری غەزەبێوە بسوتێی.

بە کۆری دانیشی (کۆر: کوێر)

بیژۆك: پووچ، پووکاو، ئەو ئامێرەی کەنگری پێ هەڵدەکەنن (پیشەقان)

باراشی لە هەموو ئاشێ دەگەڕێ

بەپیری سەران. بوومە گاوانی گورگ وکەران

بەناوی بن سەرە دێ بن

ببیە سیرمە چقالتە، چەرمە چەقاڵتە

بەفەتارەت: فەوتان، کێشەیەکی قووڵ، سەرم بە فەتارەت دەدا (فڕی فڕی قەل فڕی ل7 مەلای گەورە)

بێ قوونە بان: پشتی نییە، ئیحتیاتی وەرنەگرتووە

بابۆنی: ئەو منداڵەی بابی خۆش دەوێ بەپێچەوانەی داکۆنی دایکی خۆشتر دەوێ

بەسەد دەرزیان گاسنەکی تێ نابێ

بەزیندی نەبوو کراسێ لەبەری، بەمردن جانگ لە پشت سەری

بەشم، دەست بدە لە گونی ڕەشم

بە حەوت ساران کوڕەك، ئەویش بۆرە جرەك، بەحەوت ساران زگەك بوو ئەویش فرچە کچەك بوو

بەخێشەخێش لێم هاتەپێش

بەسەد قول وەڵلا ڕاوەستایە

بەربوت: ئامێرێکی میوزیك بووە وەکو عوود.

مستەفایە تەخەللوسی (کوردی) غەزەلی کردە بەربوتی کوردی

حاجی قادری کۆیی ل ٢١٩

بلا: با، یان، وا (غەرەز دەستنووسی تۆیە نا عیلاجی)

(بلا) مەعنای نەبێ وەك بەیتی حاجی

(حاجی قادری کۆیی ل٢٤٨)

بیدەبەرێ: دەچێتە سەرێ، لەعەقڵیدا چویتە دەرێ!. واتە گوێی مەدەرێ

بەکەرێ ناوێرێ دەچێتە زگ کورتانی

بە بەردێکی دوو کێشکەی کوشت

بەرخ هەر لە کۆزیدا نابێ، کاریلە هەر لەبنی سەوەدا نابێ

بەگۆرم بڕی، دێر دەرچوو

(گۆل) سەگی نێر (دێل) سەگی مێ

بەگۆڕم گوێ بڕی دێر دەرچوو توتکە سەگ -گوجیلەسەگ گوێی دەبڕێ

بۆ شوانی خاکەسار، چ گورگ بێ چ سوار

گورك مەڕی بردووە سوارێك لێی سەندۆتەوە نەیداوەتەوە، دەست شوانەکە، بۆ ئەوە گوتراوە

بەین وبەست: پەیوەندی خۆشەویستی

**بێ نووکه نووکی+شاد وبار سووکی.**

**بێ وەستا دەستی پێکرد+بۆیە زوو پشتی تێکرد.**

**بێ هیوا خۆی دەکوژێ+هیوادار ژین دەمژێ.**

**بێ، ئەم کەرە لەو قوڕاوە دەرێنە**

**بێدەنگ، مێش ناچێتە دەمی.**

**بێستون عەشق کردی، ناوبانگەکەی فەرهاد بردی.**

**بێکار بچێ، قەدری دەچێ.**

**بێگانە بکەی بە خزم+ پلە وپایەت دەبێ نزم.**

**بێگانەت کرد بە برا+داری بە ڕۆحتا درا.**

**برسی خودای، بە کەس تێر نابی**

**باغی بێ پەرژین زینەتی نیە،**

**کەنیشک بێ باوان حورمەتی نیە**

**(کەنیشک: کچ)**

**باش هەری هێنا، قوڕی بنی دەرهینا.**

**بە داری هەرچوو، چەرمی قوونی لە بیر چوو.**

**بە عەبا دەیخوات، بە عەسا دەڕوات.**

**برنج ئالیکی کەرێ نیە.**

**برووشە، کابان تووشە.**

**برنجە، کابان قنجە.**

**بزن لۆ بێرە، گاجووت لۆ گێرە**

**(لۆ: بۆ)**

**بێعار، دەریای دا، تەڕ نەبوو**

**بە هەزار جەردە، لاتێك ڕووت ناکەنەوە.**

**برێشکە دەخوا و بە سابوون دەست دەشوا. (برێشکە: گوڵەبەڕۆژە)**

**بار لە ڕێوە، یا لە جێوە.**

---

**باری لەسەر پشتی کەرێیە و نۆبەی ئاشێیە،**

**زووکە مەلا کوڕەکەم فێری خوێندن کە.**

**باغەوانی، باشترە لە چاوەڕوانی.**

---

**بەمراکی کۆی دەکاتەوە، بە شەن پەرتی دەکا.** (مراك: کەوچك)

---

**برسی، سەربەست نیە.**

---

**بنوو وەستای نەجار،**

**خوا یەکە و دەرگای هەزار.**

---

**بێستان بێ سەرە کەر نابێ.**

---

**بن کلکی کەرەکەی ماچ دەکا.**

---

**بە توندو تیژی کار ناچێتە سەر،**

**بەزمانی خۆش مار لە کون دێتە دەر.**

---

**بە گژ دار و بەردا دەچێ.**

---

**بەداری سەماوە تەوەت دەکەم**

---

**بەدمەزەب: لامەزەو، بێ مەزەب.**

---

**بێدەنگی چاکترین زێڕە لۆ ئافرەت.**

---

**بێزی نایە بابیشی بدوێنێ.**

---

**بەبۆنی شەراب مەستە.**

---

**بە فوویەك دادەگیرسێت وبەفوویەکیش دەکوژێتەوە.**

---

**بێ بڕ لە زێ مەدە**

---

**بەگۆڕی بابت مەنازە، مووچەت نان وپیازە.**

---

**بەسەر دۆست، بە (در)کۆست.**

**(در: دڵ)**

---

**بەرد بشکێنە، درۆ مەنوێنە.**

---

**بەبۆنەی دڕکەوە گوریش سزا دەدرێ.**

---

بە لای مشکدا بڕوا، کلکی دەقرتێنێ.

بەبستێ، پێشی هەتاو ناگیرێ.

بەری ڕۆژ بە کوتەپەڕۆ ناگیرێ.

بەچکە گەدا، مەخەرە تەما، بەچڵێ کەما، دێتە سەما.

بدە لە هەرد، مەدە لە پردی نامەرد.

بیانخەیتە مەنجەڕێك، پێکەوە ناکوڕێن

(مەنجەر: مەنجەڵ، ناکوڕێن: ناکوڵێن)

بەهەور وبەسایەقە، گور هەر گوری لایەقە. (گور: گوڵ)

بزن نەیخورێ بن قیچکەی ڕانی، چی داوە بەسەر نانی شوانی.

بچۆ شارێك کەس نەتناسێ، تاریف خۆت کە پڕ کەوا وکراسێ.

برا بوو بە برازا، کارلەکار ترازا.

بەرا لە شەرواری شڕم، کوڕی کەس نابێ بە کوڕم.

(بەرا: بەڵا، شەروار: شەڕواڵ)

بەسمانە، کوڕە کەچەڵ کەسمانە.

بەسمانە، نان ولەتێ بەشمانە.

بەچکە گەدا، مەخەرە تەما، بەچڵێ کەما، دێتە سەما.

با بەردێکی لەسەر دانێین.

با لە بەینی خۆماندا بێ.

بازاڕ مشك نەیخواردیە.

بەڕۆژ دەگەڕێ بەکراسی کەتان، بەشەو دەچێتە بن کورتان.

بەشەو دەنوێ بەجلی گایە، بەڕۆژیش دەرێی ئاغایە.

باغ لۆ باغەوان، پەز لۆ پەزەوان

بزن لۆ بێرە، گاجووت لۆ گێرە

بەقوونەخشکە، بەغدا ناگیرێ.

به مشەمش، خۆی کردە خاوەن بەش.

بەهەڵەداوان، کەوتە داوان.

بەپێوەوە دەچێتە بەهەشتێ.

بۆرە نەبێ وبازەبێ. کلکی بەئەندازەبێ.

بۆرە نەبێ وبازەبێ. یەکێ تەڕ وتازەبێ.

بەسەرم هات، باوەڕم نەهات.

بزن تانە لە مەڕ دەدات.

بووکەکەی پەنا دیواری، ڕۆژ هەموو ڕۆژ بێکاری، بەشو ناومار دەماری.

بەسەرما نووستووی. بەگەرما هەستی.

بە مراکی کۆی دەکاتەوە، بەشەنە پەرتی دەکا.

بی نیازی وسەر فرازی.

با هەر بوەڕێ.

باری هێلکان نابزیوی.

باراشێکی دیکە ناخوا.

بە نارەنار، بەنووکەنووک، قۆجەدەهۆڵ خۆی کرد بە بووک.

بێ بازاڕییە.

باغی بێ پەرژین قیمەتی نییە، کچ بەبێ برا حورمەتی نییە.

باڵات بە وێنەی دارگوێز لە باخان، سنگەکەت سپی بەفری سەرشاخان.

ببێ بە ئاگر، خۆی دەسووتێنێ.

بڕوانە ڕەنگی زەردم. جا بپرسە لەدەردم.

بپرسە، مەترسە

بڕۆ بێگار، مەنیشە بێکار.

بێ ئیشی ونەخۆشی.

بدە لە هەرد، مەدە لە پردی نامەرد.

بده له تهختە، حيزيش به بهختە

برا شەڕ دەكا، قەڵتەبان باوەڕ نەكا.

بەگانی دا.

بەگورگان خواردی دا.

برای داك جیاوازە، وەك ماری بێ ئیجازە.

(داك: دایك)

برسی مەنێرە لۆ نان كڕین.

برنجە، كابان قنجە.

برنجی بێ ڕەنج خۆشە.

بەقەد جوویەكی لێ پاڕاینەوە

بزن تارەت هەرناگرێ.

بزن تاشەوانە ومەڕیش مەلەوان.

براو براو، سەگی گراو.

بێ سەروشوون چوو.

بم نوێنن بە جلی تانجی. هەر پێم بڵێن ژنی حاجی.

بوویتە پەندی عالەمێ.

بوویتە گورگی هار.

بوویتە مندار بازاڕی.

بوو بە قترەیەك ئاو، عەرز قووتی دا.

بووە بە چەقەنەی ئاشی.

بووە بە داری پەلك.

بەتفی پێكەوە نووساندیە.

بووە بە دەرمانی چاوان.

بە ئاودا چوو، بەعەرزیدا ڕۆیشتە خوارێ.

بەڕۆژە ڕۆژە سارمان بردە سەر، ئەوا بوار هات قوونمان کەوتە دەر.

بەوڕۆ وسبەی ساری بردە سەر.

بە بۆنی دەمیا دیارە.

بە بۆنی شەراب مەستە.

بێ ئەو پەنجە ناکا بە ئاودا.

بەبێ ڕێ مەڕۆ، هەرچەند قەدبڕ بێت.

بەچرای ڕۆن گەرچەکەوە بەدوایدا دەگەڕێ.

بەپەلەپیتکە خۆی دەتەکێنێ.

بەکێری کەرمەوە.

بە گونی بارگینم.

بەلبادی سەری دەبڕێ.

بەپێراوەوە دەچێتە بەهەشتێ.

بە تڕ گۆزە دەشکێنێ.

بەتڕان، مەتڕانی گێژکرد.

بە تۆرەتۆرە، هاتەوە سەر گونە بۆرە.

بەتەقەی تفەنگیش. دەرناکەوێ.

بەتەمای نیسکێ، مەگەرێ لەگیسکێ.

بەدەم هار، بەلەش بیمار.

بەزارێك دەخۆن وبەقوونێك دەڕین.

بخۆرەوە فنجانەکی ژەهری، مەخۆرەوە فنجانەکی قەهری.

بێرە مشتی، بپەڕە پشتی.

بەزەڕەی کەر، بەهار نایە.

بە گوڵێنگی باجی نازێ، دری تەڕەی دەخوازێ.

(دری: دڵی)

بڕوشه، کابان تووشه.

به قوربانی بەشی خوای بم.

بەقەد تووکی سەری قەرزداره.

بەقەد تووڕێکی تێ ناگەی.

براگەوره به وگووی زیادش مەخۆ.

بێعاران، تێیان کوتن به داران. هەر دەچنەوه جێی جاران.

بێوەژن کۆشی دەکات.

بەرایی کۆچی چێر بێ، زەحمەته ئاخری خێر بێ.

بەقسان ناچێ.

بیست ویەکی لەکانوونێ، کەپوو پیستره له قوونێ.

بچۆ بن بارێك، نەتترێنێ.

بێ دەم وپله.

بەسمانه، کوڕه کەچەر کەسمانه.

بەوەی نییه، بەهاته.

بەیەکێ برێ، نەتناسێ.

بەخت ببێ، تەختیش هەیه.

بەرماوەی هەموو کەسه.

بەرز دەفڕێ، دوایی دەترێ.

باران نیشانەی بایه، نەخۆشی نیشانەی تایه.

بەدبەخت، مەکه ئیشی بێ وەخت.

بەراز تا بۆز نەبێ، زەڕی ناکات.

بەڕوو به برژاوی، بەڕوو به کوراوی.

بەکەریان گۆت: شاییه، گۆتی: لۆ من یا دارکێشانه یا ئاو کێشان.

بەپۆپەی کێرمەوە.

به فوویەك گەرم دەبێ، بەفوویەك سارد دەبێتەوە.

بەگڕدار وبەردا دەچی.

بەمنداری گایتم.

بەمشت ومڕ نابێتە بڕ.

بەگورگیان گۆت: ببە به شوان، گۆتی: بەو شەرتەی کەری لەگەڕ نەبی

بەکفتە دەڵێ: فڵتە.

بەرێ هەیە، بەرا هەیە.

بەزیادم نەکرد

بەزیاد نەبی

بەسار بچو وسوڵتان به، بەمانگ بچو ومیوان به.

بەسەد دەرزی، سووژنێکی تێدا نابی.

بەسەر بابیشەوە ناچێ.

بابی خۆی ناناسێ.

بەسەگیان وت: شێن خۆشە یا شایی؟ وتی: هەر جێ هێسکی لێ بێ.

بەقوربانی بەشی خوای بم.

به قوربانی کوری سێو لەباغەڵ بم.

بەقوڕم گرت

بەقوڕ گیرێ.

بەقسە هیچی نەهێشتیتەوە.

بووە به مەقەست، دەستی بۆ بەری دەم دادەچەقێنێ.

بووە به پایزەبرا.

بەهەور وبەسایەقە، گور هەر گوری لایەقە.

بەرز دەفرێ. پێیدا دەترێ.

بەری ئاسمانی لێ تاریك بووە.

بەهێلکەیەك، حەوت میوان بەڕێ دەکات

بەتەمای سێبەری خڕنووکی بێت، هەتاو دەتسووتێنێ.

بەنی ئادەم تەیری بێ بارە.

بای زگی خۆی خاری دەکاتەوە.

بەرد هاتە جواب، ئەو نەهاتە، جواب

بەهۆی نەوسێ، کەوتە حەوزێ.

بەختەکەی من ئەوەندە لارە، ترۆزی دەچێنم کالیارە.

بچیە سەر دارێ، دەکەویە خوارێ.

بەگم بەگم، جلی گام لە کۆڵ، حار حاری سەگم.

بە کەرەکەرە دنیای خواردیە.

بەخێر نەیەیتەوە لۆ ئیشی کردت.

بەدەوری پیروپێشی،بزن سواری گامێشی

بینینی لەبەری تا کەی،لەبەری کەی نابینی

بەفری مانگی شەباتێ

وەك تری پووره فاتێ

بە تۆره تۆره، هاتە سەر گونە بۆره

بە ئاوی سەره ندی.

بدە لە تەختە، حیزیش بە بەختە.

بایەکە و بەلای گونیدا دەڕوا.

بەپارە هەمو گرفت دەکرێ چارە.



# پ

پۆتەراك: سەر جاو، سەروسیما، سەروگوێلاك، سەروفەسال

عەمری ئەو سەرو پۆتەراکە نەمینێ.

پەپوو: ئەما زیاتر بۆ منداڵان بەکاردێت، جارجار بۆ گەورانیش بۆ فشە وگاڵتە بەکاردێت

پاشەبەرە: دوا منداڵ، پێچەوانەی نۆبەرە، هەروەها بۆ سەوزە ومیوەش بەکاردێ (گۆچانی پیری

پاشەبەرە، حەبابەرە، دواین منداڵ، یان میوە وسەوزە یا شەبەرە تاجی سەرە

پاراخ: بێچووی گامێش لە کۆیە نازناوێکە، پالاخ

پرێسکە: بوخچەی بچوك

پزی: جێ دۆخین، پزوو

پێخوست: شوێن پێ، جێ پێ، بەتایبەتی بۆ شوێنێك خەڵك بەسەریدا ڕۆیشتبێ

پێ خواس: پێ پەتی، پاپەتی

پەڕەکەر: شی کردنەوەی خوری ولۆکە، پیشەیەکە، نازناوی هەیە لە کۆیە حاجی رەئوفی پەرەکەر هەللاج

پۆخ: ئەو چڵە دارەی کە دواتر دەپشکوێ دەبێ بەگەڵاوگوڵ-چووزەرە

پرمە: دەنگێکە بۆ وڵاخ بەکاردێت، بەڵام دەڵێت لە پرمەی پێ کەنینی دا.

پاپووچ: پێڵاوێکی ژنانەیە پێ دەچێت لە (پاپۆش)ەوە هاتبێت

پیل: پەل، قۆڵ

پیلی گرت وبردی

پەنگر: پشکو هەروەها (سکڵ)و (پۆلوو)شی پێ دەڵێن

پێغەمبەر دەناسی، خوای ناناسی

پادار بگرە بێ پێ هی خۆمانە

پێی گەورە نەگبەتە
سەری گەورە دەوڵەتە

پرس بە ژن بکە، بەس بەقسەی مەکە

پرسیان خەرکی کێی! گۆتی جارێ ژنم نەهینایە
کێی-کوێ
گۆتی-وتی
نەهینایە-نەهێناوە

پرسین عەیب نییە، نەزانین عەیبە

پشیلە گوو دەکات، چاوی لە عالەمێ زەق دەکاتەوە

پشیلەی ڕەش جندۆکەیە

پشیلە دەموچاوی بشوات، مێوان دێت.

پشیلە لە خەوندا نەوسە.

پارە بخە قوونی مردی، دەیخاتە جووڵەجووڵ

پارە بدە ومەلا لە مزگەوت دەرکە

پارە دەبێتەوە، دۆست نابێتەوە

پارە دیندەر ودینبەرە

پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش.

پیاوی ژن جوان نوێژی دروست نییە، ئەگەر ژنەکە مەیلی بداتێ، ئاخیری دەیباتێ.

پیاو لەگەوادی بترسێ، ژن ناهێنێ.

پیاو بەبێ کەسی هەژار دەبێ
ژن کەسی نەبێ هار دەبێ

پیاو چەقووە، ژن هەسان

پیاوی ژن جوان هەمیشە کزە

خشەی مشك دێ وا دەزانێ دزە

پارووی گەورە هەم دەم دەدڕێ هەم قوون

پەنجەی دەستان لێم هەرستان، پەنجەی دەستان هەمو وەکی یەك نییە

پاشی: دوایی

پـووش بـرنج: بروانـه (بـرنج پـووش)، چـەڵتووك، جنێویشـه بـۆ سـووك وچـرۆکی بەکاردێت،هەند سووکە دەڵێی (پووش برنج)ە. پیاو سووك دەبێ دەبێتە پووش برنج (شەوچەرە ل١٥) بەڵمە برنجیشی پێ دەڵێن

جا (پووش برنجی وا چییە.

پووش برنج: سووك وبێ نرخ

رێ نادەنە چ پارتێ لەناو کورد دا کۆتێ پنج

نۆکەرێکی وەك شتلی بۆ دەچێنێ لەناو کونج

هەر تۆ کە هەڵدەستی دادەنێ پارتێکی قنج

بەشەڕی براکوژی کوردیان کردووە پووش برنج

(دیوانی شیعر: ڕۆستەم حەوێزی)

پشك پشك: پارچە پارچە

پنتك پنتك: خاڵ خاڵ

پەسیو: هەڵامەت. پەتاوپەسیو

پەناوپێچ: حەشارگە

پەکوو: بۆسەرسوڕمان بەکاردێت

پەلك: گەڵا

پێچك: لاق. پێچك چارە بەهەژمارە

هەی سەرو پێچکی بە...داکی (واتە دایکی)

پیاوی خۆش باوەڕ هێندە فەقیرە

بەدەست ژنەوە هەردەم ئەسیرە

پێ لەقە: شەق

پڕتەو: تیشك، ڕووناكی، ناوی كچانە لە كۆیە

شوعاع وشەعشەعەی میهری. ئەشیعە ومیشعەلی بەدری

لەسایەی پڕتەوی ڕووتە بە قوربان نووری یا ناری

(حاجی قادری كۆیی-ل١٧٥

---

پێت لە دوو خۆت ڕادەكێشی

---

پەلەكە هەستەوە، بازەكە بەستەوە، هەرسێك خوستەوە، لە یاری هەلوكێن دەگوترا

---

پووشكەی لە چاوی خەركی دەبینی، بەس كاریتەی لە چاوی خۆی نابینی.

---

پووشكەی بەقوونیەوە ناچی. پووشكە: پووش

---

پێخۆر: هەرشتێك كە لەگەڵ نان بخورێ

---

پڕ بە زگی خۆتان نەخۆن

---

پەلە پروزەت پێكەوی

---

پلك: پور، میمك

---

پامووره: وەك خڕخاڵە لە زەنگیانەی ڕەش وشین دەهوندریتەوە ودەكرێتە پێ

---

پڕتاو: لەناكاو

---

پیسە خوشكۆری: لەكەلایانێ بەكاردەهات بەسەر بزۆكەی دەرزی كەلایەكە.

---

پەلەفیڕە: ڕەوانی-ئیسهال، زگچوو

دەڵێی پەلەفیڕەیەتی، كابرایەك هەبوو لە كۆیە بەناوی پەلەفیڕە لە زەمانی گرانی نانی دەفڕاند هەزار شەقیان لێ دابا ئەو نانەی هەر دەخوارد

---

پەمپ پیخ: كۆڵمە بەرز و خر وگووپن، لە كۆیە فاتە پەمپ پیخ هەبووە گووپی جوان بووە

---

پەلەپروزە: بەعەجەلە، بەخێرایی

---

پەلاپیتكە: شوێنی پەنجەپێوەنانی تەقەكردن

پەلاپیتكەی لێ دەی شەق دەبا

---

پەلیكانێ: گەمەیەكە بەدار دەكرێ، هەلووكێن

---

پیرە سەی عەمەل گوجیلە

---

پیرە کەری عەقر جاشکانی

---

پیاو جۆگەیە-ژن بناوان

---

پێوەدان لە گیزەگیز خۆشترە

---

پردی دزونامەرد زوو دەڕووخێ

---

پوشتە: سووك وچرووك

هەتا ئێستا کەسێك خواردویەتی دنیا

زبان لوسە ئەوەی تەڕلوس وپوشتە

(ڕۆستەم حەوێزی-خەبات وبەژەوەندی ل١٧٦)

---

پێست دەبێ بە پۆست، دوژمن نابێتە دۆست

---

پردی نامەرد ل مەپەڕەوە ئەگەر ئاویش بتبا

---

پیاوی سەبرۆکە، بارانی نەرمۆکە

---

پیاوەتی، بە تەواوەتی

---

پس پسۆك: پچرپچر: دەزویەك زوو زوو بچڕێ

مۆری دینی پێوە بێ هەرکەسێ ترسنۆکە

کەسێ نانی بداتێ پێی ناوەڕێ کسۆکە

تەوجیهو زەبتی نەبێ هەر ئەندامێکی پارتی

داوی پەیوەندی حیزبی باریك وپس پسۆکە

(دیوانە شیعری ڕۆستەم حەوێزی ل٢٧١)

---

پیاوی یەك چاو، لەناو کۆران (کوێران) پاشایە.

---

پیاوێك کیری نەبوو دەیگۆت جۆتە گونەکی باشم هەیە

---

پێروو ئاوا بوو، نیسك ساوا بوو واتە وەختی نیسك چاندنە

---

پووش وپەراش: واتا گیا وگۆڵی وشك

---

پەلکوپار: پەلکی میوە ودار

---

پۆشتە وپەرداغ: جلوبەرگی باش وڕێك وپێکە

---

پانی نەبن بەخوونە

هەمووی مەکر وجادوونە

پڕی زگم قسەیە، سەری زمانم بڤەیە

پیاو بەقسە دەبەسترێتەوە، کەر بە پەتك

پەشمە: خەوش وعەیب-پەردە

پەشمە (حاجی)وەرە وەکو جاران

بێرەوە سەر حێکایەتی کوردان

(حاجی قادری کۆیی شارەزا ومیران ل٢١٨- سەردار حەمید میران-کەریم شارەزا)

پیم پام پۆس: گەمەیەکە هی منداڵان. فیکڵانکۆ، زیاتر کچان ئەو یارییەیان دەکرد

پەپەجانە: پێڵاوی منداڵانە

پەپۆکە: خۆخڕکردنەوەی مار

پەسیسە: خواردنێکە، وەك پێویست نەبووبێ، نانێکە کە زۆر تەڕکرابێ

پەپۆکە: ئەو نانەیە وەك پیویست نەبۆتە نان

پیرەڕۆك: چورچ، جۆرە نەخۆشیەکە لەلاق دەردەکەوێ، پیرەڕۆك جاران کە ژن کوڵی دەکرد (جلی دەشووشت) پەنجەکانی وەك پێستی پیران لێ دەهات، یان لە حەمام کە زۆر خۆی دەشووشت دەستی پیرەڕۆك دەبوو.

پەلەپفە: جۆرە نانێکە

پێی لەسەر هێلکەی نامێ، دادەنێ. هێند بە نازە

پرچت بەبڕین چی: تووکە ومەیلەو جنێوە

پیشەقان: کەنگر وکاردووی پێ هەڵدەکەنێ ئاسنێکی دەم پانە کلکێکی داری هەیە

پاری بە عەنباری گەنمی داوە، خەمی هیچ نییە پەکی بەهیچ ناکەوێ

پۆپیتە: سەرەکەی، پۆپنەی کەڵەشێر،پۆپەی کیر

وەختی پەیغامت خرووسێکی هەزار پۆپەم هەبوو

دایە بەر شەق قاصیدێ وابێ جەوابی وادەبێ

(حاجی قادری کۆیی)

(خرووسێك: فارسیە واتە کەڵەباب. کەڵەشێر)

**پێتەرازوو:** سەبەتەکە لە شووڵی دار بی دروستکراوە لە قووڵینە بچووکترە بۆ ترێ و میوە بەکاردێت

**پیاح:** نیشانەی سەرسوڕمان

**پیرەژن تۆر:** کەڵەشێری ناوەخت بقوقێنێ

**پەردەپلاو:** جۆرێکە لە پلاو برنج

**پاك بە،** بێ باك بە

**پت: پەنجە:** پتی پێوەنێ واتە پەنجەیەکی پێوەنێ

**پەلارە** کۆری ڕای دەوەشێنێ

**پاقر:** دژی پاکژی، پیس وپۆخڵ

**پونگاو:** خڕبوونەوەی ئاو لە جێ یەك، مانەوەی ئاو لە جێیەك

**پایزە هەوار:** شوێنی هەواری پایزانە

**پەی بێ:** بېڕێتەوە

بەسە ئەی خامە با ئەم باسە پەی بێ

وەرە سەر باسەکی فائیدەی بێ

(حاجی قادری کۆیی)

**پامووره** جوانێ بابچینە سەیرانێ (فۆلکلۆر)

**پێك: بەشدار.** پێکی گەمەی بکەن واتە بەشداری یارییەکەی بکەن

**پێك:** لەخواردنەوەی مەی بەکاردێت (ئەو پێکە بخۆوە)

**پاسار:** پەنا. نوا

ئەی چۆلەکەی پاساری

پتکە گووی وا چییە حسابی لۆ بکەم

**پەرگە:** ئەوسەری–ئەوبەر

سەرپەگ

**پیری موغان:** ڕابەری گەورەی ئاینی زەردەشتی، پیری مەیخانە، ڕێبەری روحی

چ ئارامم نەما یاران دەڵێن پیری موغان ڕۆیی

لەلێوم مەصیبەتی یاران کە شاهی خەسرەوان ڕۆیی

(دیوانی عاسم ل ۱۹۱ لێکۆڵینەوەی ساغکردنەوەی د.کەمال مەعروف)

---

پێکردن: هاوبەش وبەشداری کردن

پێکم ناکەن لەگەمان

---

پڕ دەبێتەوە جێی خەنجەران

پڕ نابێتەوە جێی کەسەران

---

پیری، شتی کۆنەی دەکەوتە بیری

---

پیری ونەخۆشی ریشی کردم زەرد

ئەویارەی دەمبرد بن بەرد وبن بەرد

دەکۆخم دەڵێ قوزەڵقورت ودەرد

---

پێنج فەرزە (بیسمیلای)تێدا نییە

(بانگ)ە

---

پەڕەتیر: هیچ شتێک

پەڕە تیرەکم بۆ دەرنەچوو

---

پیتیۆرم، سەلکە تیتۆرم

---

پێشدان: جاران

جێیەک هەیە پێی دەڵێن ئەسکی کۆیە (گۆیە)شار پێشدان لەوێ بووە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل۱۰)

---

پاشدان: دوایی-پاشان

پاشدان تاوەکی خۆش شاییان دەکرد، ئەوجا پاش عەمرێ بەرەو ماڵ دەبوونەوە!

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل١٦)

---

پیت وپارۆز

سار بوو ئالۆز (سار-ساڵ)

---

پاشای بەبە، پارەی زۆرە زووی دەبا، دەی دەمە ڕەواندزیان، دانیشتن لەسەر کورسیان، پتر میری عەباسیان کچیان بە منداڵی هەڵ دەپەڕاند بەخۆشیەوە ئەوانەیان بۆ دەگوت.

---

(مێژووی شاری کۆیە - نەجیبە خانی جەلیزادەرە ل١١١)

---

پێنج بەردۆك: گەمەیەکی منداڵانەیە لە کۆیە دەکرا

---

پلکە شەمێ: ژنێك بوو تورکی دەزانی زەمانی حەمەغای کۆیە لە دوویان دەنارد (وەرگێڕ)یان بوو.

---

پت پتانێ: گەمەیەکی کوڕ وکچانەیە لە کۆیە

---

پاکی: هەموو

---

پیاوەتی بەئاوی حەمامەوە دەکات

---

پارەلێدان: ئیختلاس

(هۆشیاری یاسایی -فوئاد تاهیر سادق ل٦٥)

---

پێ بژاردن: تغریم

(هۆشیاری یاسایی -فوئاد تاهیر سادق ل ٧٩)

---

پەنجەت بخە ناو دەمی. بزانە دەیگەزی

---

پێت دەوەستم، راناوەستم

---

پێی گەورە نیگبەتە. سەری گەورە دەوڵەتە

---

پەشیمان بوونەوە. لەهەڵە چاکترە

---

پرست پێ دەکەم، بەقسەت ناکەم

---

پشیلەی مڕان دونگی گەورە دەفڕێنێ

---

پیاو ئەو پیاوەیە پیاوەتی لەبیرنەچی

---

پیاو چاوی دەرچێ. ناوی دەرنەچێ

---

پیاو بەختی نەبێ. لەسەر ئەسپیش مار پێوەی دەدا

---

پیاو بە سمێرەوە جوانە، ژن بەپرچەوە

سمێر: سمێڵ

---

پیاوی ژیر بە تیغ کەس ناکوژێ، بەڵام بە قسە وپەندی زێڕین دوژمن دەکوژێ

---

پیاوی کەر نابتە دۆست

---

پیاو پیاو بێ خۆی نادۆڕێنێ

---

پیاوی فەقیر کیری لەناوەڕاستەوە ڕەپ دەبێ

پیاوی قەرزار، تیژ دەڕوا لەبازار

پیاو کە لە ژنەکەی ترسا، داخوازی کچی لەداکی بکە

پیاوی نەگبەت (سە)ش پێی ناوەڕێ (سە: سەگ)

پێشکەوتەی دواکەوتە

پێڵاوم دڕا، هیچم پێ نەبڕا

پێخواس خۆشترە لە پێڵاوی تەنگ
ماڵی چۆڵ خۆشترە لەماڵی پڕ جەنگ

پایزەبرا چۆنی ئەوە لەکێندەری خۆت بزرکردییە

پیس پیسۆك: مارمێلکە

پنتك: بچووك

پتك: بچووك

پەشمەك: پۆپەشمینە

پیرخەنیلە: ساواری ورد

پەشتەمار: خاولی

پیرەقۆتر: جنێوە

پەسار: شوێنی خۆشاردنەوە
زۆر شوێنی وەك دوبزی چۆڵ دەکرێ لە کوردی
ناشزاندرێ چەند ماڵی لە ئەشکەوت وپەسارە
(ڕۆستەم حەوێزی-ئاوات ل ١٠١ و ١٠٢)

پارەپارەی کەن: پارچەپارچەی بکەن

پەژار: پەرتوبلاو، کەرت کەرت
بۆتە دەوڵەت مەسقەت وعومان وبەحرەین وقەتەر
کوردی بیست ملیۆن نفوسیش ماوە کەرت کەرت وپەژار
(ڕۆستەم حەوێزی-نەورۆز ١٩٧٢ ل ١٢٨)

پەرتی پەرتی: هەند هەند
تەنیا هەر توتن رەزیل ماوە لەبەر دەستی تەبەر
پەرتی پەرتی پارەیان پاش سالەکی ئەوجا دەدا
(ڕۆستەم حەوێزی ١١ئازاری ١٩٧٠ ل ١٣٩)

پەڕۆ: پارچە قوماش، تیلمە قوماش

پەتیار: نازناوێکە لە کۆیە

پیسکە: ڕەزیل

پس پس: بۆ بە پێکەنین هێنانی منداڵ بەکاردێت

پنج: ڕەگ، پنجی داکوتا (ڕەگی داکوتا)

پێکورە: بەو کوللە ساوایە دەڵێن کە جارێ باڵی نەڕوابێ، پەلاماری شینایی دەدەن تەڕ و وشك دەخۆن

پێڵاو لۆ پێیە، کڵاو لۆ سەرە

پێی لەجەرگی خۆی نا

پێویستە پیاوی دووژنە دوو هەمبانە درۆی پێ بێ

پێستی سەی لەدەباغانانیش خاوێن نابتەوە

پیرەژنی بەنووکە نووکە
هەزارمێرد دەنێژێ دەرێی بووکە
دەرێی: دەڵێی

پیرەژن هەندەی نەگۆ کەپوویان بڕی

پیرەکەر وقەراسەیان نەگۆتییە

پیت، ساری کرد فیت

پێت هەربخلیسکێ نەك زمانت

پیاو هەیە لەژن ئاوس دەبێ

پیاو ئەو پیاوەیە بە چاکە پیاو بێ
نەك بە وەزیفە ناوی بەناوبێ

**پیاز بە سیری دەگۆت بۆنت ناخۆشە**

**پشیلە لە راهی خودای قەت مشك ناگرێ**

**پشیلە باڵی هەبوایە تۆی تەیری دەبڕی**

**پەنجە لقی درەخت نییە، کە بڕیت بێتەوە**

**پەلارێکی هاویشت تەزاندی**

**پەلاران رامەوەشێنە**

**پتەکی لێ دەکەی شەق دەبا**

**پشتی لە خوارێ ودەستی لەحەوا**

**هیچ ماڵێ نییە نەی بێ شتی وا**

**(گەسك، گێسك)ە**

**پێی نییە دەڕوا وناگەڕێتەوە، بەخۆت نازانی کوو دەبڕێتەوە (تەمەن ومردن)**

**پێستی مەڕە، بازنی خڕە، پەنجەی لێ دەی دەنگی پڕە (دەفە)یە**

**پیرە مامی لەتەلانی، تیران داوێ بێ کەوانی (سیخوڕ، سوچڕ)ە**

**پشتی لە خوار ودەستی لەحەوا، بزن هەی بزن باری تەعالا (مەشکە)یە**

**پاسەوانی بەکارە، لەپشت دەرگاو دیوارە بەسەرمایێ زۆر هارە (سەگ)ە**

**پیستەی هەیە وناوسکی نییە، بەبێ تاوان لێ دەدەن (دەهۆڵ)ە**

**پەلکی لەوێ کەوتییە، تەڕکی لەوێ کەوتییە**

**(شفتی، شووتی)یە**

**پێنجە نابێ بە شەش**

**(فەرزەکانی ئیمان)ە**

**پشتی ڕەقە بەرد نییە، هێلکە دەکا مریشك نییە سەری درێژە مار نییە (کیسەڵ)ە**

**پێتەوە دەنێن، لێت نابێتەوە؟ (ناو)ە**

**پاشازادەکەی کەچەی شار، لەگوڵ بووە لەناو گوڵزار، بێ بۆنی گوڵ ناچێتەشار**

**(هەنگ) (مێش هەنگوین)ە**

پێیەکانی بکووشی، دەمی دەگەزی (گاز وپلایس)ە

---

پیروتەڕ پۆش. هاتوونەتە جۆش

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل١٠٦)

---

پیکەبڕە: کاتێك گەنم وجۆ قەف دەکات جۆرە کرمێك ئەم نێرکەیە دەبڕێت کە گوڵ دەردەکات، گەشەی دوا دەخات.

(گوندی قازبەگیان-ئازاد قازبەگیان ل١٢)

---

پەڕۆی بە قونبوە، وەستاوە بەپێوە

(کەندوو)ە

---

پەتە: وصل

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٧)

---

پارەی قەلب: نقد مزور

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٧)

---

پەستۆپێو: مقیاس الضغط

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٧)

---

پەخشێن: مذیع

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٧)

---

پەنابەخوا: الابعاذ بالله

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٧)

---

پیپ: برمیل

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٨)

---

پێشزانی: تنبنا

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٨)

---

پێڕۆ: نظام

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٨)

---

پەندیار: واعظ

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٨)

---

پێشبڕك: منافسه

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٨)

پەست: ئۆتۆمبێلی پاسی داری (پەست) دوو جۆری هەبوو، جۆری یەکەمیان قەمەرە بوو، جۆری دووەمیش گەورەتر و درێژبوو

(چەپکێ حاجیلەکانی دەشتی هاموون-مام هەژار ل١٠٤)

پاپۆری غەرق بووە

پێناو: یەکێکە لە بەینی دوو دلدار هاتوچۆ دەکات بەیەکیان دەگەیەنێ

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل١٧)

پاکووت: پێشێل وەکو کوتانەوە وشێلانی سەربان بۆ نەهێشتنی دلۆپە وتکە.

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل١٧)

پشتەگ: کەمێ هێشتنەوەی خوری لەسەر پشتی مەڕ.

پەپۆرە: خواردنی پەلەوەرە نەرم وشل وتێ کووشی یە

پارچەرە: پارچەلە، زێتر بەو کبڕە دەگوترێ کە باڵای کردبێ و پێش ئەوەی خۆی ناسیبێ، هەڵیدابێ.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

پلتۆخ: ژنێکی پلتۆخە، واتە پیس و چەپەڵە.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

پەرپوت: شڕو زەردهەڵگەڕاوو بێ زەوق

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

پەرگە: تەرەف، ماڵێ کاحوسێنی لە پەرگەی گوندییە، دەرکەیان بەرەو قیبلەیە.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

پلپلە: میشتێکە، پیلە

پلپلەی تریفەی زیوینی مانگ تا ژەنگی تەمەن نەیروشاندووە ئاوێنەی تریفەداری گۆنات

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل٢٤)

پارە سوو: بەپاڵدان هەڵیان دایە دەرێ، پاڵەپەستۆ

**پەلارە کۆری**

---

پلکە سەفیە هەبووە لەکۆیە سوالّکەر بووە، مالّی بەتەنیشت دوکانی سۆفی سەلیم بووە، ئەو رۆژەی مردووە، سالّی ١٩٦٠ سوالّی کردووە داوای هێلکەی کردووە کە هیچ نییە بیخوات، دوایی دەرودراوسیّ زانیویانە دەبینن بەتەنەکە لیرە وفلس وعانەی هەبووە، سەری تەنەکەی سواغ داوە، لەکونی دیواری پارەی شاردۆتەوە، پارەی هێندە زۆر بووە سەرەنجام لیژنەیەك لە پیاوماقولآنی کۆیە پێکهاتووە پارەکەیان بۆ کورەکەی ناردووە بۆ کەرکوك، شارەوانی ناشتوویەتی دەبێت خەلّك ومندالّ نەختێکیان بەرکەوتبێ لەو پارەیە بۆیە ببوە پەند هاواریان دەکرد.

پلکە سەفیە لیل ئەمام

بیست ودوو لیرەی تەمام

پلکە سەفیە دێتەوە

پارەکەی دەوێتەوە

---

**پاشباب:** ئەو مندالّەی پاش مردنی بابای لەدایك دەبێ.

---

**پانپانۆکە:** خۆڕەحەتکردنی ژنان بەیەك

---

**پاموور:** جۆرە ئاوازێکی گۆرانی کوردیە

وەك خڕخالّ خشلّ وزیوە لەپاو قاچ دەخرا بۆ ژنان

---

**پەشت:** بەشێکە لە ئاڤێستا نزایەکە کە مرۆڤ ڕێنمایی دەکات ٢١ سرودە

---

**پسپسۆك:** ئەو گیایەیە کەرەوز وکەوەر وسەوزەی پێ دەبەستێ نەرم وبەهێز نا پسێ دەکولّێندرێ تاخەست دەبێتەوە بەکار هاتووە بۆ نەخۆشی سۆزەنەك

---

**پێچەبەردەورە:** زیکزاك، حلقەمفرغە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٦٧)

---

**پارزۆنگ:** مصفاة

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٨٨)

---

**پووچاندنەوە:** ابطال

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٠٤)

---

**پاشوو:** بەواتای ئەندامی ولآغ دێت

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٤٨)

---

پەلارپیتکە: ئەو بەردە بچووکەیە کە دەخرێنە نێوان چاو وئەنگوستی شادەی راستەوە تەنیشت ئەنگوستی شادەی چەپەوە بەپاڵە پەستۆی ئەنگوستی گەورەی چەپە لەسەر ئەنگوستی شادەی راستە، بەردەکە بەرێ دەکرێت تەوژمی دەبێت وەك پەلارتیژ دەڕوات.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٦٩)

---

پێکوەربوون: اشتباك

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٧٩)

---

پەرستگار: عابد

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٨٣)

---

پێی ناوێ مێژوو بگۆڕین، ئەگەر هیچمان لەدەست دێت بائێستا ودواڕۆژ بەرەو چاکتر بگۆڕین

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٢٠)

---

پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)نەبوایە مێژووی ئادەمیزاد شتێکی دیکە دەبوو... مارکس ولینین نەبوونایە شۆرشی ئۆکتۆبەر نەدەبوو

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٠)

---

پیاوێك لە دایك نەبووە مردییە. یەکێکی دیکە لەدایك بووە نەمردیە (ئادەم وحەزرەتی عیسا)یە

---

پیستی مەڕە، بازنی خڕە، پەنجەی لێدەی دەنگی پڕە (دەف)ە

---

پیرەژن لۆ نامری، لەسەر رۆخی قەربری، کوچکی بەر ئاگری

---

پێمەڕەی زۆر پەرت وبراوە

(بڵاوە)

---

پێیەکم لۆ وەرەپێش، هەتا دووپێیانت بهێنمەپێش

---

پاشەکەوتی جۆبەکم مەژمێرە
خواردنی چارپێ ودووپێیە لێرە

پایزێ، بەتاولەرزێ

پشتم بەعەنباری گەنمی دایە

پشیلە گۆتی میاو
مشك جەرگی بوو بە ئاو

پلك لەمردنە، زێری لەگەردنە

پیاو قسەی خۆی بەجێهێنا شێرە، بەجێی نەهێنا چێرە
(چێر: مانگا، چێڵ)

پیتی پیت کرد. سارێی خیت کرد
(سار: ساڵ)

پیاوی ئازا لەخەنجەری دەبان ناترسێ

پیرە بەنوێژە، ساریش درێژە
(سار: ساڵ)

پیرەژنێ بە نووکە نووکە، نۆ مێردی مراند، لۆ خۆی هەر بووکە

پیرەژن لۆخۆی دەیدڕی ولۆخۆی دەردوورییەوە

پاش ئەحمەدی خانی وشەرەفخانی بەدلیسی کە بەنوسین لەبارەی کوردەوە دواون بێ ئەوەی لەزەمانی خۆیاندا دەنگی دابێتەوە هەستی کوردایەتیان جولاندووە.
مەسعوود محەمەد
(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٣٣)

پرسەگ: نیشانەی پرسیار (؟)
مەسعوود محەمەد
(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٥١)

پاکار: بەردەستی کوێخا

پێمەرد: عزرائیل

پەپاغ: کلاوی تورکان

پشت رەق: لەكار وەرزبوون پشتی لێ رەق بووە

---

پاپۆرەكەی وەرگەڕاوە ونقووم بووە

---

پەرژینی پیاو رەوشتە

---

پشتی یەكتر بەعەردی دانادەن

---

پەت پەتێنەی دونیایان پێكرد

---

پەنابەی لۆ بێگانە، دەتكاتە پەندی زەمانە

(لۆ: بۆ)

---

پیاو شاگردی ژنە، ژن مامۆستای شەیتانە

---

پیاو لۆ ژن چەترە، لۆ خێزان چادرە

(لۆ: بۆ)

---

پیاوی شیاو لۆ جێی شیاو

پیاوی نەشیاو لۆ كورسی شكاو

(لۆ: بۆ)

---

پێی پێدا چزایە

(چزاوە)

---

پێبكەنە لەگەر دونیا، لۆخۆت بگری بەتەنیا

(لەگەر: لەگەڵ، لۆ: بۆ)

---

پێچكت بە قوونی

---

پەیمان هەورە وبەجێ هێنانی بارانە.

---

پشیلەی مۆن دونگی گەورە دەبا

---

پیاو موودار وژن بێ موو.

---

پیاوی باش وەسف دەكرێ، پیاوی خراپ تێی هەڵ دەدرێ.

---

پاشەكەفتی جۆیەكەم مەژمێرە. خواردنی چارپێ ودووپێیە لێرە

---

پایزێ، بەتاو لەرزێ

---

پف لە چرای خوای بكەی، ریشت دەسووتێ

---

پلکە هۆری. بەخۆی دەتری، بەخۆی دەتۆری

---

پوور لەمردنە. مۆری لەگەردنە

---

پیاوی مەرد. خەنجەری دەبان نای بڕی

---

پێت بخلیسکێ، زمانت نەخلیسکێ.

---

پێدەکەنم ڕادەکەم، دنیا چۆنە وادەکەم

---

پیرە مێرد چ پیسە؟ چیرەی دەرێ گوریسە

---

پیر بە نوێژبێ. سار درێژە.

---

پیرێژن بۆ چ نامری، کوچکی ڕۆح ئاگری.

---

پیرێژنێ قوون قەوی، ئەو شوەی مەکە شەوی

---

پێمەرەی زۆر براوە

---

پێیەکم لۆوەرە پێش، هەتا دوو پێت لۆ بێمە پێش

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٩)

---

پزوو: ئەو نەخۆشیە بەزۆری تووشی مەڕ دەبێ وتووشی هەناسە سواری وئەستوور بوونی سەروو قورگی دەکا.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠١)

---

پرتاو: ئەو جۆرە غاردانە زۆر بەتوندیەو ئەو پەڕی خێراییی ولاخە

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٨٨)

---

پێنج تیری رووسی: ئەو جۆرە تفەنگە ڕووسی بوو پێنج فیشەکی دەخوارد

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٦٧)

---

پێ بەقوونە: باڵندەیەکی ئاویە وناتوانێ زۆر بەپێ بڕوات بۆیە بەزۆری لەناو ئاودا دەژیا.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٥٦)

---

پەرکوڕ: جۆرە هەڵۆیەکی درو بەهێزە وسەر باڵەکانی وتەپڵی سەری سپیە
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٥٨)

---

پیرخەنی: مام سمایلۆکە
ئەو چێشتە لەوردە ساوار ورۆن وپیواز وخوێ دروست دەکرێ بەشێوەی شل بەتایبەت بۆ کەسانی بەساڵاچوو دروست دەکرێ بۆ ئەوانەی ددانیان نەماون.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٤٧)

---

پەحا میللەتی (مجرد) چەند ئاسمانییە هەتا دەبێتە تاك تاكی هەناسە هەڵینی مەیلەو چڵکن و خاوەن نارەزۆ و نارەزامەند و زمانهەراش . خەباتگێڕی تریفە پەرستی دوور لە واقیعی رەقوتەق پڕ بە دڵ خزمەتکاری ئەو گەلەیە وەك مەڕ، لە جیاتی باوەڕ، سروودی (ئەی رەقیب) بچڕێ .

---

پەندی پێشینان بیرت بێتەوە، کوڕ بە مەلەی باب ناپەڕێتەوە.

---

پرخەی رۆژە رێیەك دەڕوا

---

پلکی دەچێ لۆ مردن، موورووی دەکاتە گەردن.

---

پێم خۆشە لە دۆزەخا بژیم بە سەربەستی، نەك لە بەهەشتا بە ژێر دەستی.

---

پێکەنینی ئاسایی هاواری بەهێزی سەلامەتی لەشی مرۆڤە.

---

پێی نییە دەڕوا ناگەڕێتەوە، بۆ خۆت نازانی کوو دەبرێتەوە.
(مردن).

---

پێت دەوەستم
راناوەستم

---

پەتاتە تەماتە تووشم بکەی،
(پەتا)تە واتە لەرزوتا، (تەما)تە واتە بەتەمای تووشم بکەی.

---



پێنگاو: چۆن پێنگگاو هەیە لە دەشتی کۆیە لە خۆشناوەتی لە گوندی (زێوە) زنجیرەی شاخی ماکۆك لە ئاست سەری زێوە کانی کەپرە هەیە وەك پێنگاو وایە.
وەك پێنگاوی -شوان وگاوانی ناوێ.

---

پۆخین: جاران لە کوردەواریدا مێوژ وقەزوانیان بەجۆنی بەیەکەوە دەکوتا ودەیانخوارد وپێیان دەگوت پۆخین.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٦٨

---

پسدان: واتا بۆڵداش منداڵ، ئاژەڵ دوای ئەوەی دەزێ پسدانی فرێ دەدا یوڵداش بۆ مرۆڤە وپسدان بۆ ئاژەڵە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٤

---

پارزوونگ: ئەو پارچە قوماشەیە، یان ئەو پارچەیە بوو کە لەسەری مەنجەڵی شیری دەبەستن بۆ پارزنینی شیرەکە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٥)

---

پانکە: بریتیە لە ددانە گەورەکانی پێشەوەی مەڕ وبزن.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٢)

---

پەشتەك: جۆرە بەنێکی دوولایە و وەك فرێتە بۆ چنینی جاجم وبەرماڵی نوێژ بەکاردەهات.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٢١)

---

پسکە: جۆرە نەخۆشییەکی وەك پەسیوە وتووشی مەڕ دەبێت.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٩)

---

پاشتەگە: بەتەگە هاتنەوەی جاری دووەم وسێیەمی بزنە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٤

---

پاگژبوونەوە: بەزمانی مەرداران پاکژبوونەوە ئەوکاتەیە مەڕ وبزن هەموویان دەزێن.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٣)

پاش ئاخوڕ: کای پاش ئاخوڕی زۆر درشت بوو بۆ نانکردن وچێشتلێنان زۆر باش دەسووتا.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨٦)

پۆسکە: ئەو کونە باریکە بوو کە لە بنی تەندووەدا ئاوی بەگوڕ پێدا دەهاتە خوارەوە ولەپەڕەی ئاشەکەی دەدا وبەردە ئاشەکانی دەسووڕاند.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٦٣)

پەرێزپیس: ئەگەر لەکاتی دروێنەکردندا گوڵە دەغڵ لدەست سەپانەکاندا هەڵوەرێ بەو سەپانانە دەڵێن پەرێزپیس.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤٢)

پێشبار: پێشتر بارت دانابێ لەجێیەك.

پارینگ: ئەو جۆگەیەیە کە لەدەوری ڕەشماڵ لێدەدرا بۆ پاراستنی لە ئاوی باران.

پاشاخوڕ: وڵاخ لە ئاخوڕ بەرماو.

پاشا وپاش: گەڕانەوە بۆ دواوە.

پاشدۆ: پاشدۆشین، پاژدۆ دوای دۆشینی وتێبەردانی مەڕ وبەرخ

پانك: گۆڕەپان

پان وپۆڕ: زۆر فراوان

پەردوو: بریتییە لەو کفرو قامیش وهەراشەی لەسەر دارە ڕێی خانوو دادەنرێت.

پەرکۆ: کوتانی گەنمی ساواری بۆ ئەوە تفرە تەنکەکەی سەری لێ ببێتەوە.

پەڕەکەی عاسمان: تاقی ئاسمان، بەرزترین شوێنی ئاسمان.

پەرەكەی وەرگێرە: باسەكەی بگۆڕ، باسێكی دیكە بكە.

پەڕخوڕ: ئەو خواردنەی لەنێو زگی ئاژەڵ دەمێنێتەوە وهێشتا هەر نەبووە.

پرچ بەگروازە: پرچ لوول (نیگرۆ).

پرچ قژن: پرچ گف، پرچ چڕی ڕەق.

پند: گەڕا، جۆرە زیندەوەرێكە لەسەر لەشی مریشك ومانگا.

پندڕ: نەرم بوون وخاوبوونەوەی زەویە لەبەهاران.

پوخە: نابوت، مردۆخ، لەپولاوان، بێنموود.

پوكە: بەری قامیش كە لە لۆكە دەچێت.

پۆقلە: دوای ئەوەی نان لە فڕنی یا لەسەر سێڵ دەبرژێت، لەچەند جێیەك هەڵدەواستێت، جا بەو هەڵستانە دەگوترێت پۆقلە.

پێوەدان: ١. نان بەتەندوور وەدان. ٢. مار ودووپشك گەستن. ٣.دەگگە لێدان، زیان لێدان.

پێوەنووس: جۆرە موتربەیەكی سەركەوتووە بەهۆی ئەوەی درەختەكە لەسەر زەوی دەبڕدرێتەوە وموتربە دەكرێتە ودەورووبەری دەپەسترێتەوە وناجولێ.

پیاوی ترسنۆك وەك پووشكە سووكە.

پارە، گەیشتە قاسە+مێشكی خاوەنی كاسە.

پارەدارە: دژمن دارە.

پاشای دادگەر+پاشایە تاسەر.

پاك، بكەوێ هەڵدەستێ+پیس، تل بخوا ناوەستێ.

پاك، هەڵدەخزێ+پیس، هەڵدەچزێ.

پاكی؟بێپاكی.

پاڵ بدە بە بەردەوە+نەك بە نامەردەوە.

پستە دەمی كردەوە، دەزانی پووچە یا پڕە.

پشت بە خۆت ببەستی+كەوتی، هەڵدەستی.

پشتم کێو بێ ودژمنم دێو بێ.

پشتێنی لێ کرۆدتەوە.

پشکۆ، بەدەست هەڵمەگرە.

پشیلە نەبێ لەماڵ+مشك دەبێ بە حەماڵ.

پشیلەی مەتبەق+گۆشتنە وچاو زەق.

پووش وپڵاشە+بۆ فەقیرباشە

پەپوو سلێمانەی بێ تاج+مەلی سادەی بێ ڕەواج.

پەردەی دروە وزەنگی زڕیوە

پەلەوەر بەدان وئاو+ڕۆژێ دەکەونە داو.

پەندی مەردان+نەخشی بەردان.

پیاو بۆ کوشتنە وژن بۆ دانیشتنە.

پیاو بە ناو+ژن بە چاو.

پیاو، سامان پەیدادەکا، سامان پیاو پەیدا ناکا.

پیاوی بەر ئاگر، کون لەجەرگیا نییە.

پیاوی خوایە وبێ ئاگایە.

پیاوی زل، قوڕی شل؟؟

پیاوی گەورە+سایەی چەورە

پیاوی گەورە، گوویشی چەورە.

پیاویان دەبرد بۆ سێدارە+ژن دەگریا بۆ گوارە.

پیاوەتیم ناوێ+مەمخەرە داوێ.

پیر وپۆش+هاتنە خرۆش.

پیری، قاڵ بوونە+نەك بەساڵ بوونە.

پیرە وبەبیرە.

پیس، تەڕ بوو+بێفەڕ بوو.

پیشەی سەگ، وەرینە.

---

پێ لەسەرەمار مەنێ.

---

پێ مەنێ بەسەر گوڵا

---

پێ نەنێی لەمار، پێتەوە نادا.

---

پێستیان هەڵواسی لە دەباخخانە.

---

پێش باران، پێشی دڵۆپە بگرە.

---

پێش چوونە ناو بیر، بیری هاتنەدەر بکە.

---

پێش مەلا دەچێتە مزگەوت.

---

پێشی پۆلابێ، پاشی لۆکەیە.

---

پێشی کاروان، لە پاشی کاروان ئاگادار نییە.

---

پێشی لافاو بە کەس ناگیرێ.

---

پێکەنینی زۆر، گریانی لەدوایە.

---

پێڵاوی دڕاوە+قەیتانی بچڕاوە.

---

پێی چەور وتەڕ، بوونی بەفەڕە.

---

پێی لێهەڵبڕی.

---

پێیەکی لێرەیە ویەکێکی لەوێ.

---

پەندی پێغەمبەرە: لە مووزەرد و چاوشین بترسە.

---

پشیلە گەر بەچکەی خۆی نەویستبا مارەومار نەیدەگێڕا.

(مار: ماڵ)

---

پیاوی ئازا، چاوی لۆ چاوان ناترو کێنی.

---

پیاوی پیاوانە، هی مەیدانی شێرانە.

---

پێمەڕەی چیمەن: ئەو پێمەڕەیەی بۆ کێڵانی چیمجار دروست دەکرێ پێی دەڵێن (پێمەڕەی چیمەن)

(مەسعوود محەمەد/گۆڤاری کاروان ژمارە (٧)ی ساڵی ١٩٨٣ ل٤٦)

پارەی بە قوونی هەر دەگرتەوە.

پیشك: ئاسنێكی سەر تیژە بۆ هەڵكەندی كەنگر وپیفۆك و...

پلینگ لەبەر كەمتیاری هەڵدێ چونكە كەمتیار بریندار بكات چاك نابێتەوە!.

پەرگ: ئەو جۆرە بەنە بوو كە بۆ كلاش چنینەكە دەڕسترا.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەكان-حەمید ڕەشاش-ڕێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥٤)

پانك: ئەو ملە چیایانەی لەژێر یەكترن.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەكان-حەمید ڕەشاش-ڕێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٤)

پێڕەو: واتا ڕۆیشتنی مندالە لەسەر پێیەكانی.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەكان-حەمید ڕەشاش-ڕێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٣٩)

پشتگوژە: بەستنی دوگمەی كەوێ، یان كراسە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەكان-حەمید ڕەشاش-ڕێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤١)

پەنگری عەردی كەوتیە
عوشری: ئەوەش جۆرە باجێك بوو لەسەر فرۆشتنی دەغڵ ودان ئەوە كالآیانەیان دەهاتنە ناو بازاڕ دادەنرا.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەكان-حەمید ڕەشاش-ڕێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٧)

پۆپن: نێوانی گون وقوونە، بەپیاوی زۆر ژنانی دەڵێن پۆپنكە. بەنێوانی قوز وقوونی ژنیش دەگوترێ پۆپنە
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەكان-حەمید ڕەشاش-ڕێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨٧)

پێخوست: شوێنی پێ وریشتن بەتایبەتی لەنێو خۆڵەپۆکدا.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٠٢)

---

پزووی بەفر: ئەو بەفرەی لەنێو کەند وقۆرتاندا کۆدەبێتەوە وتارمەتارمە یان بڵند ونەوی. پزوو لۆچەکانی دەرپێ وشەرواڵیش دەگرێتەوە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٠٥)

---

پارە دەچێتە سەر پارە.

---

پیرەژن بە کەچە سوڵی ڕانەگەیشت.

---

پیاو تا نەترێ، چوارمەشقی دانانیشێ.

---

پیس پێوە بووە.

---

پاشەڕۆژت لەبەرچاو بێ.

---

پیاو بەجێ بمێنێ لە خێڵێ، عەرزی بە کەڵان بکێڵێ، نابێ میوان بەجێ بهێڵێ.

---

پیاوێ دڵسۆز بێ بۆ هەموو کەسێ، دەرگاشی نەبێ لە هیچ ناترسێ.

---

پێت حەرام بێ، وەك گۆشتی سەی.

---

نۆرە بە نۆرە، قازانجی زۆرە.

---

پیر، تا نەکا تەگبیر، نابێ بە میر.

---

پیر لە مردنە، حوان بە بردنە، ماریش لە خراپ کردنە.
(مار: ماڵ)

---

پیر وتەرپۆش، هاتنە جۆش.

---

پیرخەل وبراز!

---

پیرە، لۆیە واگیرە.

---

پیرەژنی ئەو دنیایە، عەشقی خۆی بەبیر نایە، دەکا مەنعی من ویایە.

---

پیری بە تەنیا نیعمەتە، پیری وهەژای نیگبەتە.

پیاز بەیانیان لۆ خۆت، نیوەڕۆیان لۆ دۆستت، ئێواران لۆ دوژمنت.

---

پێ لە کەری شەیتان بێنە خوار.

---

پێ وقەدەمی خێربێ.

---

پێمان لێ مەبڕە.

---

پێوەی ماندی نەبووە.

---

پێیەکت لێرە، پێیەکت لەوێ. کاری ڕۆژانە مەخەرە شەوێ.

---

پارە وتەپارەی لەکن وەك بەکە.

(تەپارە: تەپاڵە)

---

پەپوو، خەسوو، شێرەکە هەرچوو.

---

پەکی کەوتیە.

---

پێچ وپەنای زۆرە.

---

پارووی چەوریش، جوینی دەوێت.

---

پارە هەم دین دەرە، هەم دین بەرە.

---

پاڵەوانی قسان، کۆڵەواری مستان.

---

پێی لەسەر پێی دانایە، دەرێی کوڕی تڕتڕپاشایە.

---

پیاوی گولە، تڕی زلە.

---

پیاوی قوڵە، تڕی زلە.

---

پێبکەنە لەگەر دنیا، بگری بۆخۆت بەتەنیا.

---

پیاوی کورت، بە قەیسەریدا بڕوا، سەری دادەنەوێنێ.

---

پۆزی عالی، باخەر خاڵی.

---

پشتی پێوە نەیەشایە.

---

پورزا وئامۆزا قسەی ژنانە. دڵسۆزت دەوێ ئەوڕۆ قڕانە.

---

پیاو ئەو پیاوەیە بە باری خۆی بفڕێ، نەك بە باری خەرکی.

(بار: باڵ)

---

پیره، به ڕاوتەگیره.

پیر لەسەر ڕۆژ قەبرییە، ماری نوێ لە فکرییە.

(ماری: ماڵی

پارووەکانم دەرژێنی.

پشیلە باڵی بدایە، تووی چۆلەکەی دەبڕی.

پا دەدا لە پەیژ

پیرەژنـــێ بـــە نووکەنووکـــە، هـــەزار مێـــرد دەنێـــژێ وخـــۆی دەرێـــی بووکـــە.

(دەرێی: دەڵێی

پەلەیفە: جاران ولـەکاتی هـەژاری وبێدەرەتانیـدا شـەوان لەبـەر ئاگری نانی تیرییـان سوور دەکردەوە وبەرەقی دەیانخوارد وپێیان دەگوت پەلەیفە.

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچـوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل١٣)

پیاو پێی خۆشە بە کۆری بگەڕێ،

بەران ئەولادی بە کەساسی نە بینێ.

(بەران: بەڵام

پێوەدان، لە گیزە گیز خۆشترە.



تازی: عەرەبی

بوونە ئوستادی فارسی وتازی

تا گەیشتن بە فەخرەکەی رازی

(حاجی قادری کۆیی)

---

تەبەق: جێی شەکر شکاندن!

تەبەقە پڕبێ، با هەر قوڕ بێ!

تەبەقە جۆرە نەخۆشییەکە لە قاچی مانگا وگامێش دەدا

---

ترکەن بتگری، فسکەن بەرتدا

---

تێیدایە: خەڵکی لێ یە زیاتر لەناو دەستخانەی مزگەوت ومەکتەبان بەکاردەهات لە دەرگاکان دەدا کابرا دەیگوت تێدایە.

---

تەوقە شینکە: باڵندەیەکە، هاوینان پەیدا دەبێ لە چۆلەکە گەورەترە بن باڵی شینە

---

تەرسا: مەسیحی–گاور، فەرمەسۆن، بێدین

حاجی قادری کۆیی ل

موسڵمانان سوخەن سەرڕەشتە تاکەی

لەدەست ئەو کافری بێ دینی تەرسا

---

ترێ خەسرەو: خەسرەو ناوێکە یەکی لێ بەربووە بۆتە مێژوو –بۆتە ترێ خەسرەو هەر نابڕێتەوە: حاجی قادری کۆیی گوتویەتی:

باسی زولفی درێژ وچاوی بەخەو

نەبڕاوە، بووە ترێ خوسرەو

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ١٦٢)

---

تڕی بن گۆم: بە فیڕۆ وبەبێ دەنگی ڕۆیشت ئەدیب وعاقڵی لەم بەحرە وەك (تڕی بن گۆم) گەلێکی ون بووە، حاجی واچاکە لێی دەرچین وت چاکە لێی دەرچین

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل٩١)

---

تامن پێم دەکرد خێر، ئەلان بوویتە گورك وشێر

---

تەزبیحی سەد قل مەرجانە! سەد جوون (جوێن) بەجارەك هەرزانە!

---

تاڵە ڕەش: مەرێك کەدەم وچاوی خەتی تێدابێ چ ڕەش چ سوور

---

تڕی دێو: بەو کەسە دەڵێن هەر خۆی هەڵکێشی وچشی پێنەکرێ

---

ترش: شلە،مەرەگە (دەڵێن) ترش وبرنجمان هەیە

---

تەبارە: ئەو دەغڵەیە کە هێشتا نەدووراوەتەوە

---

تەڕەتیزە: تەڕەتوولە، دەبێ لەبنەڕەتا (تەڕەتیژە)بێ

---

تکری: کتلی. کتری

---

تاسوق: تامی زۆر، حەز لێ چوون، تامەزرۆ

---

تەرك: داری تەر بۆ سووتاندن بەکاردەهات وبۆ لێدانیش بەکاردێت

تەرکەداریش بەکاردێت:

حاجی قادری کۆیی:

ئەو زەمانی بوونە ئاردی نێودرك

پارەیەك ناکا دوسەد جاربێ تەڕك

---

تەڕلان: بۆ ئافرەتی تەڕ وبەهەوەس بەکاردێت، تەڕوتۆڕ

---

تەڕلوس: بۆ پیاو بەکاردێت کە هەمیشە خەریکی خۆ ڕازاندنەوە بێت

---

تەڕاش: کۆمەڵە دارێکی ساوا بەچڕی لەپاڵ یەکەوە ڕوابن

دەگوترا:

پێشمەرگەی بن تەڕاشان

کێریان بە قوونی جاشان

---

تووك: نزای خراپ، گەندەموو، تووکم لێکرد، تووکی هاتووە

توولەك: پەڕوباڵ هاتنەوەی باڵندە

---

تێلخانە: جێی لاسلکی وتەلەفون (ل١٤٦ مێژووی کۆیە–تایەر ئەحمەد حەوێزی)
دەچێتە تێلخانە ومخابەرە لەگەڵ باوکی دەکا

---

تەپڕ: تەوقی سەرێ، قۆپکە. لەتەپڕی سەرێ دانیشت بوو، لەتەپڕی قوزی داکت بم، تۆقەرە

---

تیلماسك: لقی هێشووە ترێبەك چەند دەنکە ترێیەکی پێوەبێ
دەڵێی تیلماسکە ترێیە!! بۆ جوانی بەکاردێت

---

تۆغیان: وەخت تۆغیانیەتی واتە وەختیەتی، کاتی هاتووە: تافی لاویەتی

---

تانۆك: پەرژین: تامان

---

تاقولۆق: تاك تاك، دەگمەن

---

تارووکە: بەپەلە، بەعەجەلە. بە تاڵووکەیە، بەپەلەیە

---

تامپۆن: پێکدادان، دەعم

---

ترومبێل: ئۆتۆمبێل، ئوستاد بەشیر مشیر دەیگوت پەیتووکە

---

تەبیعەت: ئارەزوو، حەز، تەبیعەتم نایبا، پیاوێکی بێ تەبیعەتە، هەندێك کەس دەڵێن تەبیعات، تەبیات

---

تەپك: گرد: تەپۆلکە
تەپکە دەنێتەوە، رێگەیەکە بۆ ڕاوکردنی تەیر

---

تەپڵەجفارە: تەپڵەکی جگەرە

---

تا نەینا لە تەبەق، نەیگۆ ئەڵاهوو سەددەق

---

تەلیس: گونیە

---

تیغ: مووس: چەقۆ

---

تەندورە سوورە: گەمەیەکە

---

تەواوێك: بە ئەندازەیەکی باش

---

تیغ تیغە: هاندان، فوتێکردن. باتێکردن

---

ترینگە: جوڵانەوەی سەرخۆش بەلارەلار، سەری ترینگەی دێ

---

تەتفا: تاسی سەری ژنان پێکەوە دەبەستێتەوە

تیف تیفە: ڕازاندنەوە

تەویلە: گەوڕ- هۆلی مالأت، زیاتر بۆ ئەسپ ومایین بەکاردێت

توولْ: لقی داری کۆنی درێژ

تێچین: تەدەخول

تیرێژ: تاڵەتیشك، کراسی کوردی ژنان بن هەنگڵەکەی پارچەیەکی مەیلەو سێگۆشەیی لێ دەکەنەوە بۆ ئەوەی فەڕاح بێت.

توخن: نزیك (توخنی مەکەون)

تەشق: هێز-تەوژم-دەڵێن- سەرما تەشقی شکا

تەیمان-تامان: پەرژین، تانۆك

تیلقەی پشت: ناوەڕاستی پشت، گازەرەی پشت

تیلەقەی پشتم دێشی: کۆیی دەڵێن تیرەقە

تیرەقەی پشت

تومەزە: لەبەرەوەی (لەبەرئەوەی)دەڵێ: تومەزە خزمی بوو لایەنی وی گرت

تەڕو وشکانێ: پرۆسەیەکە بۆ هەڵبژاردن لە نێوان دوو کەس کامیان دەرچوو بۆ بەشکردن، خەت وشێرانێ

تفە: دەستپەڕ، خۆڕەحەتکردن

ژن ناهێنێ هەر تفە دەکا، ئەو تفەکەرە!

تورکە وتوخوا: هەڕەمەکی عەشوائی، هەر لەخۆیەوە

تووش: تورە وتووش یان تووشبوون بە ڕوداو وبەسەرهات، سەخت ونالەبار ئەگەر زستانەکە سارد بێ، ڕۆژێك بە بەفر وباران بێ، دەڵێن ساڵێکی تووشە.

(حاجی قادری کۆیی ل ١٦٧)

لە تووشی خۆم بوو هەرچی تووشی خۆم بوو

لە دەستی خۆیەتی حاجی شکاتی

شەوێکی توشە: واتە تاریك وباو وباران وساردە

تسیار: ئەو ماوە کورتەی ڕاوە لە ئاو کە مانگەشەو هەڵدێ ماسییەکان خۆیان دەدەنە بەر تریفەی مانگ ئەوجا ڕاویان دەکەن، ڕاوکردن بەشەو (شەوڕاو)

---

تەڕاوز: گەنمی درەنگ چێندراو

---

تەڕدەست: وەستا لەکارەکەی. گورج وگۆڵ لە دەست-چاپووک دەست

---

تەژگە: بەڕە، تەژگەبەڕ

---

تەژگەر بەمیز: جوونە (جنێوە) بۆ ژنان.تەژگەر دامەن

---

تەژگەر بەگوو: جوونە (جنیوە)

---

تەمۆغ: بەردی رزیو و نەرم بەدەست هەڵبوەرێ، نەبووە بە بەرد (ڕەق نەبووە)

---

تەوسکە: هەنجیری کێوی. لە گۆپتەپە وقەسرێ نازناوێک هەبوو (تەوسکە)، گوندێکە لە نێوان کۆڕێ ومەسیف، شوێنێکی خۆشە وپیاوچاکێکی لێیە. ئینجا ئەگەر کەسێک یەکێک سوێند بدات دەڵێ دەتبەمە سەر تەوسکێ، ئەگەر بەدرۆ سوێند بخوات دەترێ

---

تۆتکە: نەجۆلان، ئۆقرە نەگرتن، قوونی توتکە ناگرێ، عەجمینی نەبێ

---

تەڕی دەزانی: واتە هەر نایزانی، هیچی تێناگەی

---

تڕتۆپ: ڕۆح زل وبەفیز وناز وتڕزل، خۆبەزلزان، تڕقەوی

---

تیسک: خوری، موو،داو،پرچ جنێوێک لەناوژنان هەیە دەڵێن تیسک بە گووی واچییە! تیتکیش دەڵێن (تیتک) تیتکت بە بڕین چێ (توکە ژن لەیەکتری دەکەن)

د.هاوژین سلێوە لە شوێنێکدا لەسەر کەر دەڵێ:

مووی کلکی تیسک تیسکە

چاوی پڕ کل بە بریسکە

---

تارۆ: حیجابی پیاو بە پێچەوانەی تارا

---

تەپەنووسە: کۆبوونەوەی بە چڕی دەڵێن تەپەنووسەی کردبوو.

ئارام ساڵح شیعرێکی هەیە بەناوی (تەپەنووسە)

ئەوەندە ڕەنگی حەسرەتی تۆ

بەنەرمایی ڕۆحی رەوانمدا ڕۆچووە

زامی سەر دڵی خەونانم

تەپەنووسەیان کردووە!.

---

تکان: دووکان

---

تیرێژ: خەتی کەوا بەدرێژی پێی دەڵێن کۆبە

---

تەپکە: تەڵە

---

تاژی: تانجی

---

تیلم: پارچە، تووکەك هەیە دەڵێ:

تیلم تیلم بی

---

تلۆر: جوان دانیشە قونت تلۆر مەکەوە، واتە قونت نمایش مەکە. تلۆربوونەوە: گلۆربوونەوەی شتێك لە لێژییەوە.

---

تۆپی غەزەبێت پێبکەوی

---

تێڕێ: خەپە وکورتەبنە

---

تڕی سەر میزێ  ئەوەی پێم دەکا تیزێ، ئەوەی بەداکە حیزێ

---

تیتك: پرچ، کاکۆڵ

---

تەتۆکە: شیشۆق

---

تەڕەلەیلان: واتە نێرکەپیان، مەلایەك باسی میوەی بەهەشت بۆ کۆمەڵێك خەڵك دەکات. کابرایەك دەڵێ: تەڕەلەیلانی هەس. مەلا دەڵێ: نەخێر. کابرا دەڵێ: گشتی وەپووڵێ.

---

توخمت نەمینێ: تۆتان نەمێنێ، بیڕێنەوە

---

تەشتۆکە: تەشتی گچکە

---

شەوچەرە

تەشتۆ کە یەکیان پلاو وبرنج لەبەردەم دانا

---

تیتکت بە بڕین چی: پرچت ببڕنەوە، قژت کورت بکەنەوە

---

تراندن: زەرەرلێدان لەمعامەلە، بردنەوەی لێت

لە باتی ئەمەی دوعایەکەم بۆ جێبەجێ بکەن (تراندمت)

---

(شەوچەرە ل١٣- تاهیر ئەحمەد حەوێزی)

---

تووتك: بەچکەی سەگ، توولە، گوجیلە

بەڵام تووتکە کوڕی سەیە.

(شەوچەرە ل٢٢-تاهیر ئەحمەد حەوێزی)

---

تاسولوس: جوانکردن

---

تسخن: ڕەزیل وپیسکە وسەقیل. بە کابانی بێ دەست وبردیش دەگوترێ

---

تلووخاو: فلیقاوە

وا تلووخاوەتەوە بەعەمەل نایە

---

تەوسەن: ئەسپی سەرکەش (حاجی قادری کۆیی)

تەعین بکە ڕۆستەمی دیرایەت

تەوسەن بدە خوسرەوی عینایەت

---

تەنکێش: تەنیشت، تەك

---

تامیسکە: زیبکە لەسەر لایەکی لێو لە ئەنجامی تاو ولەرز

---

تەعقیبی بنی مەنجەڵێ دەکا

واتە هێندە بە چاودێر وبەلێ کۆڵینەوەیە

---

تورایتەوە: داڕزاوە

---

تێروتەژی: تێروپڕ، تێر وتەسەل

ئەگەر گەرەکتە شاد وتێر وتەژی، تۆ بژی

(دڵزار، خەبات وژیان ل٣٣)

---

تیلەسان: جبەی سەوز

چیایە شێخ وکەوای سەوزە، مێزەری بەفرە

سیواکی چوزەرە ڕێواسە، تەبلەسانی کەلا

(حاجی قادری کۆیی ل٢٣)

---

تڕی بن گۆم: بزر و ون

ئەدیب وعاقڵی لەم بەحرە وەك تڕی بن گۆم

گەلێکی لێ ون بوو، حاجی واچاکە لێی دەرچین

---

(حاجی قادری کۆیی ل٩٩)

---

**تامەزرۆ:** یەکێ زۆر زۆر حەزی لە شتێك بێت

**بۆ نمونە:** تامەزرۆی گۆشت، تامەزرۆی بینین

---

**تیتڕواسك:** باڵندەیەکە باریك ولاوازە، بەکەسێکی لاوازیش دەگوترێ بەتایبەتی ژنان

---

**تووکەحەرامە** گەندە موو، گوگرە

---

**تەراح:** وەك تەراحێ لێی کەوتییە

---

**ترتڕ پاشا** کوڕی ترتڕ پاشا بۆ سووکایەتی بەکاردێت بۆ ئەوانەی خۆیان بەزل وبەفیز دەزانن

---

**تەمتەمە:** نوکی مزراح.

حیزبێ بێ بیر وبڕوا

تەمتەمەی دا بەحەلوا

(ڕۆستەم حەویزی)

تەمتەمەی نادا بەحەلوا حزبی کوردی کۆڵنەدەر.

موخلیسە بۆ کاك زەعیمی مستەفا بارزانی کورد.

لەئاهەنگێك خوێندیەوە لە کۆیە بەبۆنەی ئیجازە وەرگرتنی پارتی.

---

**تیری قودرەتێ** شمشێری بەهێز وبەتوانا

---

**توخمەسە:** توخمێکی پیسە لەڕەچەڵەکی سەگ

---

**تا سەر بمێنێ قوون عاجباتیان دەبینێ**

---

**تاقانە یان شێتە یان دێوانەیە**

---

**تەپارەی تەڕ ئاگر ناگرێ** (تەپارە-تەپاڵە)، سەرگین

---

**تەشی ڕێس تەشیڕێس بێ، بەکلکی کەریش دەیڕێسێ**

---

**تەقەی سەری دێ، گێی لێ نییە** (گێ-گوێ)، یان تێ ناگا

---

**تەماح سەری نەخۆی، سەرت دەخوات**

---

**تڕ بەرەشکە ڕاناوەستێ**

---

**تا دەڵێ:** پەسیرە ترێ پێدەگا: واتە لارە پەتەیە

---

تـڕی بـڕی: واتـه هـەمووی خـەلاس کـرد، یـان ئەگـەر کەسـێك بەقسـە یـان بـەکردەوە بەسەرکەسێکی دیکەدا زاڵ بێ. دەڵێن تڕی بڕی.

تڕی تڕە،جەواڵ دڕە

تفی سەر بەرەوژووره

تکەتکی ئاو بەرد کون دەکا

تورك تا دۆ شاوەکەی نەڕژێ،نابکاتە خێری (ئیمام حوسێن)، تـورك لەجێیـەك حـوکم بکات نەگیای لێ دەڕوێ، نە ڕۆژی لێ هەڵدێ

توو لەبن دار توو، خڕ دەکرێتەوە

تیر لە کەوان دەرچوو، ناگەڕێتەوە

تێکەشتن لە پراو خواردن خۆشترە (پراو-پلاو)

ترشـاو: گوشـراوی پەسـیرە-کەرەوز+ڕۆن وپیـاز+ بیبـەری تیژ+کـەمێك شـەکر+کەمێك ئاو، ئاوی دنکە هەناری ترشیش هەر ترشاوە

تودڕك: وەك تو وایە بەری دڕکە وتامی خۆش

تازە لەسەری بوویتە مار
(مار: ماڵ)

تێکەولێکە: کڕین وفرۆشتن جۆرە پێکهاتنێك

تا خزمت پەرژێنی نەشکێنێ. بەکەس ناشکێ

تا ڕەجەب سەر پارە بێ حارمان ئەو حارە دەبێ (سـەرپارە: سـەرپاڵە- حـار: حـاڵ) بەمانای سەرۆکی سەپانان دێت

شـــــەوتا: ئـــــەو کەســـــەی بەشـــــەو (تـــــا)ی دێتـــــێ بەشەو دەگری (تا) بەڕۆژ بەردەدا، ماخۆی چارچاوان چ دەرمان دەدا، جاران ئەگـەر کەسـێك بەشـەو تـای بهاتابـە، ژنـان دەچـوونە بـەردەرگای مـاڵی پیـاوی دووژنـە ودەیانگوت: بەشـەو دەگری تـاو بەڕۆژ بەردەدا، ماخۆی چارچاوان چ دەرمـان دەدا. جاری وا هەبوو کابرای دووژنە بەئەنقەست خواردنێکی دەگوت کە دەست نەدەکەوت، بەڵام هەندێك جۆرە خواردنێکیان دەگوت دەست بکەوێ.

تاکەی دانیشم لەبن سێبەری داری بی، تاکەی بکێشم دەردی غەریبی

---

تەقتەق ترۆزی خۆشە

---

تف لەوکەسە کرایە لەسەر قسەی خۆی نەمایە

---

تێرکە: ئەو گونیە سێ لا دوراوەیە کە بەهەردوولا تەنیشتی ولاغدا شۆڕ دەبێتەوە کە لەسەر پشتی دادەنرێت

---

تۆقەرەشکە: وەکو ریشۆڵە گەڵای بن داران خاوێن دەکاتەوە

---

تــا خــاوەن مــاڵ دزی گــرت، تامــاڵخۆ دزی گــرت، دز مــاڵخۆی گــرت دز خاوەن ماڵی گرت.

---

تا ماڵ وەستابێ لە مزگەوت حەرامە

---

تا تەماحکار هەبی ساختەچی پەکی ناکەوێ (عەولا کەچەر)

---

ترخێنە: جۆرە خواردنێکە

---

تەڕەماش: جۆرە خواردنێکە

---

تەپەی لێوە هێنا: بریاری بۆدا، دەستی بەکارەکە کرد

---

ترحێو: بۆ گاڵتەپێکردنی کەسێك یا کارێکی خراپ

---

تاجی ئەدەب لەسەر نێ هەموو جیهان لەبەر نێ

---

تخووب: سنوور

---

تەقەت کردن: هەڵگرتن بە نهێنی

شتەکەی تەقەت کرد

---

تۆقەرە: سەرلوتکە، جێی بەرزە

تۆقەرەی ئاسمان

---

تافتە: پارچە قوماشێکی تەنکە لە شێوەی جورجیەت بۆ جیاکردنەوەی توتن بەکاردەهات لە تۆز وخۆڵەکەی

---

تاخچە: ڕەفتە. تاقێك لەناو دیوار بۆ دانانی فەخفوری وکتاب وشتی بەردەست

---

تفەنگی وی خاریە (خاڵیە-بۆش)ە

بەس دری من وا ناریێ (در: دڵ – ناریێ: ناڵێ)

تەنكەبزە: بەری قەرەقاجە لەشێوەی پاقلەدایە، مالاَت دەیخوات بەساغی دێتە دەرێ بۆی ناشکێ لەکاوێژ، بەو دەلێن تەنکە بزە! نازناوێك لە کۆیە هەیە بەو شێوەیە.

تەتکەبزە: ژنێك مامان بوو کە دەهاتەوە مالّ، شێرزادی دراوسێیان (کە کوردی رۆژهەلاّت بوو)هاواری دەکرد ولێی دەپرسی: ئەرێ پەتکە یان بزە؟ واتا کوڕە یان کچە؟ پاشان مندلاّن بەو مامانەیان دەگوت تەتکەبزە.

ترمبیلچی: شۆفێر

حاجی محەمەد ئەمینی بچکۆل لە سالّی ۱۹۲۹ کەڕێی ترومبێلی بەینی کۆیە وهەولێر کراوە، ترومبێلی کڕی... ترمبیلچیەکەی ناوی (مەمۆ)بوو.

تاخان دەسازێ، لەشکر دەترازێ

تەلای مێردان درەنگ دێتە جۆش

تیتیلە وبیبیلە: بزنۆکە ئاوس بوو دوو فەرخۆلەی بوو ناویان لێنان (تیتیلە وبیبیلە)حیکایەتی مەڕۆکە وبزنۆکە.

تیتیلە وبیبیلەی لەداێ

دەرکەی وەکەن لە دایێ

پڕی گوانانم شیرە

پڕی بن ددانانم گیایێ

حیکایەتی مەڕۆکە وبزنۆکە.

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (۱۱٤)

تەندووڕۆکە: گەمەیەکی مندالاّنەیە، لەنێوان کوڕان وکچان

تەڕی بن بەڕی: گەمەیەك بووە شەوی زستانان لەبەر ئاگردان دەکرا یان لەبەر موغەیری

تەڕکی دەکەی، لە خۆتی رادەکەی (مراك یان کەوچك)ە

تاقە سوار، دام لەدیوار، بووە چل وهەزار (هەنار)ە کە دەیشکێنی

تەترە وهەرترە: تەترە: لەسەر سینی بەباکردنی برنج ونیسك وماش وساوار وگەنم (تەتەلەکردن)

تابا لەو کونەوە بێ، مالّمان لەمە باشتر نابێ

تارەنج نەکێشی، گەنج نانۆشی

---

تاقەنە بێ بەرەکەتە

---

تف بکاتە دەمی مار دەی تۆپێنێ

---

تەڕاو: تێراو، بنەچەکەی (تەڕەندەر)ئاشکرایە تەڕی لە گووتەی (تێروتەڕی)دا هەر خۆیەتی لەم بەیتەی حاجی قادری کۆیی بەدیار داوەتەوە کە دەفەرمووێ:

شەوکەتی جووتەی سمێڵت تاکە مانەنەی کەمە

تەرکەشی تیری تەڕاور شیری دەستی ڕۆستەمە

تەڕار دەکاتەوە تێرأو لەمەوە دیارە (تەڕ+ەندە)

تەڕەندەر واتاکەی چییە کە بەیەکێکی زلەی زەبەللاح

دەگوترێ ئەگەر بێن وشەی (تەڕ)ی نیوە مردوو

زیندوو بکەینەوە بەلابردنی (ەر) لە تەڕەندەر

(تەڕەند) بکەینەوە ناوی بەمەبەستی تێری وخۆشی وپیت وبەرەکەت.

تەڕی بۆ تێرییە.

(زاراوەسازی پێوانە، مەسعوود محەمەد ل١٤٢)

---

تاعوون هات، بە گرانەتای شوکرە

---

تامابووی بڕاندمت، کەمردی تڕاندمت

---

تانەی عەبدی لەعەزابی قەبری ناخۆشترە

---

تڕی بن گۆم بلّق دەکا

---

تفوو لەپیاوی بەدخوو، کچی هەیە نایدا بەشوو

---

تفەنگ لۆ نیشان، ئەسپ لۆمەیدان

لۆ: بۆ

---

تفی بەرەوبا: سەروریشی خۆت دەگریتەوە

---

تۆبەی گورگ، هەر ئەوەندەیە تامەڕدەبینێ

---

تەڕی کەی بەقوونی کەرێ وە دەچی

---

تەماح قوونی بنیادەم دەدڕێنێ.

---

تەلیس: گونیە، جوونی

چەندەها ڕانت دۆشی تێر شیرت نەخوارد

چەندەها مەشکەت ژەن، تامی کەرەت چێشت

بە برسیەتی دەتکرد بەنان، تەلیسە نە ئارد

بە برسیەتی لێت ناسەدان مەنجەڵە چێشت.

(بەرەو لوتکەی ئاوات-خالید دلێر ل٧١)

---

تووز: شێوە وڕوخسار

وەڵا ئەتوو تووزی ناناسی، تووزی دەستەواژەیەکە لە کۆیە بەکاردێت.

(ڕامانی مام- دیداری دوو دۆست گفتوگۆی هۆمەر شێخ مووس لەگەڵ مام جەلال ل١٠٨)

((دەشڵێن تووزی حیزە))

---

تررووکە: لحقە-غمقە عێن

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٢)

---

تیشکی ڕۆژ دەرکەوێ، کوندە بەبۆ کۆر دەبی

---

تڕەکەرەك: تەڕەکەرەکە زوو دەڕوخێ

---

تەق ولباب: لە دەرگا دان

---

تەتکەوپتکە: متو مووری

---

تەڕەتۆرەگە: هەرزانە (تەڕەتۆرەگەی ناگاتێ)

---

تڕن: ناخۆش، قسە تڕنە (قسە ناخۆشە)

---

تۆبزی: بەزۆر، ناچارکردن

---

تەلاش: کۆشش

برسی چ ئاگای لە گوڵ وبەهارە

پێویستی ئینسان ئەخاتە تەلاش

(ڕۆستەم حەوێزی-جوانی ل٨٤)

---

تاو: غاردانێکی زۆر توند (ئەسپەکەی تاودا)

ڕۆژی سێ جاران دەچینە سەر ئاو

بەپاڵە پەستۆ وبەغار وبەتاو

(ڕۆستەم حەوێزی-بەسەرهاتی کۆیە ل١٤٩)

تەکان: پاڵنان، تەکانی دا (پاڵی نا)

تەخمین: قرساندن

تازیە: پرسە

تەغار: یەکەیکی پێوانەیە بۆ گەنم وجۆ بەکاردێت

تۆرەگە: تۆڵەکە. گیایەکە بەهاران دەکرێ بە خواردن

ترماسك: وشیە ترێی گچکە، هێشووی ترێی بچووك

تەوشین: سەر وەل وخورییەکەی مەیلەو شینە

(گوندی قازبەگیان-شێخ ئازاد قازبەگیان ل٦١)

تەو: بەو مەرە دەگوترێت سەروملی زەردە وخورییەکەی سپیە

(گوندی قازبەگیان-شێخ ئازاد قازبەگیان ل٦١)

تفتیلك: کۆترە باریکە

کرۆسکە کێویلکەم خۆش دەوێ

کوکوی تفتیلکم خۆش دەوێ

(حاجیلەکانی دەشتی هاموون-ئازاد دلزار ل١٠٢)

تەیری فەریکان: زەردە وەلی- باڵندەیەکی زەردی باڵ ڕەشە کاتی فەریك بوونی جۆ خۆش وغەمگین دەخوێنێ.

ئاخ بۆ قردێلەکاڵەی

وابە جۆخینی سەرتەوە

دەڵێی تەیری فەریکانە

خۆشی وغەمێکی نادیار

دەخاتە دەڵی خەستەوە

(حاجیلەکانی دەشتی هاموون-ئازاد دلزار ل١٥٣)

تێکۆشە، لێی بنۆشە

تیر دەهاوێ، کەوان دەشارێتەوە

تڕپی تەڕی تێدا نەمایە

---

تڕی بەقەدەر قوونی نییە

---

تڕن تڕن کانوونێ، ئەورۆ خۆشترە لە دوونێ، بەزم هەیە لە قوونێ

---

تڕە تڕی مەکە

---

تڕەکەی تڕ نییە جەواڵدڕە

---

تڕ لەکێ، تەورداس لەکێ

---

تڕ بێ بکەوتە بەردەمی ڕەشەبا

---

تەراش، بۆتە ئاش

---

تانەی دۆست لەتڕی دژمن پیسترە

---

تازە ئەو بابەیان مرد

---

تاجی ئەدەب لەسەرکە، هەموو جیهان لەبەرکە

---

تا من گۆتم بیسمیلا، ئەو گۆتی ئەلحەمدوللا

---

تا کونەکی دەگری هەزار کونی دیکە پەیدا دەبی

---

تۆرە بەتۆرە، قازانجی زۆرە

---

تاژیر بیری کردەوە، شێت لەئاوێ پەڕییەوە

---

تا ئێوارە قەزوان بخۆی بە گوزەك دەتگەمێ

کووز: گوێز

---

تا دوونێ سێوی لاسوورە بوو ئەوڕۆ تەماتەی تەپیوە

---

تا سەری نەبڕیت قسە ناکا (پێنووس–قەڵەم)ە

---

تەنکێش: کەلەکەی لاورگ

---

تا گەورە دەبی، گچکە دەبتەوە (تەمەن)ە

---

تەختی شین، پاشای زێڕین (ئاسمان)ە

---

توو دەیبنی، ئەو ناتبینی، تو قسە دەکەی گێی لێ نییە، ئەو قسە دەکا گێت لێیە

(تەلەفزیۆن)ە

---

ترشه وەك هەنار. ناسكە وەك خەيار (ڕێواس)ە

تاقێكە سی ودووی بەردی تێدایە (دەم وددان)ە

تا لێی نەدەی. دەنگی نایە (دەهۆڵ)ە

تا بیبەخشیت زیاد دەكات (زانست)ە

ترشه وەك دۆیە. خڕە وەك گۆیە (ئەوە لیمۆ)یە

توێكڵی دارە، نیوەی هەزارە، ئەگەر نازانی (هەنارە)

تاجی گوشتین. دوو گوارەی پێوەیە (پۆپینەی كەرەباب،پۆپنەی كەڵەشێر)ی

جگە لەخۆی سینگی بۆ هەموو كەس دەكاتەوە (كتێب)ە

تنۆكە ئاوە، نە لەزەوییە، نە لەئاسمانە (فرمێسك)ە

تەوزیمی: اجباری

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٥)

تەڕن: خائن

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٦)

تەڕنی: خیانە

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٦)

تەرخانكراوەكان: تخصیصات

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٧)

تەبارە: گەنم وجۆ پێش ئەوەی بدوورێتەوە

تارمە: ١. خڕكردنەوەی دەغڵ ودان لەسەر یەك بەباستایەكی زۆر

٢.هەیوان

تەلەسم: تەڵەزم. پارچەی بچووك لەبەرد ودار

بەرەو تەلەسمەكانی نوری ئەو، ناونیشانی شیعرێكی فازیل شەوڕۆیە

(ماچەكانی ئێوارە كازیوە- فازیل شەوڕۆ ل١٣٣)

تێماوە: تێراماوە، حەپەساوە، سەرسام بووە

تێمابوو

پیرۆزبی ئەو ڕۆژە دڵی

بۆچی وا داگرتبوویت؟!

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل٩٢)

---

تیسك: ئەو داوە مووەی مرۆڤ

تیسکەی بەدونیا نادەم

---

تورکمان دەڵێ ئاخیرە باخ، کۆتاییەکەی ببیە

منیش دەڵێم گەر لۆ خراپتر لەپاشتر دەبێ

(د.کەمال مەعروف)

---

تەراد: سوارسوارانێ، واتە غارپێکردنی ماین وئەسپ

(مەحمود شێخانی-دەنگێکی ڕەسەن ون- پ.ی.د.هۆشمەند عەلی مەحمود ل ١١٣)

---

تارمە: هەیوانی سەر دانەپۆشراو

لەبەرتارمەی دانیشت بوو

---

تاتی تاتی رەبی بەخێر هاتی

دایك کە منداڵەکەی فێرە ڕۆشتن دەکات

---

تێزانگ: الرحم

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٧٦)

---

تێهێنانـــەوە: بەســـوودێك دەڵـــێن زەرەرێکـــی پڕکردبێتـــەوە، دەشـــێ لـــەجیاتی (سدالنقص)موازنەالخسارە بەکاربێت، تێهاتنەوە تێ نەپەرپەتی تێهات وەك داهات.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٨٤)

---

تەڕەن: شێدار

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٣٠)

---

تاریکوسەڵات: مەبەست تاریکستانە (تارك الصلاە)ی عەرەب خۆی لێ بار کردووە !

خەلقی دەشتی کۆیێ گوتویەتی بەتاریکو سەلاتیدا هاتم

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٣٣)

---

تاڵوو: بەڕووەکێك دەڵێن پەلك بانی نەرمی لەبەرزرای ئاژەڵ خۆش

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٥١)

---

تەژ: تسمید، تقویە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٢٩)

---

ترشەزێ: ئۆکسجین

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٣٨)

---

تێك هەڵقژان: مشاجرە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٤٥)

---

تێکەولێکە: بریتیەلە تێبکە ولێ بکە، دەگوترێ چی هەبوو تێك ولێکی نا وجێبەجێی دەکرد یاخود شاردییەوە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٤٥)

---

تێکچەسپان: تلاحم

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٧٩)

---

تێکبەستە: متلازم

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٤٨)

---

تاکەمەزن: عاهل

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٢٧)

---

تەشك بەگوو

---

تەواو بووە (واتە روحی دەرچووە)

---

تامی تێدا نەمایە (نەمایە: نەماوە)

---

توخوا ژیان تامی دەمێنێ کە نەوێریت تێدا دەنگی دەروونی خۆت بەرزکەیتەوە

مەسعوودمحەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوودمحەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٣٥)

---

تا گەل کیانی سیاسی نەبێت هێشتا لەپزدانی مێژوودایە ونەبۆتە منداڵی تازە زاو، کەسیش نازانێ ئەو منداڵە مردزاد دەبێ یان بەزیندوویی لەدایك دەبێت

مەسعوودمحەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوودمحەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٦١)

---

تاریکی هۆشی گومڕا گەلێك بەردەوامترە لە ڕۆشنایی هۆشی بینا، جگە لەوەی بوونی ڕووناکی بەدرێژایی ئەزەل وئەبەد دەبێت لێی خەرج کەیت وپێوەی ماندوبیت وبیخوێنیت وتێبینی بکەیت وئیمانی پێ بهێنیت وبەدەردەسەری بیلێیتەوە، کەچی تاریکایی هۆش لەخۆوە زاووزێ دەکات وچ ئەرك ومەسرەفی ناوێت، ئەگەر بەچرای زانست نەیبڕەوێنیتەوە بەبەریەوە هەیە هەموو جیهان بتەنێتەوە

مەسعوودمحەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوودمحەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٤٣)

---

تەجرەبە وئاکامەکانی ڕاستەوخۆ نابنە بیروباوەڕ لە مێشکی ئەو کەسەی پێیانەوە خەریکە، دەشێ مرۆڤی خاوەن تەجرەبەی جۆراوجۆر بروا بەهەڵەترین تەجرەبە بکات

مەسعوودمحەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوودمحەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٣٨)

---

تیسقە وفالیسقە: ئەو شتانەیە کەجاران دەرمانی تفەنگ یان دەمانچەیان لەناو دەکرد

(هەندێ لە هەڵبەست وبەیتەکانی عەلی بەردەشانی-محەمەد تۆفیق ووردی ل١٢٠)

---

تا ئەتوو نەڕۆی، ئەو ناڕوات (سێبەر)ە

---

تەختی شین، پاشای زێڕین (ئاسمان)ە

---

تڕی کەرێی پێ نادەم

---

تەرك: ئەو جێگەی ولاغی کە پاشکۆ و هەگبەی بەسەردا شۆڕدەکرێتەوە

---

تاتەشۆر: بەردێ کە مردووی لەسەر دەشۆرێ ونوێژیشی لەسەر دەکرێ

---

تارازی بوو، بەرد بەکرتك بوو

(کرتك)پارچە

---

تازە کوورەن، هەردەم تووڕەن

---

تازە کە هاتەرشوو، کۆنەپێش کەندوو

تاکونێك دەگرێ سەد کوونی دیکەت تێ دەبی

تا شوو دەکات میرە، کە شووی کرد گزیرە، کەسکی کرد پیرە

تاسەری لەبەری ئەلحەد نەکەوێ، نازانێ جێی ئەسڵێیە ئەوێ

تا مابوو مرادنی، کە مردیش تراندی

تامی، تامی، گەنمە شامی

ترِی ڕۆشتووە، فسەی مایە

(مایە: ماوە)

ترِی بەردەم ڕەشەبا بکەوی

تفی ڕۆوکراو هەناگیرێتەوە

ترپی تەڕی تێدا نەمایە

(نەمایە: نەماوە)

(ترپ: تلّپ)

تەبارە، لەچاواندا رادیارە

تەقەری دڕایە هەر تران دەکەنی

تۆ تەماح مەکە نەفس وناموسی کەس، ئابڕووی خۆت مەبە بۆ هەوا هەوەس.

تازە بدڕە بە هەزاران، کۆنە بدە بە هەژاران.

تەختەکی نوقسانە.

تەنەکەیەك شیر، مسقاڵێك هەوێن بەسە.

تازە بەتازە، سمتی خوارە مەی خوازە

تازە بەنازە، پیرێژن و بیرازە

تەبارە، لەدچاوانرا دیارە

تەشی ناریسم کورکە، مەشکەی ناژینم چرکە، کوڕەکی دەژینم مرکە

(کورك: کولك)

(چرك: چێلك)

(مرك: ملك)

تەونەكەی مەستان، سێ مانگەی زستان

تەونی خاتوونە، تەشی مەیموونە

ترکەن بم گری، فسکەن بەرم دا.

ترِی لەچیای سەفین گەورەتر دەکا.

تووڕەبی، بەگونی مووڕە.

تۆی بڕکەکێن، مێژووی کونەکێن

تیر ئەو تیرەیە، نیشانی بشکێنێ.

تێر بوو، هار بوو

ترش وشیرین: لەدۆشاوی ترێ وسرکەی هەنار دروست دەکرێ وەکو شەربەت پێشکەش بە میوان دەکرێ

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٤٧)

تۆپلی: دەمانچەی تۆپلی وەکو دەمانچەی سمیس وایە یەدەکی نییە وبەتۆپە وحەوت فیشەك دەخوات.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٧٣)

تەقەتەق: دەنگی لەقلەقە

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٩٢)

تەڕەزەن: ئاژەڵی تازە زاوە کە لەو کاتەدا شیری زۆرە

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٩٦)

تۆ وەرە بەخێری گۆڕی مردووان و زیندووان ژەنگی فکری سیاسی بکرێنە لە فکرستانی کورد و خەڵکەکە بهێنە سەر ئیمانێکی خەست و ساف بە کوردایەتی کە بریتییە لە پاراستنی (کینونە) بەر لە هەموو شتێك، حینجەیی کردنەوەی گوتە

فەلسەفییەکان لە دابەشکردنی خەرمانی گەنم و ڕستەی تووتن ماوەیەکی وەهای دەوێ کە چەپڕۆ تێیدا بێئۆقرە ببێت . خۆ ئەو لە سەرەتاوە پەلەیەتی بۆ بینەقاقای هەرچی خوا پێداوە، یان شەیتان پێداوە، یان بە ئەرکی بازووی خۆی ڕەسیوە . لەم پلەیەدا (خۆپارێزی) دواخستن هەڵناگرێ تا ئەو ڕۆژەی لەسەر کونهی فەلسەفەی زاراوەکە چەپ و ڕاست ڕێك دەکەون، کە هەرگیز لە کوردستانی خۆماندا چەپ بە ئارەزووی خۆی و بە قەناعەت، لە باوەڕەکانی سەر بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر و سیاسەتی ستالین وازناهێنێ.

---

تف ببینێ لە زەویدا، پەلاماری دەدا وادەزنی پارەیە.

---

تەیر بە باڵ دەفڕێ، ژن بەمێرد دەخوڕێ.

---

تێ بکۆشە. لێ بنۆشە.

---

تا یارمەتیم دەی قەدرت لەلامە، کەوم لۆ نەگری، پێت نارێم مامە.

---

تانجی دەگرێت، داوای ناموسی لێ دەکات.

---

تەپ لەسەر تەپ، دەستت بە ڕەپ.

(دەستار).

---

تاڵیشە وشیرینیشە.

(زمان).

---

تا نەیبەستی. ناڕوا.

(کەوش وپێڵاو).

---

تەرزە وباران دەبارێ، وای لە گرمە وهۆڕی ساری، لۆ زەوی سواران لە عاسمانێ دێنە خوارێ.

(گرمەی هەورە تریشقە).

---

تەشق: توند وتیژی هەوا

---

توون: جێگای گەرمکردن حەمام

---

تیسك: یان تیسکەخوری وتیسکەموو، یان تیسکە مەرەز.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١١)

---

تیسکن: ئەو مەڕ وبزنەی خوری ومووبیان زۆر درێژە، هەندێك لوولداوە وپێیان دەڵێن مەڕ وبزنی تیسکن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١١)

---

تەکەڵتوو: واتا لاتەنیشتەکانی زینی ئەسپ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨)

---

تەبارە: واتا دەغڵێك، کە دروێنە نەکاربێ، یان دەغڵی بەسەروگوڵ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤١)

---

تێلەکێش: لەیەك کاتدا دوو کار دەکات، لەلایەك سوارەکان هەڵدەگرێتەوە ولەلایەکی دیکەشەوە سوارەکان دەکاتە کوڵ وهەر بەکوڵ دەیباتە سەر جۆخین یان خەرمان.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤٢)

---

تەبارە: پێگەیشتنی دەغڵ ودانە وهێشتا نەدووراوەتەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٣)

---

تەبەق: وەك کۆتك بوو نێرکێکی لەچەق ونێوەڕاستەکەیدا هەبوو و لەسەر نێرکەکە شەرکریان دەشکاندن لەداری توو و گوێز دروستدەکرا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٣٠)

تارمە: هەیوان

---

تاریکە سەلات: زۆر تاریك

---

تاسب: دژ، نەیار

---

تافتە: بێژینگی کون ورد.

---

تاق ولۆق: تاك تاك، تاق وتەنیا

---

تامسار: بێ تام، تام ناخۆش

تام سۆ: ماستی زۆر کوڵاو کە سوتابێ

تاوسۆك: بوکی کانیاو، ناوی جۆرە زیندەوەرێکە رەنگ رەشی پنتك زەردە ولەدەسانتیمەتر درێژتر نابێ.

تای: تەنها بەتای کراسی هات.تای تەرازوو

تەبەش: دەم وچاو سەروسکوت، ڕوخسار.

تەبەکی: مەروبزنێکە لەپێ بکەوی بەهۆی لەوەڕاندنی لەناو قوڕو لم.

تەرواره: رەفتەیەکی داری سێگۆشەییە.

تەرۆك: کەلەکە، کێلەك، تەنکێش، لاتەنیشت.

تەڕاد: گۆشتی خراپی پڕ لە دەمار، چەرم وچەقالتە ودەماری ئاژەڵ، کەدوای کوشتنەوەی ئاژەڵ تێکەڵ بە گۆشتەکەی دەکرێت.

تەشەبوز: تکاکردن، پاڕانەوە تەکلیف کردن.

تەشك: ١. پارچە بەڕە یا لباد.٢.تەشك ودامەن، دامەنی جل وبەرگ.

تەقەت: شاردنەوە

تەقەوڕەپە: دەنگە دەنگ، جێیەکی بێ تەقەو ڕەقەیە واتا ئارامە.

تەقولبان: زەنگی دەرگای کۆن، لەبەرئەوەی دەرگا داربووە لەتەقولبابەوە هاتووە.

تەقیلە: شتی زۆر تەنك

تەگبەند: جۆرە قایشێکی پانە.

تەمۆخ: تاوێر، جۆرە بەردێکە لە ئەنجامی یەکگرتنی لم دروست بووە، لەکاتی بەکارهێنانی هەردەوەرێ وبەکەڵك دیوار دروستکردن نایەت.

تەندوربان: ژورێکە تایبەت بە ئەستوك بە تەندوورێ پێوەدان تەندوور وەك نانکردن لەناندین.

تەنکەڕدێن: درێژنەکردنی ڕدێن، هێشتنەوەی ڕدێن بەکەمی.

تەنگەگرتن: توڕەکردن، وڵاخ کە تەنگەی دەبەستن بۆ بار توندکردن بەماناشەوە دێت تەنگەی گرت

تەوس: پلار.تانە ولۆمە.

---

تەی: جۆرە مەڕێکی دەم وچاو بۆرە.

---

تەیان: ١. بنەوەی هەر شتێك. ٢ دەستپێکردنی لە غەمی کارێزە لە سەرچاوەوە.

---

ترەکی: زا،بێچووی بوو، تایبەت بەسەگ وتاژی وگورگ وکەمتیار وتورگو ڕێوی، ئەو سەگە ترەکی و چەند گوجیلەی مینا.

---

ترپ: ترپی تەڕی تێدا نییە، خڵت.

---

ترِی بڕی: لێی بردەوە، پیکای، پەکی خست، باشی جێبەجێ کرد.

---

تفر: ئەو توێکڵە تەنکەی لەسەر پێستە.

---

تلیش: پارچە بەردی تیژ، شاخی تیژ. دڕانی کراس.

---

توخمەسە: لەسەی بە پاش کەوتوو، لە نەوەی سەگ.

---

تورایتەوە: توڵخایتەوە.

---

تورت: نەزۆر شل بێ نەزۆر ڕەق

---

توز: دەم وچاو، بچم، غیرەت.

---

تی: لایەك

---

تیش: ئەو بەرزاییانەی کە لە شێوەی چیادان وکەوتوونەتە دامێنی چیاکان، بەرزایی تیژ.

---

تی کردنەوە: لارکردنەوە، جیاکردنەوەی کەسێك لە چەند کەسێك بۆ ئەوەی قسەکی نهێنی پێ ڕابگەیەنێ.

---

تیلەقە: گازەرەی پشت.

---

تێز: تیژڕەو، وەکی تێزی تیرێ یە.

---

تێکەولێکە: سەوداکردن، پیلەوەران.

---

تێك چەقی: مرۆڤی چوارشانە. قەڵە وبەخۆوە.

---

تێمایە: سەری سوڕماوە

---

**تێومرێخ:** ئەو بەنانەن کە بەناو ڕایەڵەکانی ئاسۆیی چنراوەکەدا دەبەن، دواتر بەڕنۆك دەیبەستن.

---

**تێی تەقاند:** هەڵات، ڕای کرد، ڕۆیی بەخێرایی.

---

**تەرخە:** چەند پەلکە تووتنێکی وشکی پێکەوەنووساو یان چەند گەڵایەکی بەیەکەوە نووساون.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٣٩)

---

**تووترك:** جۆرە دارێکە ولەدەم ئاوان شێن دەبێت، زۆر پڕ ودڕکاوییە وبەرەکەشی زۆر خۆش وبەتامە ولەدەورەی باخچەی دەیچێنن و وەك شورەی لێدێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٧)

---

**تەژە:** ناوی جۆرە دارێکە بۆ سەری خانی بەکاردێ.

تەژە لە شەقڵە ئەستوورترە وبەزۆری لەداربەڕوو ودارمازی دروستدەکرێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٨)

---

**تفەنگێ‌حوسکە:** زۆر کۆنە وکاتی خۆی تفەنگێکی کاریگەربوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٩٠)

---

**تەڕەبیرۆ:** نەخۆشییەکی پێستی بوو لە دەست وڕوومەتی مرۆڤ دەهات ودەرمانەکەشی شە ومازی بوو

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٥)

---

**تەمۆخ:** لە کوردستان لە هەندێك شوێندا تیوەرە تەمۆخ هەیە وەك ناوچەکانی دەشتی کۆیە، تەمۆخ بەرد نییە ولمی بەیەکەوە نووساوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٤

---

**تیش:** لە شێوەی لووتکەشاخە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٥)

---

تاس: ئەو تاسە یەك پارچە زێر یان زیو بوو، قوبەیەکی قیت لەنێوەندی تاسەکەدا هەبوو، لەکڵاوی دەدروا، لەنێو گۆرانیی کوردیشدا جێگەی هەیە بەناوی سەر بەتاسی خۆشناوان.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٥)

---

تا بەسەرمدا، نەهات ورد+بەکەس باوەڕم نەکرد.

---

تا چرا بێ، نووریش هەیە.

---

تا دڵ، نەکا کەف وکوڵ+چاو نارێژێ ئاوەکوڵ.

---

تاژیر دەبین، پیر دەبین.

---

تا کچ نەکا چاوبڕکێ+کوڕ کەی دێتە هەڵپەڕکێ؟.

---

تا کون مابێ لەدیوار+مشك دەردێن بەقەتار.

---

تا گەیشت بە نانی+گەیشت بە گیانی.

---

تا ما، مری+نەما، تری.

---

تا مرد، جل شڕبوو+کەمرد، لای پڕبوو.

---

تا مرۆڤ نانی جۆیە+هێمن ولەسەرخۆیە.

---

تامەلە نەزانێك دەخنکێ، سەد مەلەوان دەخنکێن.

---

تا نانت چەورە، خزمت لەدەورە.

---

تا نەچێتە ئاو، فێرە مەلە نابێ.

---

تا نەکەیتە سەختی+یاد ناکەی لە خۆشبەختی.

---

تا نەکەی سالاّ+نابێتە مەلاّ

---

تا، بەڕوو زۆر بێ، سمۆرە برسیەتی.

---

تازە ئەو بابەی مرد.

---

**تازە هات+کۆنە دەکرێ بە خەڵات.**

**تازە هاتەڕوو+کۆنە کەوتە پاڵ کەندوو.**

**تاقی کردنەوە هیچی تێناچێ.**

**تانەی ژن+پیسترە لە تانەی دژمن.**

**تاوانکار، لەپاڵ یارە+بێتاوان لەپای دارە.**

**تاوێ غافڵی+سەد تاو ماتڵی.**

**تاوێ گەشم+سەد تاو ڕەشم.**

**ترێ پێگەیی+ ڕێوی خێرا گەیی.**

**ترێ لەسەر دار+هەنجیر لەناوبار.**

**تفەنگ لەگەڵ فیشەکا کار دەکات.**

**تفەنگێکی ڕەق وڕووت+بەبێ گوللە وبێ باروت.**

**توند ڕێکەوی+ لەپێ دەکەوی.**

**توورەکەی سواڵکەر هەرگیز پڕنابێ.**

**توولەی لێ بووە بە تانجی.**

**تووڕە، کەم تەمەنە.**

**تۆز ودووکەڵ+ بگەنە هەوەریش هەر بێ نرخن.**

**تەپ وتۆزێکی کرد.**

**تەگبیرکەر نەمرێ+جێی کاسب دەگرێ.**

**تەماع، نەخنکێت، دەمانخنکێنێ.**

**تەماع وحورمەت پێکەوە ناژین.**

**تەممەڵ وبێعار+بدەنە بەردار.**

**تەمەن گەییە چل+بەدەن دەبێ شل.**

**تەمەنی پیرەمەرێکی ماوە.**

**تەمەڵە وبەگێچەڵە.**

تەنیابالْ، دێر دەبێتە مالْ.

تەور، کلکی خۆی نابڕێتەوە.

تەڕپۆش بە و تەڕنۆش بە.

تیر بدات لە بالْم+نەك پیر بخەوێ لەپالْم.

تیری داوە لە نیشان.

تیکە، شەش بێ وخۆش بێ.

تیکەی گەرم وداخ، دەم دەسووتێنێ.

تیکەی نەرم، بۆ پیری باشە.

تیکەیەك، نابێتە ژەم+کەم دەکا خەم وماتەم.

تینوو، لەخەوا، بەفراو دەبینێ.

تێبکۆشە وتێر بنۆشە.

تێرنەخواردن، لەباوك مردن خراپترە.

تێر ونیوەتێر، هر لە گەرمەسێر

تێرمکە وتێرم لێدە.

تێری خورادووە وسەڕی هاتووە

تێشکاو، لەگەلْ خۆیا شەڕ دەکا

تێشکاو، کەسی نییە.

تێکە،سەبیل، گوێ مەدە بە فیل

تەبیعەتی کشمیشییە.

تەرازوو شەرمی لە کەس نییە

تەرك لەبن بەرەیدا ناشاردرێتەوە.

تێری خواردیە لەو کاسە، دری ناکا وەسواسە.

تاژی قوباد بەگییە، لەوەختی ڕاودا گووی دێ.

تەراش بە ئاشە.

تەقەی سەری دێ.

تەقەی لێ هەستاند

تەماع، لەسەری نەدەی، لەسەرت دەدا.

تەمبەڵی بەغدایە. کەس نانی نەدایە.

تێر عومر نەبێ.

توبی خودا، چاوێکم لێ بترووکێنە.

توخنی ناکەوێ

تۆ میر ومن میر. کێ بکەین بە گزیر؟

تایەك کەوش وتایەك کەراش، ماندوو نەبی مام تەڕەماش.

تڕ بێ ولە قوونی کەرێ بێتە دەرێ.

تڕ پارە ناکات.

تڕەکەی تڕ نییە

تڕی ئاخری لێدا

تڕی بەقەدەر قوونی خۆت بکە.

تروسکەیەکی چاو. لەسەد گۆچان چاکترە.

تا نەدەی ڕەنج. ناگەی بە گەنج.

تا نەمرم قەدرم نازانن.

تازە ئەو بابەی مرد.

تازە هاتە ڕوو. کۆنە نرایە پشت کەندوو.

تا ئارەق نەڕێژی. خۆشی ناچێژی.

تا جێی ڕم نەکەیتەوە، مەیچەقێنە.

تا جێی سنگ نەکەیتەوە، دای مەکوتە.

تا چیایەك نەڕووخێ، کەندەك پڕ نابێتەوە.

تا خوا حەزکا

تا شیرەی شەبەق.

تا شوان لەبەر مەڕی نەیەتەوە، نانی نادەنێ.

تڕ چی داوە لە تەورداس؟

تا کچی میری، کەشووت کرد گزیزی. کە مندارت بوو پیری.

تەبارە، لە چاوانی دیارە.

تەنبەڵی بەغدایە، ڕازی بوو بە کایە. ئەویشیان نەدایە.

تەشگەبەڕ نابیتە پۆست، دوژمن نابیتە دۆست.

تەگەرەی تێخست.

تڕە لە تەوراسی چی؟ هەمزە لە هەباسی چی؟

تا گەنج بوو چزاندمی، کەپیر بوو تڕاندمی.

تا گوو نەکا، نازانێ قوونی لە کوێ یە.

تا ئارەق نەڕێژی، خۆشی ناچێژی

تا نەدەی ڕەنج، ناگەی بە گەنج

تەنیا خۆر هاوڕێی شەیتانە.

تیکەیەك کەمتر، برایەك زۆرتر

تەگبیر کەر نەمرێ، فرمانکەر بمرێ.

تاوانبارە، چاوی خوارە.

تازەی بدڕی هەزاران، کۆنەی بدە وەهەژاران.

تیر لۆ تیرئەنداز، کەو لۆ کەوباز

تووکی قوونیشی سپی بووە.

تەشی ڕێس تەشی ڕێس بێت. بەکلکی کەریش دەیڕێسێ.

تەماشای ئاسمان کە، جا قسان بکە.

تۆڵەی شیری بە شیری، تۆڵەی کیری بە کیری.

تا من وتم بیسمیللا، ئەو وتی ئەلحەمدولیلا.

تڕ له حه‌مامی ودرۆ له غه‌ریبی.

ته‌خته وپنه وقیمه‌کێش، هه‌رکه‌وتین قه‌وم وخوێش.

تا فه‌رز وه‌ستابی، سوننه‌ت حه‌رامه.

تا کونێك ده‌گری، سه‌د کونی دی په‌یدا ده‌بێ.

تێرنه‌خواردن له باب مردن ناخۆشتره.

تاوێك ده‌گه‌شێمه‌وه، تاوێك ده‌تویێمه‌وه.

تاوێك گه‌ش ده‌بمه‌وه، تاوێك ڕه‌ش ده‌بمه‌وه.

تۆره‌ی شیری به شیری،

تۆره‌ی کیری به کیری.

(تۆره: تۆڵه)

ته‌قه‌ی سه‌ری دێ.

تڕ به قونیه‌وه ناوه‌ستێ.

تڕی به‌قه‌ده‌ر قوونی خۆت بکه.

تڕ بێ وبه‌ده‌م با که‌وێ

تڕ، له ورگی پڕ.

ته‌نه‌که‌یان به کلکیه‌وه خست.

تڕی به قه‌ده‌ر قوونی خۆت بکه‌نه.

تۆپینی که‌ر، زه‌ماوه‌ندی سه‌یه.

تۆڕی: به‌ڕه‌ێلا

تێ ڕاخۆڕین: هه‌ڕه‌شه‌کردن

تووکی گرژه: واته نه‌بووه ونه‌داره.

ته‌یری بێ دانه و ئاوه، کۆلاره‌ی بار شکاوم.

(بار: باڵ)

تاوان بار نیشتیه به لای یاره‌وه،

بە تاوان سەری وا بە دارەوە.

تیغی ئەوەندە نابڕێ.

---

تا بەری دەست ڕەش نە بێ، تامی دەم خۆش نابێ.

---

تا نەمرم قەدرم نازانن.

---

تڕ لە حەمامی و درۆ لە غەریبی

---

تاژی قوباد بە گییە، لە وەختی ڕاو دە گووی دێ.

---

تاژی ورات، بە کەروێشکی ورات دەست دەکرێ.

---

تازە هاتە ڕوو، کەونەچوو، لۆ پشت کەندوو.

(کەونە: کۆنە، لۆ: بۆ)

---

تەبیعەت بە نەسیحەت نیە.

---

تەونێ کەوتە دار، ئاخری دێتە خوار.

---

تێکەشتن لە مێووژە ڕەشکەی خوشترە.

---

تا بەڕوو زۆر بێ، سمۆرە برسیترە

---

تێ شکاوە لە کاکلان،

تێ دەرهینتەوە لە توێکلان.

---

تا وەختێ من بووم سەر پەڕی سەوزە نە

ئەتوو لە کێ بووی کەندووە کۆنە؟

(کێ: کوێ)

---

تەماشای هەنجیران دەکا وهەنار دەپچڕێنی.

(خێل)

---

تاتووک: تاتەبەرد، یەکێکە لە گوندەکانی کۆیە (تاتووکان).

---



# ج

جێوار: جێ هەوار، کۆنە هەوار

---

جێ چارە: جێی ئومێد

---

جەڕکە: گ ، د

مێژووی کۆنە تایەر حەوێزی ل١٥١ بۆمبای بەردەداوە، ئی گەورە وەك جەڕکان وئی گچکە وەك کەللە شەکران بوو

---

جغز: غیرەت پیاوەتی، دەڵێن بێ جغزە یان جغزی تێدا نییە، بە مانای بازنەش دێ (دائرە) جغزەکی کێشا، چغز: دائرە (یاری چغزانێ) کە فەقێیەکان دەیانکرد

جغز: بەو تای عاسێ کردنی نێوان دوو تەختە دێت

بڕوا بکە ... کورد خستراینە ناو جغزێ

قەومی کو ... یان تێکردوە وەك مێگەل لەناو هۆزێ

(ڕۆستەم حەوێزی–سەری ساڵی ١٩٩٧ ل١٩٦)

---

جیقنە: ڕیقنە، مریشك هێلکەش دەکا وجیقنەش دەکا

هێلکەی ک اس ڕەشێ

جیقنەی ... بەهەشێ

(شەوچەرە ٢٨ تایەر حەوێزی)

---

جیاز: ئەو کەلوپەلەی بووك کە لەگەڵ خۆی دەیبات

کچی بێ جیازی، قیمەی بێ پیازی

بێ جیاز و ... ەیی دەیدا بەشوو

لەم هەموو کوردانە داخوازی نەبوو

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل٢٠٦)

---

جرەو: لغاو جڵەو

جرەوی ئەسپەکەی بۆ گرت.

---

جی فیلقانێ: پانکردنەوە، فلیقانەوە: تلوقانەوە

پێفلقانێ: ئەو قۆرتانەی لاقی لەسەر دادەنێی بۆ چونە ناو بیر

وهاتنه دەرەوە، وەیا لاقی بدەیە بەر لاقی لەکاتی شەڕ.

دەڵێ: پێفلیقانەکی دایە ولەعاردی دا.

---

جفارە خۆران جفارەیان تەرك دەكرد، لامێژان لێ نەدەگەڕان

---

جۆخینی خۆت، دۆخینی خۆت. جۆخین: خەرمان

---

جێی مست پێ لەقەیە

---

جێیەك خۆشە، حاكم وحەكیمی لێ بێ

---

جدەو: ولاخی برینداربوو، پشت بریندار

لەگەڵ ئەم ئاهووە دێ ئەم سەگی ڕێش كۆن ونوێ

دێتەسۆ دێتەوە سووڕێشی كە كەونە جدەوە

(حاجی قادری كۆیی ل١٣٦)

(ڕێش: بڕین)

---

جگسز: جنێوێكی توركییە، زۆڵ. بیژی، بیژوو

---

جینگەنە: نەسەلمێن، كەم ئارام وتوڕە وتەنگاو كەزوو هەڵبچێ (بێ تەبیعەت)، جیكڵدانە تەنگ، قیسكەتەنگ

جینگەنەی ئێرە باو جودی كەڕن

هەروەكو دۆمی ئێمە دەربەدەرن

(دیوانی حاجی قادری كۆیی ل٢٦٤)

---

جل بڕۆكە: هێلكە وئاوی تەماتە تێكەڵ بكرێت (جۆرە خواردنێكە)

---

جێی خۆی نەكردبێتەوە

---

جووتیار عەرد ناسە، سار ناس نییە

(عەرد-زەوی-سار-ساڵ)

---

جۆت وگایان گۆتییە

---

جووتیار جۆتت بەدربێ، دارەكەی دارقەنەفربێ (جۆت-جووت) در-دڵ. قەنەفڕ-مێخەك

---

جێگای هێستری سۆرە، لێیان بەستەوە كەری كۆرە

---

جاشکی کورکن. گۆلکی ورگن، منداڵی چڵمن، پەسندن

---

زورج: پەنیری بەهاران کە ورد ورد دەکەیت ئاوی گەرمی تێ دەکەن و وەك بنیشتی لێ دێت. زورج خواردنێکە لە پەنیر وخورما لەسەر ئاگر گەرم دەکرێ

---

جەسور: ئازا. بەغیرەت، رەشید، چاونەترس، بوێر، جوامێر

---

جاڕدان: بانگ راهێشتن

---

جێی خۆی گرتییە: شوێنی خۆی گرتووە، (م.ت.پ) چووبوە کن ژنەکەی لە پشتەوە بۆی تێ خستبوو، ژنەکە گوتبوو ئەوێ نییە، (م.ت.پ) فەرقی چییە جێی خۆی گرتییە

---

جا وەرە چاکەی لەگەڵ کرمانجی بکە.

---

جینگوڕ: هەر خەریکی پەڕۆ و پاتاڵ و کۆنە لەنگەیە، بزگوریشی پێ دەڵێن

---

جۆت جۆت دەگری باینجان (جۆت جۆت-دوو دوو)

---

جووڕە: تەیرێکە لە بابەتی سۆفیلکە، واتە کلاوکوڕە

---

جەبەڕووت: هێز و زەبر، زۆردار، حاجی قادری کۆیی ل.٦

جەبەڕووتی کەشکا دڵ لە حوزووری مەلەکووت

هاتە ئەم عالەمی ناسووتە غەریبێکی نەسووت

هەرچی لەو لاوە نەیێ من لەوێ نایناسمەوە

ئەوی ناسیوتە مەئموورە بە ئەمری جەبەڕووت

---

جوانی: جگە لە جوانی بە مانای گەنجی دێت-جوانووی ماین، نۆماشی پێ دەڵێن

جەوانی وەك جوانی کەوتە داوی

لغاوی ریشیە زینی رەوانە

(حاجی قادری کۆیی ل.١٢٨)

---

جۆرەشکە مەبەست لە دامێنی ئافرەت بووە، کۆچەریان بە بارە گۆیژ (گێوژ) دەهاتن، بە منداڵی دەیانگوت جۆرەشکەت پێیە، ئەویش دەیزانی دەیگوت دایکت هەیەتی

---

جگ: گۆیەکە لەسەر هێسك -جگ سی -جگ حین، هێسکی ئانیشك وچۆك (ئەژنۆ)

---

جگجگانێ: منالان یاری پێ دەکەن کە پارچە ئێسقانی ئاژەڵە

---

جەویە-جەوی: ئەو رشانەوەیە بۆ قۆخ و قەیسی دەردە، وەك پەنیر وایە
خۆخ بۆ زەد دەمری ئەوەندە جەویە دەردەکە.
جەوی دەردەکا بە فەساد دەچی" ل.٢٦ بیرەوەری مەلای گەورە
جەوی بەواتای مقەستی مەڕ بڕینەوەش دێت.

---

جەماعەتێکی ڕووتوقووت، خڕبوونەوە لەسەر زگی ڕووت، تڕیان ناشکێ بە مێکوت.

---

جەڕبادان: تاقیکردنەوە، دەڵێ: بیجەڕێنە، جەربادەر: دەرنەفیز

---

جەڕمەنی: ئەڵمانی: دەیانگوت قوماشی چاکە جەڕمەنییە

---

جەڕوی مل باریك، لۆ ژنی قەد باریك

---

جووت وگا لەبەر بەرازی تەرك ناکرێ

---

جاجم: ئەو پارچە قوماشە لە خوریی چنراو ڕەنگاوڕەنگە کە جاران لە جیاتی بەتانی بەکار دەهات وەك پێخەف
جۆرە پۆشاکێکە لەسەر لێفەوە بە خۆدا دەدرا بۆ نووستن

---

جاشك : جاشکە کەر

---

جەلاتین: نایلۆن

---

جنجر: بەلەك، جنجڕ جنجڕە

---

جیکن: دەنگ دەرنەهاتوو

---

جنگز: نەسەلمێن و تووڕە و تووش، لە خۆرانکولکار

---

جگەرسۆز: دڵسۆز، بە پەرۆش

---

جفارە: جگەرە

---

جورنە: حەوزی ئاوی حەمام بۆ ئاو بەخۆدا کردن

---

جاویدان: نەمر، زیندوو

---

جەردە: ڕێگر، ئەشقیا

---

جەنجەڕ: جۆرە ئامێرێکە پەڕەی ئاسنی پێوە بوو بۆ گەنم وجۆ کوتان

---

جۆڕکە: ئەو تورەکەی کاوجۆی تێدەکرێ ودەکرێتە ملی ولاغ

---

جادوو: نوشته، سحر (دەخیل ئەی چاوی جادوگەر بفەرمو مەردومان یەکسەر) (حاجی قادری کۆیی)

---

جسن: رەسەن، پەسەند، باش

---

جڕو جانەوەر: حشرات، کلۆ، سیسرکە، قالۆنچە، کرم، مار ودوپشك، ورە، مارمیلۆق

---

جابولقا: شارێکی ئەفسانەییە لە حیکایەتان ناوی دەهات

---

جێ نەزەرگە: شوێنێکی پیرۆز لای موسڵمانان وەکو جێ نەزەرگەی پێغەمبەر یا ئیمام علی: ژن دەچن لەوێ دوعا دەکەن

---

جەماوەر: خەڵك، عالەم، حەشامات

---

جما: بۆ مەمك بەکاردێ کە شیر فیچقە دەکا ودێتە دەرێ. دەڵێ: مەمکم جما وەروا شیری لەبەر دەڕوا خێرا منداڵەکە بێنن با بیمژی وخەسار نەبی، بۆ کۆبوونەوە وقەرەباڵغیش بەکاردێ، دەڵێن خەڵکەکە جما بوو

---

جەمەدانی: جامانە

---

جنجرۆك: چنگی دڕی دڕندە وباڵندە ومرۆڤ

جنجرۆکێکی لی دام

---

جڕوجامشت: دەستوپێی دەسەڵاتداران ولێپرسراوان

---

جێی سمتی کەرێیە

ئیشەکە هی نەسمەرێیە

---

جمی: جولا-هێرشی کرد

تا همدادی خالد پاشا بدات لە شکری ئێران بەرەو بەغدا جمی بەتالان کردن وکوشتنی عالەمەکە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل٢٧)

---

جینگ برینج: کرەکەی سەرەوە لەسەرتی بنەوە دادەنێت ئاستەکەی بنەوە سەرەکی دەچێتە ناو کونی ئاستەکەی ناو گەلۆمەکەی (جینگ برینجی پێدە گوترێ) لە ساڵی ١٩٢٤ م.حاجی کاکەمین مام خدری مەکینەی ئاشی ئاگری هێنا کۆیە ئەهلی شاری برنج وباراش وبروش وگەنمە کوتای پێ لێ دەکەن.

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٦٥)

جامی مینا بەند، ئاونی دوو ڕەنگە، بەساردی شلە بە گەرمی توندە (هێلکە)یە

جاڕدان: اعلان

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٠)

جێماو: متخلف، دواکەوتوو

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٤)

جوان بێژی: بدیع

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٤)

جوانە ماینەکی جاشی، بارەکەی تایەکی پووش بێ وتایەکی بەردە ئاشی، هەر باشترە لە دۆستێکی ناشی

جیقردانە: چیکڵدانە

جیقردانەی تەسکە (بێ سەبرە)

جرت وفرت: بزێو وعەجول

جل خوار: جاش، خۆفرۆش

نابینی پیاوان لە مەیدان بەغەیری جل خوار

هەر ئەوانیش دەبنە خاوەن پارە وکۆشك وتەلار

(ڕۆستەم حەویزی-سەکەوتن ل١٧٨)

جێیەك ژن لێی حاکم بێ شەیتان نۆکەرە

جوتیار زەوی کێڵاوە

ئاغا جەرگی بڕاوە

جێی سەر بکەنەوە خوا کەریمە لۆ لاقی

جووت بۆ گا جووتە، نەك لە بۆ (سەی)سەر رووتە

جوچکە لە کۆتایی پایز حساب دەکرێت

جوان لەبەرچاو تێری لێ دەخۆی، کەشاردرایەوە شێت دەبن لۆی

لۆی: بۆی

جوابی سەلام عەلەیکوم سەلامە

**جفارە دەکێشێ، نەبەدەستی دەگیرێ، نەبەزار**

**(لوولەی سۆبەی داران)ە**

---

**جامی تەنگ، ئاوی دوو ڕەنگ**

**(هێلکە)یە**

---

**جامێك هەیە دوو ئاوی تێدایە،**

**سەروبنەشی نکەی لێی دەرنایە**

**(هێلکە)یە**

---

**جووتەنی:** زوجی

**(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٥٩)**

---

**جلە: اخگبوگ**

**(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٠)**

---

**جامبێزار: جۆرێ تفەنگ بووە. تفەنگی قەسەڵی-یش هەبووە.**

**(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)**

---

**جوایەز:** جیاواز

**(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)**

---

**جینگل: تووڕە وتەنگاو نەسەلمێن**

---

**جاری گرین:** **جارەکەی دیکە دەیزانین**

---

**جەقنێتەوە:** کەم دەکا

---

**جترشت: سورەتێکی ئاڤێستایی یە باسی دروست بوونی بونەوەر دەکا**

---

**جوانی ئاشتی. لەتروسکایی ڕاستییەکان سەر دەردێنێ**

**(د.کەمال مەعروف)**

---

**جاڕ: خۆی بەزەوییەك دەگوترێ بژار غەڵەبی لێکردبێ وبڕشتی پێنەهێشت بێ دەگوترێ (سرنجاڕ،فریزجاڕ،نێرگزجاڕ، توونتجاڕ)بۆ (تەماتەجار، پەمۆجاڕ، شێلجاڕ)بێت**

**(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٣٦)**

---

**جنێودان نیشانەی سووکایەتی ئەو کەسەیە جنێودەدا**

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٥)

---

جەگەن: جۆرە گیایەکە حەسیری لێ دروست دەکرێ لە کۆیە نازناوێك هەیە بەناوی (جەگەن)

---

جلوبەرگ نەتکاتە دوو، دەتکا بەیەکێ لەسەرووی هەموو

---

جەنگیز خانیش وڵاتی گرت و وەك بروسکە کەوتە گیانی خەڵك، بەڵام هەر چونکە قورئانی نەبوو بێ سەروشوێن مایەوە ونەتەوەکانی لە قورئاندا توانەوە، بیریار چەندێکی دژی غەیب وئەفسانە بێ ناشێ خۆی گێل بکات چاو لەو دیاردەی بێ پێشنەی (محەمەد وقورئان)بچووقێنێ.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ١٢٩)

---

جارێ بابڵێم من (دۆینەی بەکەشك)م لەگەڵ ڕۆنی بی حیساب پێ خۆشە نەك داندۆك، لەشوێنەواری خۆم قوبلی برنجی گردەی کوردیی جێنوێن وبەر ڕوباری شۆران لەپژدەر وهێدی شوێنی شارەزوور بەڕۆنی مەڕ لەگەڵ گۆشتی مریشکی تازە هێلکە کوردی قەڵەو دەیان گیسکی پەرێز خواردوو ووەبابەرخی نەبڕایەوە کە گۆشتاوەکەیان دڵمی بەقوبڵییەکەدابێت شای هەموو خواردنێکە!.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ٢٣٠ -٢٣٣)

---

جۆی دیتیە، کا ناخوات.

---

جاسووس لە دەییووس خراپترە.

---

جەماعەت وڕەحمەت.

---

جوانیمان ڕۆیی وپیری هاتە پێش، ئەعزای بەدەنم هەمووی کەوتە ئێش.

---

جێی قوونی خۆی نابیتەوە

---

جاری وا هەیە، هەراتن ئازاییەتی یە

---

جاشکیش کوڕی کەرێیە

---

جوابی دوور درۆیە، هەرقسەو گفتوگۆیە

---

جوانی خێرو خۆشییە، پیری توند و تووشییە

---

جوانی ژنی زەردەخەنەیە، جوانی پیاوی گفتوگۆی شیرینە

---

جوانی ژنێ لەبەرچاوانە، حەیاو ناموسی لە بەر درانە

---

جوانی گەرم و گوڕە، پیری ساردوسڕە

---

جوولەکەش نەبی، شەموو دادنێت

---

جۆ لە جۆخینی خۆت، کا لە کادینی خۆت

---

جۆلە جۆخینی خۆت، کوڕ لەدۆخینی خۆت

---

جێی ڕیەکی، پێوە دەکات عەربەکی

---

جوولەکەیەکی خواناس، چاکترە لەهەزاری بەد خواست و بیٚ ئەساس.

---

جێگاکەی باشە. خۆی تەڕە ماشە .

---

جووتە: وەشاندنی هەردووک قاچی دواوەی وڵاخ بۆ کاتی شەڕ یان بۆ خۆ پاراستن لە گورگ ودڕندەکانی تر.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٤)

---

جەنە: مانگرتن

ئەو کارە بەزۆری گویٚ درێژ دەیکات هەر چەنە هەوڵی لەگەڵ بدەی ناڕوات کە جەنەی گرت.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٤)

---

جریوە: دەنگی چۆلەکەیە

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٩٢)

---

جاران بۆ پاراستنی مەڕومالاٚتی تاربوو، کەشەوی بە دوادا دێت و خەتەری خۆران و قۆتانی پەیدا دەبیٚ، سوورەتی (والشمس و چحاها) یان دەخوێند و فوویان لە

ئەوروبەر دەکرد . ئیتر لە شێوەی گەپ و شۆخی، فەقێ و موستەعیدی قۆشمە دوای یەك دوو ئایەتی سوورەتەکە کوردانە لێیان زیاد دەکرد و دەیانگوت (چزی دووپشك رقباها، چاوی گورگ و کۆرباها .....

---

جیهانی جانەوەر بریتییە لە قەسابخانە . بە زۆری هەرە زۆر دەسەلاتداری بە گۆشتی بێدەسەلاتان یان کەمتر دەسەلات خۆی و بەچکەکانی دەژیێنێ

---

جلك ڕەنگ وڕووە، خواردن گەن وگووە

---

جەرگ کە نەبوو سیپەلاق چییە، غیرەت پیویستە چەك شتێك نییە.

---

جلقێ دات بەکێ، دام بە فلقێ، فلقێ دات بەکێ، دام بە جلقێ.

---

جەو: شوێنی بێ ئاو وشك وبرینگ- شوێنێك کە شێی تەڕی تێدا نەبێ دەڵێن وشك وبرینگە

---

جەماعەت جەمە

هەرتۆمان کەمە

---

جووجکەی بن سەبەتێ

دەمرێ بەوێ خەفەتێ.

---

جێیەك داوەبارن، هیچ مەسرەفی لێ ناکات

(خەون وخەیاڵ)ە

---

جاش پۆلیس: بەو شەڕکەرە چەکدارانە دەڵێن کە لەخێڵەکانی کورد دەگیران، حکومەتی بۆگەنی پێشوو بۆ لەناوبردنی بارزانیان خێڵەکانی دەوروپشتی چەکدارکردوە مانگانەشی بۆ دەبڕیتەوە بەواتە دەڵێن (جاش پۆلیس)

(چوونی بارزانیانی قارەمان بۆ سۆڤیەت/محەمەد تۆفیق ووردی ل٩)

---

جاش: بەچکەکەر، پیاوێ ژن بە وادەمارە دەکا وکرێ دەستێنێ، بریتییەلە خۆفرۆش بە داگیرکەرانی وڵات.

(عەزیزی مەلا ڕەش، هەنبانە بۆرینەم داواد، گۆڤاری ڕامان ژمارە (٦٧) لە ٢٠٠٢/١/٥) ل٩)

---

جەرخوس: فەریکە جۆی هەڵکرووزاوە کە بە ئاگر وشکیان دەکردەوە وبەدەستهاڕ لێیان دەکرد ودەیانکردە شیو ودەیانخوارد.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٦)

---

جامیلکە: جامێکی بچکۆلە بوو بۆ ئاوخواردنەوە وماست تێکردن بەکاردەهات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٢٩)

---

جەوی جەوی: جۆرە بڕینەوەیەکی نارێکە ومووە براوەکانی سەر پشتی مەڕ وبزن بەشێوەیەکی یەکسان‌نییە، بەڵکو بەرز ونزمی تیادایە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٩)

---

جاجگ: ڕوخسار، فەسار، تۆز

---

جەرسە: جۆرە قوماشێك بووە.

---

جەلە: جۆرە هۆنینەوەیەکی قەراغەکانی جەمەدانیە.

---

جەلەکردن ڕیزکردن

---

جلیت: هێرشی مار، مارەکە جلیتی کرد.

---

جورجێت: جۆرە قوماشێکە، جورجییەت

---

جێی پێ‌جێ نەبوو: نەیدەزانی بچیتە کێندەرێ.

---

جاران، دەستی دزیان دەبڕی، ئێستە ماچی دەکەن.

---

جاران سەر تەنوور+ئێستە کۆشکی بلوور.

---

جاران، هەبوو بە خەرمان+ئێستە نییە بۆ دەرمان.

---

جارجار، گەدایی باشە+هەندێ شتی بەلاشە.

---

جارێك پڕە+جارێك شڕە.

---

جلی تەسك. زوو هەڵدەوەشێ.

---

جلا، کەنەکرایەبەر+چ پادشا وچ نۆکەر.

---

جمعەی پێ تەواو نابێ.

---

جوانوو، دواکەتوو وماندوو.

---

جوانی، مەلێ بوو فڕی+پیری. قەلێ بوو قڕی.

---

جوانی بێ ئاوەز+بەفری سەرماوەز.

---

جوانی بێ ئەخلاق، ناشیرنە

---

جوانی وباشی+وەکوو ئاوێنە وکاشی.

---

جوچك+پەنا دەباتە بنچك.

---

جوچکەی ژێر سەبەتە+تەنیا بەشی خەفەتە.

---

جۆگەیەك لێبدە ئاوی پیا بڕوا.

---

جێگای مێردان قونی تەندوورە.

---

جێگەی پێ لێژکرد.

---

جێگەی جەردە+چاڵ وهەردە

---

جەردە بدا لە شوێنێ+چل شەو ئارام دەمێنێ.

---

جیمس ئەدیسۆن، کوخ وبتهۆڤن

جێگای شانازی، مێژووی مرۆڤن.

(محەمەد دارپاس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

جاشەکە لە کەرەکە گەورەترە

---

جل وجۆڕ: مەبەست کورتان وجل وجۆڕکی کا وجۆی ولاغانە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣١٠)

---

جورغ: کاتێك سەرەسمکی پێلاوی دەدڕا، یان کون دەبوو کونەکەیان پینە دەکرد.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥٤)

---

جاش کەوش: ئەم جۆرە پێلاوە بنەکەی لاستیك بوو، سەر ودەورەکانی قایش بوو، لە ئێران دروستدەکرا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥٦)

---

**جەزوەی شەربەت:** زۆر گەورە بوو تایبەت بوو بە پاشماوەی قاوە. واتای سرپاتی قاوەی تێدەکرا و هەڵدەگیرا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٨٨

---

**جگەگورگ:** ئەگەر گەنجێك جگە گورگی هەڵگرتبایە، دەیانگوت کچ حەزی لێ دەکەن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٩٩)

---

**جەولگ:** زەوی دەو زێیەکانە وهەندێك چەگڵ ولمی تیادایە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٦)

---

**جۆجە:** پارچە زێڕێکی سێگۆشەی بەپلپلە بوو لەلا جلە کورتەك قایم دەکرا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٥)

---

**جرگ:** باڵندەیەکی گەورە بوو، ڕەنگی وەك پۆڕ بوو لە شێوەی عەلیشیش بوو گۆشتی دەخورا ولەوەرزی بەهاراندا لە کوردستاندا پەیدا دەبوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٥٠)

---

**جووڕەپووتە:** جۆرە باڵندەیەکە لە دەشتەکاندا دەژی.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٥١)

---

**جۆڕکە گوو:** بەکچان دەگوترا ئەم زاراوایە لە بەرانبەر کچاندا بەکاردەهات، بەڕاستی قسەیەکی زۆر ناشرینە، وەك وشەیەکی کەلتووریش ناچارم باسی بکەم، جاران پیرەمێردەکان دەیانگوت: کیژ یان کچ جۆڕکەگوو لەماڵی باوکی.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٦٩)

---

**جێنوك:** بسك وبز سك

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨١).

---

**جوو لە ترسان، فەقێ لە برسان. دۆم بۆ پەڕۆ، خۆش خۆش مەڕۆ.**

**جووجکە ترسێن کرایە.**

**جووجکە، بوو بەدوو، تێری نەخوارد لە گوو!.**

**جەرگ نەبێ، سیپەڵاك هیچ نییە.**

**جەرگ وەهەناوی بەر بۆەوە.**

**جەهەننەم جێی بێ.**

**جەهەنەمی بە چاوی خۆی دی**

**جێی پێ لێژکرد.**

**جێی شێران، ڕێوی لێی دەکەن گێران.**

**جوابی دێو ناداتەوە.**

**جیرانی نزیك، باشترە لە برای دوور.**

**جەهەننەمیش ئەوەندە گەرم نییە.**

**جوو وجووت؟**

**جوولەکە، بیکوژە، مەیترسێنە.**

**جارێ بە خۆی نەزانیوە.**

**جوان زۆرن، شیرین کەمن.**

**جەرگ ئازاری هەیە، بێزاری نییە.**

**جوابی کەس ناداتەوە.**

**جاشەکە لە کەرەکە گەورەترە.**

**جەماعەت ورەحمەت.**

**جووجکەم بوو بە دوو، تێرم نەخوارد لە گوو!.**

**جوابی فیلیش ناداتەوە.**

**جارێکت خوارد بە سندانت بێ، دوو جارت خوارد نۆشی گیانت بێ.**

**جوڕە بە حەواوە نار دەکا.**

**(نار: ناڵ)**

**جووتیار جووتیار بێت، لەسەر شاخیش جووتێ دەکا.**

---

**جەمێك قڕ وجەمێك بڕ.**

---

**جەمێك قڕ، جەمێك پڕ.**

---

**جێی شێران، ڕێوی لێ دەکەن گێران.**

---

**جنەنار: جۆرە دڕکە دڕکەکەی تیژە**

**لەفۆلکلۆری کوردی هاتووە:**

**باغی بەگدێم بەجنەنارە**

**بەژنی بەگدێم تەولەمارە**



# چ

چەرەگە: دارێکە دەدرێتە بەر رەشما، نەستووندە، ستوون

---

چەپرەك: شەق و شڕبون، کەفت، لێکەوتە

ئەو دڵەی من چەپرەك بووە (ئارام صالح)

---

چرچن: سیس و چورچ

لە کۆیە پیاوێك هەبوو زۆر زەلام و قەڵەو بوو پێیان دەگوت ئەحمە چورچە

---

چەکلەر: لەڕولاواز، تێکچوو

چەکلەر بووە.

---

چی: بۆ پرسیار وەکو دەڵێ چی؟ چی دەکەی؟

---

چما: چما چییە، بۆ، چییە، ما، بۆچی.

---

چوونە کەوشان: وەختی بەهاران دەچنە دەشت و بەندەنان بۆ کەنگر و ڕێواس لەگەڵ کچان

---

چەل: جار، نۆبەت، هەل، ئەو چەلەی، ئەوجارەی

دڵداری شاعیر دەڵێ:

ئەمەش کەرانە بێ کەوا

تەفرە دراوی بۆ چەڵ

---

چ ترێکت لە قونی دایە بیکەنە

بێ منەتی نیشان دانە.

---

چەناگە: چەنەگە بەشی خوارەوەی دەم.

---

چیلچیلە: نەرمەی گوێ

پریشکەی دیواری بە چیلچیلەی گوێی (جەمیل اغا)ی دەکەوێ

ل.١٤٤ مێژوی کۆیە

---

چەڵگە: ل.١٤٩

چەڵەگەی داری دریژیان دانابوو

---

چەرخەچی: پاسەوانی ناوشار و دەرەوەی شار، ل.١٧٣ میژووی کۆیە: چەقوو تیژکەرەوە بە پاسەوانی ناوشار و دەرەوەی شار دەگوترا (چەرخەچی– دەور بە قوڵ) حەسحەس

---

چیلکە: چلەداری باریك، شێخ رەزای تاڵەبانی

موتەسەریف جگەرەکەی لە دەما

دێ و دەچێ وەك مریشکی چیلکە بە قوون

---

چێرگ: باڵدارێکی گەورەی کێویە، چرك

---

چێر: مانگا – چێڵ، جنێوێك هەیە بە کەسی بێ کەلك دەگوترێ

ئەو قوزە چێرە چیە

---

چوستەك: پێلاو

---

چ لە گۆڕێیە: چ لە ئارا دایە

---

چەلاو: ئاوی گۆشت و ئاوی مریشك، گۆشتاو وەی مریشك یان گۆشتی دیکە

---

چاوت هەر لەدەرگان بی

قوونت هەر لە فڵان بی

---

چاو شینی چاو کتکانی، دەستە برای شەیتانی

---

چوومە ماری یا بەبوونێ، پێم کەوتە قوڵتی قوونێ

ڕاویان نام بە سەلکە سابوونێ.

---

چارشێو: قوماشێکی ئەستووری ڕەش، (قەمەندۆر) لە جیاتی عەبا جاران ژنە کۆیی بۆ خۆ داپۆشین بەکاریان دەهێنا. (هەندێ وتار وچاوپێکەوتنی وێژەیی ١٩٨٥ (خالید دلێر) ل١٣١، چاوشەو

---

چ جێ نییە سیوسیوەی دەرکەی لێ نە سووڕا بێ، چ جێ نییە لانکی منداری لێ ڕانەژابێ.

---

چ دار نییە بانەی هەژاندبێ

چ کچ نییە کوڕ نەیگەوزاندبێ

---

چیایەك دەڕوخێ. کەندێك پڕدەبێتەوە

---

چ مێوژەك، چ گێوژەك.چ کەویژەك

چ سوعبەتێك نییە ڕاستییەکی تێدا نەبێ

چیت: قوماشێك بوو ڕەنگی شین بوو، کوردی ڕۆژهەلات بۆ جەمەدانی بەکاریان دەهێنا

چەپارە: یارمەتی، هاوکاری

هیچ فەرقوو ناکەم لەگەڵ مەسعودی

خوا چەپارەو بدا لەچنگ حەسوودی

(مەلای گەورە)

شێخ سەلاح شێخ شەرەف لە پێشەکی چاپکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوە وپەخشی کۆیە هەمیشە نووسیویەتی خودا چەپارەمان بدا

چینکەنان: پارچەنان، ڕۆخەنان

ل١٧ چینکەنانی ڕاتبەی فەقێ یانت نەخواردیە

بیرەوەری وڕوانینەکانی مەلای گەورە (هێمن عومەر خۆشناو)

چەقەلوورانێ، حەپینی سەگ بەکۆمەڵ، وەڕینی سەگ

چەقێن: بەو زەویە دەگوترێ بەردی زۆر بێ، زەویی ڕەقەن

چەقەڵ بە کونێوە نەدەچوو

گیسکیشی بەدواخۆی دەدا

چەنەی چوو: بێزار بوو. چەنەلێدان: زۆر گوتن

چاوی بەرایی نادا، ناتوانێ ببینێ

چارەوێن: بنە جەڕەیەکە سەگ ئاوی تێدا دەخواتەوە

چینەکی باشی لێدا: باشی پێ کەوت، لە مردیانی ڕاستکردەوە

چەولگ: ئەو شوێنەی زیخ وچەوی زۆر لێ بێ، زیخەڵان

چاوی گەلەك قایمە: بێ شەرم و ڕووە

چیتان ئەوێ ئەی هەژار، دابەشکردنی زەوی وزار.

دروشمی شیوعییەکانی کۆیە بوو

چی ئەعزای ئازای بە دەنمە هەمووی دێشی: واتە هەموو گیانم دێشی

چەرمە چقاڵتە: لەڕولاوان، سیرمە سەگ

چاوبلەبۆق: چاو دەرپەڕیوو، چاوزەق

چزیلك: دوونگی دووگ) حەیوانی پشك پشك دەکرێ وبەئاگر دەیتاوێننەوە
لەکۆیە ئەستووکی بەچزیلکان خۆشە، دوونگەکە بەچاکی سوور دەکرێتەوە

چاو هێلکەمار: چاو گچکە ودرێژوکە، چاوت وەکو چاوی ماری خۆم بۆ باوێ سەر
دیواری ماچت دەکم پڕ بەزاری

چیوچیوە: سیوسیوەی دەرگا هەیە

چاوی پشیلە بەس کونە مشك دەبینێ

چیچکانێ: لەسەر قاچ دانیشتن.
لەسەر چیچکان دانیشت بوو

چۆل یاپراغ: خواردنێکە لە جۆری یاپراخ بەتێکەڵی یان (یاپراغ بە شلی)

چەپەر: دەرگایەك. یان پەرژینێك بەشوڵە دار دروست کرابێ بەتایبەت هی ڕەزەوانان

چرژ: ئەو درزەیە کە دەکەوێتە سەر ئاوێنە وشووشە.

چادری شین: ئاسمان، حەوا
ئەم ئەرزە کۆنە هەوارە، خەلایقیش کۆچە
تەماعی سووری نەبێ کەس لە ژێر چادری شین
(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل٨٨)

چاوە: ژوور–هۆدە
خانوەکەتان چەند چاوەیە.

چەنگ: چەپۆك مست
چەنگم چەنەگەی چەندە چنی هەر نە چناوە
مێژوی هونەر وهێزی مژیم ئەو نەمژاوە (مەلا راجی)

چ جای ئەوەی: سەرباری ئەوەی

چەرمی چۆلەکە یەك بەیەکێ دەرێ مار ئاوەدان دنیات کردە چەرمی چۆلەکەی

چاوی پێهەرنایە: حەسودی پێدەبا

چاکی چ لە خۆ نەگرتە: بەو کەسە دەڵێن هیچ خێری بۆ کەس نەبێ وڕەزیل و وشك وئارچاغ بێت وەزعیشی باش بێت

چاو کونە شووژن: زۆر گچکەیە چاوی

چەقووی لەسەرە: کوشتنی شەرعی وحەڵاڵە

چۆلەکەی ئەمساڵ بەهی پار دەڵێ: جریو جریو

چەرمی چێرانت لێ بکرێ: شەرمەزار بی

چێشتەنگاو: دەمەدەمی ڕۆژ گەرم بوون

چەکمەحەساری: گرتن ولێدان

چەکمە حەساری ئەکەم وەکو شێت

ڕاکێشی ئەکەم ئەیخەمە ژێر پێت

دیوانی دڵدار ل۱۰۳

ئامادەکردن وڕێکخستن وپەراوێز دانانی: ڕەمەزان حەمەدەمین سەنگەر نازم

چاو وڕاو: ئیحراجکردن، وەك هەڵخەڵەتاندن

چاو وڕاویان لێکردم ڕازی بووم

چرووك: بەتاڵ، تەقێندراو

پێ لەتەختی چرووك نانێت

چاومار: چاوتیژ

چەمبەر: چەمەر، ئەلقە

گوندێك هەیە لە نزیك کۆیە ناوی (چەمبەرە)یە

ڕەنگە لە چەم وئەوبەر هاتبێ

چەپەك: جێی پەنا، زۆر بەرچاو نەبێ

چاوی کسکەی دەهات، سمێڵە خنکەی لێ بوو

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (۱۲۰)

چ تۆبە تۆبە

لە هۆدەکی بێ سۆبە

وتەی شێخ مەلا سدیق

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (١٢٨)

---

چەند خۆشە لەسەر ئەرزی- بژین بەسەربەرزی

مەلای گەورە

---

چوومە سەر گردەکی، نواڕیمە دەشتەکی، چەند سوار لەڕەنگەکی

(نێرگس)ە

---

چرپەچرپی تنۆکەی، قووقە قووقی کەرەبابی، پرخە پرخی زڕبابی.

---

چاوی زڕ بابی -وەك کۆڵەوەیبابی.. (کۆڵەوەیباب: مارێکی ژەهراوییە).

---

چەوگ: بەردی هەراش وگەورە وگڵ لەژێرپاڵەپەستۆ وئاو گەرمی زۆر کنەوە تێکەڵ بوون ویەکتریان گرتووە، ئەمیش هەرگیرەیە.

(مێژووی کۆیە-بەرگی دووەم-بەشی یەکەم، تایەر ئەحمەد حەوێزی ل٣٤)

---

چی بیکە بێبە عەنبارێ، هەر ئەوە دێتە خوارێ

---

چەقوو ئاروو بەدەست خۆتە

---

چەمی چەمی. نەچەمی لۆ چەمی

---

چەمی: چەماوە

---

چاو لە دەرە، قوڕ بەسەرە

---

چ مێوژێ، چ کەوێژێ

کەوێژ: ربە

---

چەقەچەق: زۆر قسەکردن، دەنگ بڵندکردن

---

چاوەڕوو: دەڵێن بێ چاوەڕووە واتە بێشەرمە

---

چڵیس: نەوسن

---

چاوبز: چاو سورکردنەوە

---

چەپان چەپان نەمری خەپان (دایك کە منداڵەکەی فێری چەپڵەلێدان دەکات)

---

چاك لۆی پینە دەکات

---

چاك دایەوە کەندێ

---

چاکە بەچاکە، چاکە

---

چاکە هەر چاکەیە، هەتا ئەگەر بەئاوێی دادەی

---

چاکەی سەربەخۆ سەری ساحێبی دەخوا

---

چاکی مرۆڤ ناخ ودەروونە

کەجگەر سۆزبی خەلك لێت مەخونە

---

چاڵ هەڵکەن هەمیشە لەچاڵدایە

---

چاو بەخۆڵ پڕ دەبتەوە

---

چاو چاو دەرناکا

---

چاو چاوی نەدەبینی

---

چاوت دەرچێ، ناوت دەرنەچێ

---

چاوت مەبڕە لەماڵی خەڵك حەرامە

قسمەتی خۆت بەسە بەتاسە

---

چاوەڕوانی سەلامەتە

عەجەلەش نەدامەتە

---

چاوی حەسوود هەمووکەس دەیبینێ تەنیا خۆی نەبێ

---

چاوی پەڕیە پشتی سەری

---

چاوی حیزە وملی پانە

---

چاوی گەش وجوان وپێویستی بە کل نییە

---

چاوی مشتەك هەزن دەگرێ

---

چەتە کەکز بوو نوێژکەرە وچاکە

---

چەقوو دەسکی خۆی نابڕێ

---

چەند خۆشە جووتی بەك دڵو یەك گیان

مانگی هەنگوینیان بچن بۆ لە

---

چەند خۆشە پیاو دڵی پاکی بێ

نەتەنگانەدا دۆستی چاکی بێ

چما کەری قازیم تراندییە

چوویتە سەر داری، نایەتە خواری

چاکەك هەیە لەدار داوە

چوومە دیوەخانی میر، پرسیارم کرد لەپیاوی پیر، لەخەڵکی ژیر، چییە تەیری بەشیر.

(شەم شەمەکوێرە)یە

چار پێی هەیە ناڕوا

(کورسی)یە

چار پێ لەعاردی، دوو لەتەنیشتی، قنگ لەبن کلکێ، کیر لەسەر پشتی

(پیاوێك سواری ئەسپ بووبێ)

چەندی لێ بدەی گەورەتر دەبی

(هەویر)ە

چار زیندی- بەك مردی

(تابووت)ە

چارۆگەیەکی شینی چوار گۆشە

پڕە لەکاری پرشە پرشە

(ئاسمان وئەستێرە)یە

چارە نابێ بە پێنج

(چوار مەزهەبەکە)

چوار پەڕو دوو چاوە، دوژمنی زەوی وهەتاوە

(ماسی)یە

چیدیکە مەکە تری تری

ئەوی هەیە ئەویش دەبری

چاك ڕاگرتن: صیانە

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٠)

چم گۆ: چیم وت

چاخ: کیسەیەکە لە موشەما دروست دەکرێ، توتنی تێ دەکرێ لە فەردە بچووکترە
(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەک ل٢١)

چەرخوس: جۆ کە هێشتا فەریکە، ئالیك
(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

چۆڕەمیسکە: چۆڕە (دلۆپ)+میس (مین)+کە (ماوەیەکە چۆڕەمیزکەم گرتییە).
بۆ کەم بوونەوەی ئاو دەگوترێت ( ئاوەکە وا کەم بووە چۆڕەمیسکەی پێدادێ))
(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

چەقوولە: چەقۆی بچووك، دەشلێن دەم چەقوولە

چیلەمێو: ئەو ڕیزە مێوەی پێکەوە بەریز چێندرابێ

چەسپێنە: لحیم
(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٩٩)

چـــلەبڕە: لـــەزاراوەکانی ســـەر بەخەڵانـــەت (چـــلەبڕ)هەیە وەك لـــەبیرم مابێـــت لەسەرماوسۆڵی چلەدا زەوی جووت دەکەن بۆ فەوتانـدنی کـرم وگەزەندیـەکی زەرەر بەدەغڵ ودان یان شینا ورد بگەیەنێت، ئەم وارەوەیەش بەرەو ئامانجی (بنەبڕ)دەچێت کەمەبەست نەهێشتنە..
(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٣٦)

چەرەخەبەرە: عەرەبانە
(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٠٥)

چەند سـەیرە ئێمـە هـەمووومان ـرای هـەموو دونیا بێن بـەڵان نەشێ نـە ئێمـە ونـەهیچ میللەتێکی دیکەش لە نێوان خۆیاندا برابن
مەسعوود محەمەد
(لـە وتـە بەنرخـەکانی مەسـعوود محەمـەدی فەیلەسـووف-ئامـادەکردنی حەیـدەر عەبدوڵڵا ل٣٨)

چۆر: قومێك، مژێك
چۆڕە ئاوێك، تا دواچۆر رایگووشە
چەندی لێ بدەی گەورەتر دەبێ (بیرلێدان)ە

چەقووی لێ تیژ کردیتەوە

چی ئیسلام بۆ عەرەبی کرد نە هەرگیز پێشتر دەیەکی ئەوەش کرابوو، نەهیچ بورکانێکی دیکەی سەربە کۆمەڵ دەیتوانی عەرەبی ئەو سەردەمە لە خەوی بەداوەت هەڵسێنێ بۆ جیا بگری مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە بەر لە ئیسلام، عەرەب لە نەجدەوە بۆ (قیرتل کریسنت– الهیلال الخصیب) بارەهنا ڕۆشتوون بەڵام بێ هیچ مایەیەك وئاکامێك دەنگ وسەدایەك.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٦٣و٦٤)

چونکە بەهیچ مەزهەبان ڕەوانییە بگوترێ شیوعییەتی کورد لەسەر پشتگیر بکەون لە (مرۆڤایەتی)دەستەویەخەی کوردایەتی بووە. لەسییەکاندا شاعیرێك ئەمەی خوارەوەی گوتووە کە جارێ کۆمەنیزم لە نێوانماندا پەیدانەبوو بوو:

قەومی کورد موحتاجی عەتفە چونکە مەحوی کردووە

زللەی دەستی خەوادیس، لەققەی دونیای دورن

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٤٧)

چەندی لەبن سەرییە

چەمبەرە: شینی ژنان بەدەورە، گوندێك هەیە لەنزیك کۆیە ناوی (چەمبەرە).

چێودار: ئەو کەسەی زیندە ماڵات دەکڕێ ودەفرۆشێ هەندێ جار پێی دەڵێن (قەساب)

چونکە شیوعییەت شتێك نییە هی کەیفە وهەڵبژاردن بێت وك کە باوەڕی تەجریدی (بێ کردەوە وبێ بەرهەم)

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٣١)

چەندێکی کوردەواری بەتێکڕایی لەڕێیی: ١. یەکێتییەتی هەول. ٢. شارەزایی بەرژەوەند. ٣.ڕەفتاری لایەق بەمرۆڤی سەردەم بجەتێت شتێکی کردووە ئەگەر نەیکات دەبێتە حەیاچوون

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٤٤ و٤٥)

(چین)ێکی خاوەن ژیارییەکی چوار هەزار ساڵی وحکومەتی چەندین هەزار ساڵە وتەجرەبەی گەشی سەرکەوتنی حزبە شیوعییەکەی بۆچی لەترووکەیەکی چاودا خۆی نەفام وگێل وشێت دڵیت کرد بەو گاڵتە بازارییەی پێی گوترا شۆڕشی سەقافی ماوتسی تۆنگلێکی لە کتێبەکەی (ئەدگار سنۆ)نەستێرەی سوور بەسەر چینەوە ساڵی ١٩٣٦ هێندەی پێغەمبەرێکی ڕاستەقینە داناو ئازاو دڵخواز ونیگافرەوان بێت، چۆناوچۆنی لەکۆتاییەکانی عومریدا ئەو شەکرد هەنگوین و (شراب گعورا)ی گوت کەرای گەیاندن جالاوسەکەی سی سالی سەر بە ئیسفاری دۆزیەوە، گۆیا (لیو شاوشی) سەرەك کۆمار وهاوڕێی کۆمیە خۆی وئەندامی هەرە چالاك وبەوەفای حیزبەکەی بێت.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٦٣ و٦٤)

---

چ باسە؟ هەموو هەر سەری تاسە.

---

چاو چاو نابینێ.

---

چاو لەدەرە، قوڕ بەسەرە.

---

چارەی قەرد، دانەوەیە

---

چار پەراسووی هەیە

---

چاردە سارە، لە دوو ئسمەری ڕوو بە خارو، تازە دەرێ کاکە برارە

(سار: ساڵ) (خار: خاڵ) (برارە: برالە)

---

چارۆگ سپی پیازی، دۆی لە ماران دەخوازی

---

چاو بە چاوان دەکەوی، نا هەق بەبن دەکەوی

---

چاو کۆتکی دۆشاوێ، مێشتن دەگری بە داوێ

---

چاوم چاوێ دووپشکێ، لە ناوەندیرا بشکێ

---

چاوم دەرچی ناوم دەرنەچی

---

چاو نەشووشتی، مێشان کوشتی

---

چاوی بە کەس هەر نابێ

**چاوی نییە، چاوڕووشی نییە**

---

**چەغەی لێ بکە، دەچتە ناو سەیان**

---

**چەقەر لە چەم، گورگ لە چیا**

---

**چ باوێیە مەنجەڕێ، ئەوە دێتە بەر ئەسکووی**

---

**چل چلە. چل پاش چلە، هەگرە جلە، هەڕوە ملە**

---

**چوومە گۆمێ ئەولاتر، یەك لەیەکی خراتر**

---

**چاوی مار دەردێنێت .**

---

**چاك تووشی گون ڕەشی خۆی هاتییە .**

---

**چوار پینەی کەیت ناگاتە بەهار .**

---

**چووە دوور، بوو بە پوور .**

---

**چۆڕی لی بڕی .**

---

**چڕدۆ: ئەو مانگاو مەڕو بزنانەی شیر باش نادەن**

**(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٩٦)**

---

**چلەشۆو: چلەبڕ**

**واتا شۆو بڕین لەچلەی زستاندا کە ئەوکاتە زۆر باشە بۆ شۆو بڕین**

**(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل١٠٩)**

---

**چاڵێکم کەند چل گەزی، فاتمە خانمی تێ بەزی، پڕ سەری بوو لە دەرزی.**

**(کەنگر)**

---

**چەپەرخان: دەرگا ودیواری لەشوول**

**پیاوی نامەبەر**

---

**چاوی ل دەرێ، خوری تێوەرێ.**

---

**چونکە کاك (پارە)،لێمان بووە بەتەیارە، هەر لای مامەتوجارە.**

**(محەمەد تۆفیق ووردی)**

گۆڤاری رامان ژماره (٢٦٩)ساڵی ٢٠١٩ نامەیەکی م.محەمەد تۆفیق ووردی بۆ م.تاهیر ئەحمەد حەوێزی

---

چینی: لە قوڕ دروستدەکرا وەك جامی ئاوخواردنەوە بوو، لە چێشتخانەکاندا ماستاویان تێدەکرد.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٦)

---

چرگە: ئەو شوێنەیە کە زوو گیای لێ سەوز دەبێت وبەژنی گیایەکە زۆر بڵند نابێت وبەباشی وەبەر دەمی ئاژەڵان ناکەوێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٥)

چەرچی: ئەوەی شت دەکڕی ودەفرۆشێتەوە.

---

چەرمەچەقالتە: ئەوچەرم وتەڕادانەی بەکەلك خواردن نایەن.

---

چەکمە: جۆرە کەوشێکی کۆنە، لموزەکەی درێژە.

---

چەولك: چەوێکە یەکتری بگرێ وەکو شاخی لێبێ.

---

چینەك: هەندێك، چینەکیان لێدا

---

چێورمە: ئەو چەپەرەی لە شول دروست دەکرێت لە شێوەی حەوشە بۆ داکردنی مەڕ وبزنان، زۆرجار چێورمە بۆ کار وکۆتیش دروست دەکەن.

---

چ هاوارە: پەلەی چیتە، چ قەوماوە

---

چوارزۆ: فرۆشتنی هەموو ماڵاتێك

---

چ لەبار بچێ، چ لەسوار بچێ.

---

چارەی خوری، ڕستنە.

---

چاك نەبوو بۆ بابی خۆی+کەمرد قوڕی پێوا بۆی.

---

چاکی مەکە، با خراپ نەبێ.

---

چاکە لە چاکان دەوەشێتەوە.

---

چاو چوە خەو+قون دەبنە بڕنەو

---

چاو لەچاو شەرم دەکات.

چاو لەدەس+دەمرێ بێکەس

چاو لەدەستان- سووك وپەستان.

چاو لەمیرات. نیوە مردووە.

چاو، خۆی نابینێ+دنیا دەبینێ.

چاوی تێرە+دەنگی دلێرە.

چاوێ لەدەربێ-واچاکەدەبێ.

چپە، یا بۆ حیزییە یا بۆ دزییە.

چرا بە ڕۆژا بێ نوورە.

چرا، بۆ جێی تاریکە.

چرا، لەبەر بادا ناگرێ.

چنار، بەبالاّ و (شۆرەبی)بەپەل.

چار گۆرانی بێژ ودوو هەڵپەرکێ کەر.

چار شتت بوو. چاکی+دادگەری وتاقەت، زانین وپاکی.

چوومەوە باوان بۆ ڕێز+لێیان گرتم قیز وبێز.

چوومە باوان لەزەت بەرم+کۆستێ گەورە کەوتە سەرم.

چوو بۆ ئاگر شەلەشەل+کەچی شووی کرد پەلەپەل.

چوو بۆ شیر. مژابوو+چوو بۆ ئارد، ڕاژا بوو.

چوو بۆ ڕاو+کەوتە داو.

چوو بۆ یەکێك دوانی بەردا.

چوونت چی بوو؟ هاتنەوە چی بوو؟

چوویتە دێی ژنت+دۆشاو بە گونت.

چوویتە سێبەری دارێ+مەیبڕە وەکوو هارێ.

چوویتە سەر تەخت+بنوارە بۆ بەخت.

چوویته سەر کوری ئیتر ناپرسی.

چوویته گوڵستان+لەبیرت بێ سەرمای زستان.

چڵمت بسڕە وماچمان ناوێ.

چڵمن وکەچەڵ+دەبن بە هاوەڵ.

کەس چرمی پێ ناسڕێ.
چرم: چڵم

چۆمی درۆ، سەرچاوەی نزیکە.

چەپە دەستی ڕاستە.

چەقوو بەدەستی تیژ نابێ.

چەقوو چ دەری بێنی وچ بیوەشێنی.

چەقوو تیژ، ماشەڵڵای دەوێ.

چەقەڵ وڕێوی بۆرن+دیارە کە مریشك خۆرن.

چەقەڵیش، ڕاوچی خۆی هەیە.

چەکمە بۆر، دەیبا بە زۆر.

چەکی ژن، فرمێسکە وزمان.

چەم گەیی بەچەم+لێی نەدەی بێخەم.

چەن داری باریك، پێکەوە ناشکێن.

چەن ساڵە شوانە وگورگێ ناناسێ.

چی بەردی کەلە+بۆ لاقی شەلە

چی دووڕووە، بێ ئابڕووە.

چی کەس وکارن+خەڵقی یەك دارن.

چی هاتە پێشم، پێیدادەکێشم

چیت دیوە لە کەلاوە؟+باسی مەکە لەم ناوە.

چمەنتۆ، دەبێ لمی تێکەڵ بێ

چینی بەرچاوتێر+بەڕێز ودلێر.

چینی بەچاوتەنگ+گیرۆدەن بەنەنگ.

چینی گا وکەران+ماڵ ئاوا کەران.

چینی وەستا وسنعەتکار+نەداران ونەهەژار.

چینەدەکا وپینە دەکا.

چێشتە تەڕە. مراکی دەوێ.

چیلکەی تەڕ+بۆ ئاژەڵی بەدفەڕ.

چاکمان دەهاری، دەستاڕی گەردون

مێژوش نازانێ، چەند کەس هات وچون

چ مزگەوتی لێ بکەی، چ مزگەوتی لێ بڕووخێنی.

چ لەبار بچێ. چ لەسوار بچێ.

چاوە کوێر فرمێسکی کرد.

چاك دەبنەوە جێی خەنجەران، چاك نابنەوە جێی کەسەران.

چاکیان سوورژنە، کونێکی لە بنە.

چاو دەلەوەڕێنێ.

چاو هەموو شتێك دەبینێ، تەنیا خۆی نابینێ.

چاو کەپوویان لە بەیندا نەبووایە، یەکتریان دەخوارد.

(کەپوو: لووت)

چاو لەچاو شەرم دەکا، بەرتیلیش بەرد نەرم دەکا.

چاوی قووچاند و دەمی کردەوە

چاوبرسی ئابرووی نییە.

چاوی برسی. بە خۆر پڕ دەبێ.

(خۆر: خۆڵ)

چاوی عەرز نابینێ.

چاوی پڕ بوو لە ئاو.

چاوی کۆری پێ ڕوون دەبیتەوە.

چاوی حیزی داخستیە.

چاوی لەدەممە.

چاوەش بێ وشایی لۆ خۆی بکا

چووە سەر پۆپەی دارێ ونەهاتە خوارێ.

چووە بنجو وبناوانییەوە.

چرك: ئەو دەرمانەیە لە بنێشتە تاڵ وگیابرینە وگیارەکێشە دروست کراوە، ژنێکی حەکیم ودەرمان ساز لە کۆیە بەناوی (گوڵێ رەعبە) دروست کردووە، برینی پێ چاکردۆتەوە، نەنە (کۆتر) ئەویش هاوکاری کردووە.
(عەبدول رەقیب یوسف/لە خەزوورانی تۆفیقی مەلا سدیقی بیستووە نوسیویەتی، لە گۆڤاری رەوشەنبیری نوێ ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١ ل٧٦)

چیم: فرین، فرینزوو

چییە ماچێ، لۆ گەورە کچێ!

چەند نەمژە وچەند بانە

چرا جێی هەتاو ناگرتەوە

چەوری بەرچاوی گرتییە

چەمی درۆ سەرچاوەکەی نزیکە.

چرمیشی پێدا نادات.

چاکە لەگەڵ ناکەس بەچەدا. پەشیمانی لەدوایە.

چەك لۆ ڕۆژی جەنگ، قەوم لۆ ڕۆژی تەنگ.

چ باکمە، کوڕە کەچەر کاکمە

چرای کەس تا ڕۆژ ناگرێ.

چەقەڵ لۆ چەم، ڕەخش بۆ ڕۆستەم.

چوونت بی، هاتنەوەت نەبی

چی بە سەر چییەوەیە؟

چت لێ بشارمەوە؟

چەك لۆ ڕۆژی جەنگ، قەوم لۆ ڕۆژی تەنگ.

چرمی خۆی پێ خاوێن نابتەوە.

چرم: چڵم

چاوم بەرایی نادات.

چاوی سوور بووە

چ سەر لەبەردی. چ بەرد لەسەر، بدەی هەر سەر دەشکێ.

چەندەم پێگۆتی بە تەگبیرم بی، بەقسەت نەکردم خودا گیرم بی.

چاوی لەدەممە.

چارەی ڕێ ڕۆیشتنە، چارەی خەو هەر نوستنە.

چی لە کۆشیدا بوو، بە گۆڕێی وەرکرد.

چەند کۆ کەیتەوە دارایی، تاکو پلەی پاشایی، هەر بەجێی دێڵی دوایی.

چ کەرەکەی ببەیە لای بارەکە، چ بارەکەی ببەیە لای کەرەکە.

چەند کەر دەترێ. ئەوەندە درۆیا دەکا.

چوومە مێرگەلی. سەد بووک لەرەنگەکی

چاوپان: ئەو کەسەی کەتنێك دەکات وچاوانی لەبەردەنێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨٢

چیت: جاران هەندێك گەنج چیتیان لەسەر دەنا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٨،

چەکمە: چەکمە وەك جزمە بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٨

چاوکتوکۆر: ئەو کەسەی چاوی کزە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨٢)

---

چیلە: ئەو شوورە بەردەبە کە لە دەورەی ڕەز دەکرێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٧)

---

چەپەر: دەرگەی دارە و بۆ گرتنی دەرگەی مالأت بە شوورە دار دەکرێ .

چەپەر بە شێوەزاری بادینی واتا سەنگەر.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٧)

---

چەکمە: سەر وبنی قایشی قاڵتاغ بوو وسوار چاکەکان لەبەریان دەکرد.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥٦)

---

چەرخە خولە: سورانەوە

---

چرمی خۆی پێ خاوێز نابتەوە

چرم: چڵم

چەوەندەر لە عەرزی ڕەق دەرنایە.

---

چار پینەی کرد، ناگاتە بەهارێ.

---

چەند شاران گەڕام چەند خاکەساری،

بووم بە شوانەکەی حەق نادیاری .

---

چاکیان سووژنە، کونێکی لە بنە.

---

چوو بڕۆی چاك بکات. برژانگیشی دانا.

---

چەند جوانە هەڵەکانی یەکتر بسڕینەوە لەپێناو خۆشەویستی نەك خۆشەویستی بسڕینەوە لەپێناو هەڵەیەك.

دیدەن سەید برایم

# ح

حووج: گەورە و ... لاح، حووجی بنی حەلاق.
خۆی عوج بن عەنا... یان عوج بن عنق
وا سەر و گوێ یەک... شکاوە بویتە حوجی بەنی حەلاق
ئەوەی گەورەییەک... وو بە قەدەر حووجێ
وا چووك ببۆوە ببوو... فرۆجێ

حاپوول: فاول... حاپولان داوێ: واتە چاوی باش نابینی کە دەڕوا شەق لەبەرد هەڵدەدا وڕەت دەبا... یاری کەلایەنێ (هەڵماتێن) ئەوەی ڕێ لەتیلەکەی بگرێ دەبێ حاپوولێ بدرێتێ

حووس حووس: ه... دێتە دەرێ و دەچێتە ژووری، سەرەتاتکە

حینگ: خۆ پێوەد... کوت پێوەنان

حەمە شەڵتە: ... ك و پێك، بێ تاقەت،شەپرێو

حلێب نییە: حس... نییە، حسێب نییە، حلێب نەبوو

حەل لەلا: ... سەرسوڕمان بەکاردێت

حەلەمشایی: هەر... خۆیەوە، هەر لە گۆزە حەلەلا

حەشامات ... بالغ، خەڵکێکی زۆر

حەمەدیلان دایکی ... شیلان: حەمەدیلان، تێکۆشەرێکی دیار وپێشمەرگەیەکی دێرین بووە لە شۆ... ی ئەیلول کە بە منداڵی بە شەڕ هاتووە وایان پێ گوتوو

حورمە: ژن: حور... (حورمە دامەنی خۆی دوژمنی خۆیەتی)

حەفت دەردی هە... قوونیشی دەرهات، دەیگوت یاخوا بەخێربێی سۆرە گورەی باغان. هەر ئەتووی... ەم بوو (واتە تووشی مایەسیری بوو)

حەیشەری (حەمش... ی)بووە: گێل ووێل وبێهۆش بووە، وابزانم لە بۆ گەنج بەکاردێ وەك مراهق

حەز دەکا و ناز دەکا: دەیخوریّ و دەی هیّشی

حەفت برای دەست بە خەنجەر، ناگاتە ئاگری جگەر

حوشتر باری زێڕ بی، خواردنی حوشترالووکە

حۆلە: گێژ و وێژ، حەپەحۆل، هێڕ

حیلکە: قاقا،حلیتە

ڕۆستەم حەوێزی دەڵێ:

هەرگیز لەسەر هێسکێ سەگ و وانەکەن کەلەکەی

وەکو ئەو خەڵکە دەیکا لەبۆ کڕینی هێلکەی ،

بە سەد شەق و پاڵەستۆ دەستەیەک هێلکە وەردەگریّ

دەستە هێلکەی کە وەرگرت گوێت لێیە (حیلکە)ی

حەوا: ئاسمان،عاسمان

حەشتەبای خواتان نەبێ، حەشتەبامان نییە.

حەپەتان: گۆلک و گێلۆکەی قەلب گران

حیتە: قاقای پێکەنین، بەزەلامی لەش گەورەش دەگوترێ، هەندێ جاریش بە زەکەری پیاو دەڵێن حیتەی زەلام.

حەفشە: (حەشەفە)سەر گۆی زەکەری نێرەکەر

حیزبە دز مەبە

حوباڕە: گێل و گێژ، باڵندەیەک هەیە ناوی حوباڕەیە

حەوجە: منەتی پیّ بیّ، پەشیمان بێتەوە، مەجبوری بێتەوە

حەوجە حەوجە حەوجە

کچی ئامیر فەوجەکە

مانگ هەڵات، حەوجە بە ئەنگوست نییە واتە پێویست بە ئەنگوست نییە

حوباندن: خۆشەویستی، یەکتریان نە دەحوباند

ئەگەر خزم نەم حوبێنێ، بێگانە دەمبوغزێنێ

حەپلۆنە: گەورە

قوبادی جەلی زادە لە شیعرە پی تەرازوێک ئێوارە

پۆلێك سەركە تەشی لەبن بەردێكی حەپلۆنەی ڕیپۆق گرتوو بزر دەبن و پەیدا دەبنەوە

---

حوققەباز: ساختەچی و فرۆفێلكەر

چەندێ لەمەوپێش جەماعەتێك لە حوققە بازانی ئێرانی هاتنە كۆیە (بیرەوەری و ڕوانینەكانی مەلای گەورە)

بە حوقەباز ولەعبی زەمانە ناخەڵەتێین

ئەمێستە پێ دەكەنین ولەئاخیردا دەگرین

(دیوانی حاجی قادری كۆیی ل٨٨)

---

حەپس: گرتی بەندی .

---

حەسار: حەوشەی گەورە

---

حەپەلووش: خواردن، قوت دان

هەمووی حەپەلووش كرد

---

حندرحۆ: جۆرە یاریەكی منداڵانە، دەگوترا حندرحۆ نانی جۆ

---

حەتۆتە و مەتۆتە: ڕستەی مۆری و مەرجانی منداڵان.

---

حەتحەتۆكە: ئەو پۆیلە وشتانەی ژنان بەخۆیانیەوە دەكەن. توورەكەیەكی سێ گۆشە بوو، لەگوڵی بۆنخۆشی جۆراوجۆر لەسمڵ قەنەفڵ وكنێر وبۆنخۆشكە وچاترە وڕیحانە وگوڵەباغ بەلانكلبەوەیان دەكرد هەم گەمەی پێ دەكرد هەم بۆنی خۆش بو، یا پێش منداڵیان دەدووری وەك نوشتە بۆنی خۆش بوو.

---

حاشا لە درۆزنی

---

حوشتر برەوێتەوە، ناگەڕێتەوە

---

حەلە: حەڵاڵە ڕاستە

---

حەكیم: دكتۆر لوقمانی حەكیم لە دكتۆری بەناوبانگ بووە

---

حەیاتە: مەكانە شەوقی بەعێلاتە پەشمە كۆنە هەوار

حەیاتە،زەوقی بەئەحبابە بایە ئاووهەوا

(حاجی قادری كۆیی)

---

حەكایەت: چیرۆك، سەربوردە

---

حۆقە: چوار كیلۆ، پێوانەی كێشانە

---

حەمەشکێ نۆنشکێ

کابانی سەر بەرشکێ

نە دۆی دەخوا نە کەشکێ

گەمەیەکی منداڵانە

دۆڵی بۆ لێدەی هەڵپەڕکێ دەکا

دەفی بۆ لێدەی حەمەشکێ دەکا

(باخچەی باپیرانی سامی عەودالّی شاعیر ل٨)

---

حلە: حسابە

---

حۆحانێ: گەمەیەکە لە نێوان دوو دەستە کچ

---

حووحانێ: گەمەیەکی منداڵانەیە کچ دەیکەن لەسەر چیچکان هەڵدەپەڕن دەڵێن:

حووحانێ بلی بلی

چاوم ڕەشکرد بەکلی

پێکەوە بچینە قەبری

قەبری تەنگ وتارە

پڕ لەمشك ومارە

مشك ومار عەزیایە

خۆی لە ڕمبێ دایە

---

حەزم لە برنجە-کەیفم قینجە

---

حوشتر بە ڕۆژێ یان بەشەو، هەر خەون بە لۆکەوە دەبینێ

---

حەجمێن: ئارام، سەبر

---

حوسکە: جۆرە تفەنگێك بووە لە سەدەی بیست

پیاوێکی عەبدوڵڵا ئاغای حەوێزی کە ناوی (سابیر)بوو خەڵکی تۆبزاوا تفەنگێکی حوسکەی پێ بوو

(بیرەوەرییەکانی مامۆستا عەبدول مەجید نورەدین جەلیزادە (ئامادەکردن وپێشەکی ولێکۆڵینەوە وساغکردنەوەی د کەمال مەعروف) ل٤١)

---

حەفتی بمری لە (باوان)کلی نابڕێ لە چاوان

حەدگدگە قەمەندۆر
ناوت چییە کەسك وسۆر
کێندەر خۆشە مێرکەسۆر
(یاری مندالآن بوو)

حەوشە: گۆڕەپانی خانوو

حەپە: وەڕین

حەلیماو: بە ئاوی گۆشت دەگوترێ کە ئاوەکەی کەمبوبێتەوە، واتە خەستبۆتەوە

حەرام وحەراری حەلآلی)لێك جودا ناکاتەوە

حیز بە خاری (خالی)خۆی فێرە

حوشتریش گەورەیە

حوشتر وحەمام مەیموون وعەبا

حەیا قەترەیەکە بڕژێ دەرژێ خڕنابتەوە

حەق بەحەق، نانەکەی رەق

حەفت لەپەراسووی ئۆمەتی پێغەمبەری زیاترە

حالی قوونی خۆشە

حازرخۆری بەر سێبەر

حەچەمەچە: خرنووکی وشك کراوە، کۆیی دەڵێن حەچەمچە، پیاوێك هەبوو لە کۆیە پێیان دەوت حەچەمچە فەڕاشی خەستەخانە بوو

حوشتر حایە، لەحەوایە، دایم لەدەشتە، کون لەپشتە
(رەشماڵ)ە

حەمامیل: گیزدان جانتای بچووك لەمل دەکرێ

حەلەلە: بۆسەگ بەکاردێت بۆتێ بەردان

حاکمی سیاسی کۆیە (رەندێل)لە وەختی ویحتیلالی کۆیە، تەماشای ئاداب وسلوك وخواردن وئەلبسەی ئێمەی ئەکرد، تەعەجوبی دەما! ئەیگووت: (هەرچی دەرحەق کوردان بە ئێمەیان گووتووە ئیفتیرابوو، بەمنداڵی پێیان ئەگۆتین کورد وەحشین، ئینسان خۆرن، تەربیە وئادابی بەشەریەتیان نییە

(بیرەوەری ورونینەکانی (مەلای گەورە) کۆکردنەوە وڕێکخستن وپەراوێزی هێمن عومەر خۆشناو ل١٩)

---

حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە باوکی مەلا گەورە لەکن مفتی زەهاوی زۆر بەقەدر وحورمەت بووە، زەهاوی بەعومر گەورەتر بووە لەحاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە، دەفعەیە لە کۆیە سوئالی شەرعیان نوسیە خدمەتی جەوابێ: لەجێیە کاك عەبدوڵڵای تیابێ شەرم ئەکەم فتوای شەرعی بۆ وی بنێرم

(بیرەوەری ورونینەکانی (مەلای گەورە) کۆکردنەوە وڕێکخستن وپەراوێزی هێمن عومەر خۆشناو ل٤١)

---

حاڵی کورد وەك حاڵی منداڵی (٥- ٦)مانگییە لەسکی دایکی دا

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٣٦)

---

حەجی عادەتی، نوێژی عادەتی، خانەسازی عادەتی، هەڵپەرکێی عادەتی، بەدرێژی زەمان نەیانتوانیوە ناوەڕۆك، بگرە ڕووخساری کۆمەڵاتیش بگۆڕن.

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٤٢)

حەیفە لۆ دەنگت، ناحەزە ڕەنگت

---

حەیدەرم، قەلەندەرم

---

حەسەنەگێل مەسەنە، دارودیوار هەرمەقەنە

---

حەسوود هیچ جۆرێ بۆت ڕازی نابێ، هەتاکو نان ونیعمەتت مابێ.

---

حەکیمی خاس، تەنیا خواس

---

حوشتر وهەڵپەڕین، گامێش وهەڵفڕین.

---

حەسەن و حوسێن شەهید دەکا. پێ لە مێرۆستانی دەپارێزی

---

حەفت ساران باران نەبارێ، هەر ئاو هەرزاترە لەنانی

---

حەیران لە لولکەکەی دواوێ، سەر لە سێبەرێ، قوون لە هەتاوێ

---

حەیران لە سەر مەزرایێ.کیژان مێرد دەکرد، بێوەژن دەهاتنە سەمایێ

---

حوشتر بڕەویتەوە. لەحەفت چیا یان ئاوا دەبێ

---

حەپۆلە ی مێشخۆر

---

حەرامخۆر باکی لە گرانی نییە .

---

حەریف حەریفی خۆی دەناسێت .

---

حەرام خۆرە، کیسە بۆرە ..

---

حەزو و ناز، دەبێتە نان و پیاز ..

---

حەق بە حەق، نانێکی ڕەق ..

---

حەیا باری کردووە

---

حوکمی حاکمە، مەرگی موفاجات .

---

حولحولی مەزەبە

---

حەتحەتە: لەسەردەمی کۆن چەند جۆرە بۆنێکیان وشک دەکردەوە ودوایی ووردیان دەکردن وهەر بۆنەی لەپەڕۆیەکی بچووکیان دەهاویشت ودەیان درووو وەکو نوشتە ئەوجا وەکو ملوانکە بەپەتێك دەیانهۆندەوە ولەملی منداڵانیان دەکرد کەپێیان دەگووت (حەتحەتە)بۆنەکانیش ئەوانە بوون (قەنەفڵ-ڕەبناوك-گوڵەباخ-پەلکە پرتەقاڵ)و زۆر شتی تر، ئەوکارەش بۆ ئەوە بوو کە منداڵەکە بەبۆن نەکەوێ ولەگەڵ بۆنەکان ڕابێتێ

(کەلەپوری کوردەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٣١)

---

حەوت ترینگە: حەفت ترینگە

لە نۆك وکوولەکەی سوور ونیسك وترشی سماق وڕۆن وخوێ وپیواز دروست دەکرێ

(کەلەپوری کوردەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٤٨)

---

حەیران: حەیران ئاوازێکە بۆ لاواندنەوە وپێداهەڵدان دەگووترێ وسێ جۆری هەیە:

أ- حەیرانی مەجلیسی کە بەهێواشی دەگووترێ.

ب- حەیرانی چیایی کە بەدەنگێکی بەرز دەگوترێ

ت- حەیرانی غەریبی کە بۆ لاواندنەوەو پێداهەڵگوتن دەگوترێ.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوەو ئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل١١٦)

---

حەسوود ناگاتە مەقسوود

---

حاکمەك هاتی یە حوکم دەنوێنی

گۆشت قاز دەخوات وگۆشت کەو دەستێنی

---

حەدوسەد: وەختیەتی.

---

حەفت روح: حەوت گیان، وەکی پشیلەی حەفت روحە نامرێ.

---

حوکمە: هەردەبی

---

حاکم، بەقسەیەك خەڵك ئەگرێ وبەهەزار قسە بەری نادا.

---

حوکمەت، گوێی هەیە، چاوی نییە.

---

حەرام بێ ونانی جۆ بێ+بەزەهری من وتۆ بێ.

---

حەرامە وبەتامە.

---

حەسودی دەردە+کێ نەیبوو مەردە.

---

حەفتا پشتی+دەمار کوشتی.

---

حەماڵ بمرێ بەتاریف+دەیکەن بەنایب عەریف.

---

حەوت روحی تێدابێ، زیندوو نابێتەوە.

---

حازر بە قەرز مەدە.

---

حاری قوونی خۆشە. (حاری: حاڵی)

---

حەپەی مێش خۆر.

---

حەریف، حەریفی خۆی دەناسی.

---

حەق زێ دەوەستێنێ.

---

حەرار وحەرام نازانێ.

---

حەفت پشتیان، لەمزگەوتێکدا بەیەکەوە نوێژیان کردیە.

---

حەفت کفنی دڕی.

حەفت کوڕ دێنێ.

حەیران وساوەر قەت پیر نابن، کاروانی ئاش تەواو نابن.

حیز وئازا پێك هاتن، هەردوو وەکوو یەك هاتن.

حەق بە حەق. نانێکی ڕەق.

حوشتر بە بارەوە قووٚت دەدا.

حیلە هەر دەبێتە قیلە.

حوتم وتوتم

حوشتر بشمری باری کەرێ هەر دەبا.

حوشتری لە قەسابخانە مردار مەکە.

حکومەت حوشتر بەبارەوە دەخوات.

حەیای بوویتە حەیای پیاز فرۆشان.

حەیران لە دەرکێ ئاشی، حەیران حەللاقە و سەر دەتراشی، ئەگەر بەخۆشم ناخوازێ بمدە وەلاشی.

حەیران لە سۆفی لەری، بەقەلەندەری، سوند دەخوا بە پێغەمبەری، گەڕ هاتە سەر جۆتێ کەری

حەمەد خەنجەری کڕییە.

حەقی داسێ بدە کراسێ.

حەفت قومقومۆکی بکوژی بە بەرازەکی هەیە، حەفت بەرازی بکوژی بە کافرەکی هەیە.

حەزرەتی نوح فەرمووی: لەمن وابی لە خانییەکی دوو دەرکە، لە یەکەکیان چوومە ژورێ لــــــــــــــەوەی دی هاتمـــــــــــــــە دەرێ.
(خانی: خانوو)

حەپە حەپ لۆ سەی باشە.

حاری قوونی زۆر خۆشە
(حار: حاڵ

حاشا لە درۆزنی.

حاجی چاوت دەرێ، سەری خۆت دا لەسەر دەرێ، جاشولکەت دا بەپیرە کەرێ.

حاجی چاوت کۆرە، شفتیت دا بەگندۆرە، گندۆرە ناوی کلۆرە.

حیز و ئازا پێکهاتن، هەردوو وەکو یەك هاتن.

حەزرەتی غەوس دەست بە عومرتەوە بگرێ.

حەوت پەراسووی لە مێرد زیاترە.

حیلە هەر دەبیتە قیلە.

حەفت قوز وحەفت قوون.

حەفت پەراسووی لە ئۆمەتی محەمەد زیاترە.

حوشتر بشمرێ باری حەفت کەر هەردەگرێ.

حەیای باری کردیە.

حەمام بێ عارەق نابێ.

حەفت کوڕ دێنێ.

حەفت گیانی بێت، هەر حەفتی دەرچوو.

حەفت ڕۆژ بەر لەشەیتان لەدایك بووە.

حەیفە من بمرم، بە توو برێن تۆ خۆش.

ونجڕ ونجڕ کرایە.

حەق بەحەق، نانێکی ڕەق.

حەکیمی قسان: بەمەلا ڕەئووفە فەندی باوکی دڵداری گوتراوە، حەکیمی قسان لەزاری مەسعوود محەمەد.

(د.کەمال مەزهەر ئەحمەد لە کتێبی دڵدار بیرمەند شاعیری شۆڕشگێری کورد ل۱۱۹ – عەبدول خالق عەلائەدین)

حەقی کفن بەمن بڕێ، مردی گۆڕبەگۆڕ بێ!.

حەدی چییە؟

حەخفت دو دووکەسی،بەلەشی ()بەلاق ()شەش

---

حەتۆتە: وردە کیسۆڵکەی پەڕۆ بوو، ڕەشکە وشمریی تێ دەئاخنرا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل ٢٤٠)

حیز و ئازا پێکهاتن، هەردوو وەکو یەك هاتن.

---

حەزرەتی غەوس دەست بە عومرتەوە بگرێ.

---

حەوت پەراسووی لە مێرد زیاترە.

---

حەفت قوز و حەفت قوون.

---

حیلە هەر دەبیتە قیلە.

---

حەیا تۆریا و باری کرد،

---

# خ

خارخارۆکە، ماری خار[illegible] کێ یە! خاڵخاڵۆکە ماڵی خاڵم نیشان دە

خۆرە پۆتە: خۆڵ [illegible] خۆڵ وپۆتە، تەپوتۆز، کەرگەوز

خۆی لە خۆرە پۆتە وەر[illegible]

خاکاو: بریتییە لە [illegible]اشتن وئاو خستنە دێراوەوە تا بۆ چاندن بشێت جا ئەو چاندنە هەر تۆیەک یا ش[illegible]ێک بێت.

خڕ: هەمووی – گشتا

خڕتان وەرن، خڕ: وات[illegible]وێنێک کە ئاوی پێدا ڕۆشتبێ و وشکی کردبێ

خەپشە: دامێنی ژن[illegible]اشی ترێ خەپشە بڕێ

خەنی بوون: خۆش[illegible] بوون، دڵخۆش بوون، شاگەشکەبوون

خەلا: ئاودەستخانە

خەلیل کەوتە خەلایە

بەهیچ کەسی دەرنایە

خرمێش،خرمێش: ڕاکێشانی تفەنگ، (مێژووی کۆیە ل.١٤٤–تایەر ئەحمەد حەوێزی)

تاهیر حەوێزی نوسراو[illegible] (هەندێ تەقە دەکا و خرمێش خرمێش جونان دەدا)

خۆرە چەرەت لێ کەو[illegible]

(جنێوە وتووک لێ کردنە)

خێر لە عومرت نەبینی

خۆرکت لێ کەوێ (جنێوە)

خێڵەپەپە: خێل وخێ[illegible]

خێر وخۆشی لە خۆ[illegible]ەبینی

خم: مادەیەکی جلك پێ ڕەنگ کردنەوە بووە، خمچی پیشەیەك بووە لە کۆیە، جاران جوولەکە خمخانەیان هەبوو، مێردی پووری باوکم ودایکم ناوی مەلا معروفی مستەفا قەساب بوو سێ دووکانی هەبوو، یەکێکیان جوولەکە بەکرێیان گرتبوو وکردبوویان بە خومخانە...ناویان هاوون وداوود ومفقا ل بوو

لەخمت نێم واتە خۆشی لە مار و مندارتان نەبینن، ڕەنگی مۆرێکی شین باو بوو.

واتە خوم

خومخانە: خمخانە. شوێنی ڕەنگرێژکردنی جل

لە سپێرەی مێژووی هەزارەی سێیەمدا لە خومخانەی تاریلشانی ئێزەدا

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە– فازیل شەوڕۆ ل٥٢)

---

خرووکە: ئاولە. نەخۆشییەکە، خوریکە

---

خێو: مێمر، جندووکە، بەمانی (خاوەن)یش دێت، لەمەچێتر

---

خوشك ومریشکت بگێم

---

خێوەتی خارا: ئەو خێوەتەی لە ئاوریشم دروست کرا بێ

لە دامێنی چیا بۆ خەرمەنی گوڵ خێوەتی خارا

بە دوو ئەستووندەگەی زیوین تەناف زوڵفی هەڵداوە

(حاجی قادری کۆیی ل.١٢٤)

---

خووگرتن: ڤ گرتن

---

خواجە لەسەر شارییە، ددانی مرواریيە، خواجە نازناێکی جولەکانە

لە گەمەی (خواجە) دەکرا گەمەی منداڵان بوو (ل.٧٣ مێژووی شاری کۆیە نەجیبەخانی جەلیزادە)

---

خانم بەو نەرمییەی. تەندوور بەو گەرمییەی

---

خوایە هەڵکەی ڕەشەبایێ

بیدا لە تەختی سەرا یێ

کاکم سووتا لە گەرمایێ

---

خۆ بەڕوو نیم لە قەپێلکێ بێمە دەرێ

---

خۆ سەری منت بە کاوڕی مێ نەکڕی یە

خۆری (خۆڵ)ی لە دۆی خۆی کرد. تێکی دا

---

خرەژنی بەرەبەرە، خرەمێردی دەرەدەرە (یاخزمی ژن بەرە بەرە) خزمی پیاو دەرە دەرە

---

خوون (خوێن): خوون بەرچاوی گرتییە (گرتووە) بۆنی خوونی لێدێ، واتە شەڕی لێ دەبارێ

---

خوتورمە: ئەو دارەی پەل و تووی بڕاوە، قووت کراوە، قوتورمە – ئێختە

---

خەفەخان: کەسێك خەم بخوات و پێی خەفبار بێ، ژوورێك هەوا گۆڕکێی تیا نەبێت (خەفەخان بوو لە داخان)

---

خەپار: قەڵەو وگۆشتن.

لە کۆیە شەهێدێك هەیە بە ناوی (شێرەخەپار) نازناوی بوو (شێروان عبدالرحمن)

---

خەپەتۆرە: قەڵەو و گۆشتن. جووچکەکان خەپەتۆرە بووین

خەپە تۆرە بووە.

---

خێراندارپی: وەڵامی بەخێربێن

---

خێی (خوێ)ی لەخۆی دەکرد حەسوودی بە یەکێك ببا رەدی ئەو حەسودییەیە.

خێی لە دۆی خۆی کرد

---

خوا دەوامت دا: دوعایەکی باشە

---

خوا یار بێ، دوژمن هەزار بێ. خوا ڕاستان کا

---

خار وخوارزا، لێکتری ترازا واتە خاڵ وخوشکەزا

خار (خاڵ) خوارزا (کوڕ یان کچە خوشك)

خاران خوارزا مەزن کرد مامان برازا بزرکرد

---

خەم ودەم، جەم وژەم

---

خەسوو مارەکەی کلك لووسە. لەبۆ بوکان جاسووسە

---

خۆم و قەیناغ و داسم، حەرەسی کەریم قاسم.

(دروشمی شیوعییەکان بووە)

---

خوشکی بێ برا، شاری بێ چرا

---

خۆم وگونم، فاتیلەی ژنم

خۆ نانی لەسەر سێری نەسووتایە: واتە بۆ وا بەتاروکەیە، بۆ وا بەپەلە

خۆش باوەڕ چاوێکی کوێرە

خوانە کەرانێ: خوانەخواستە

خوچە: خوشك. کاڵەکی چاك نەگەیشتو

خەسی: خەساو. بۆ (کەر) و وڵاغەبەرزە بەکاردێت هێلکەی گونی دەردەهێنن ولە ڕەگەز دەکەوێ. جاران کۆیلەشیان دەخەساند.جوانە گاش دەخەسێنرێ

خۆی شێلوو نەکرد: خۆی نەشێواند، نەشڵەژا، خۆی تێك نەدا

خۆش داکەنە: لالەنگی

خشپە خشپ: هاتنی دەنگی مرۆڤ، یان خشەی گەڵا وشت

خۆ بخورێنە: پارە دەربێنە

خاوکە: بریتییە لە دارێکی پان کە چەند ئاسنێکی درێژ وتیژی پێوەیە جووتی پێدەکرێت وخاو دەکرێتەوە.

خاویلکە: بە مرۆڤی خاو وخلیچك دەگوترێ

خوشکۆرە: خوشك

خەم بۆ پیاوانە. خۆشی بۆ ژنانە

خوا بە هەندەکان دەدات بەخت، بە هەندەکان دەدات تەخت

خوا دەدا خوا گیر لێ ناگەڕێ

خەبەریەتی: ئاگای لێیە، دەزانێ، ڕاست دەکا، قسەکەی ڕاستە

خووسانەوە: نەرمبوون، تێگوشین

خێوەت: ڕەشماڵ، خێوەت لە چاو دروست دەکرێ، بەڵام ڕەشماڵ (تاوڵ، دەوار) لە مووی بزن دروست دەکرێ

خامەکەی (رەهبەر)ئێجگار ڕەنگینە
شیعر وپەخشانی جوان وسەنگینە
(محەمەد دارياس) مەبەست (ڕەهبەر)ی (سەید برایم)ە

خڕکە بەرد: بەردی خڕ

---

خەرابات: مەیخانە

---

خرچان: تۆپەڵە گەچی وشکبۆوە

---

خێ وترش: قسەبڕینەوە، دوو کەس قسان پێکەوە نەکەن، قسەیان نەبێ. (سلێمانی دەڵێن بەعزن)

---

خۆ کەری قازیمان نەگایە (نەگاوە)

بێگانە پێشکەوتن لە هاتوچۆی مانگایە (مانگ)

کوردیش تا ئێستا باری لەسەر پشتی مانگایە (مانگا)

کەم وکورتیمان چییە خودا خەلقی پێش بخا

با ئێمەش بگرێتەوە (کەری قازیمان گایە)گاوە

(باخچەی پیرانی سامی عەودالی شاعیر- لێکۆڵینەوە وساغکردنەوەی د.کەمال مەعروف)

---

خرار: جەواڵ

خرار: لە مووی بزن دروست دەکرێ

جەواڵ: لە خووری ڕەنگاوڕەنگ

---

خەملاندن: قرساندن بیخەملێنە با هەقەکەی بدەین

---

خێو: خاوەن، ماخۆ، خودان. دێو

داکی خێوی بگێم

---

خارا: بەردێکی ڕەق ولووسە

دەڵێن خارایە واتە باکی پێ نییە

ئەی خوا چ بکەم دڵم شێوا لەبەر هیجرانی یار

دڵ میسالی سەنگی خارا ڕۆیی بەونازداریە

دیوانی عاسم

---

خەپەم تەڕە مەیتراشە

خزمان گۆتیان زۆر باشە

---

خوشکەکت هەیە لەبالیسان. دەکا ترۆتسان نانی مە دەبتە سەپکی سەریان

پەندی کوردی:

چیرۆکەکەی عومەر شێخەڵڵا دەشتەکەی

خۆمان هەمانە، خوا نییەتی (خوا)

---

خەرمان لۆغە: لەکاتی هەڵگرتنی دانەوێڵە، خەڵکی هەژار گەنم داوای دەکات دەڵێن خەرمان بەرەکەت ئەوان دەڵێن خێر وبەرەکەت، بەشی دەدەن.

---

خەرەك: ئامێریکە بەن وداو هەڵدەکات بۆسەر لوولە، یەکێك قسە زۆر بکات وبیلێتەوە دەڵێن بۆتە خەڕەك هەر دەیرێسێ.

---

خوا لە زاری نەنۆری: واتە نەیەتەدی

دەڵێن حاجی فەتاح ئاغای غەفووری گۆتیەتی:

(کاولەکۆ)فقنەکۆ، تازەکۆ، ئاخیری دەبێ بە جۆ (خوا لە زاری نەنۆری)

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل١٢)

---

خدر وئەلیاس

ساربوو خەراس

(سار–ساڵ)

---

خوون: خوێن لە گۆرانی دا (هوون)ە

مەلای جەزیریش هەر بەشێوەی (خوون) بەکارهێناوە

هات دەر ژبور ج دپەنجەران، دل گرت ودا بەخەنجەران

ئەڵ رەنگە حالی دلبەران، لەو عاشقان (خوون)بوون جگەر

(سانسکریتی–سانسیکرێی سەرچاوەیەکی دێرینی زمانی کوردی حەکیم مەلا ساڵح ل٨٠)

---

خانی یەك کۆلەگە (کەپوو) (لووت)ە

---

خواستنامە إستعار

(هۆشیاری یاسایی–فوئاد تاهیر سادق ل٦٧)

خەت ولەت: واتە هەر خەتێکی جووت کردووە، لەتە نانێکی خواردووە

---

خۆ کەعبە کەچ نەبووە

---

خۆی لۆ خۆم وکچی لۆ کوڕم

هەركەس قسە بكا زگی هەردەدرم

خۆ (وەكاشە)نییە (با)لەپشتی خەڵك بگری

خولە باری دەكرد، بلە كەپری دەكرد

خار وخوارزایی مەكە

خوارزا: خوشكەزا

خاوەن بزن ومێش، دوایی دەبنە دەروێش

خوا خوایە، دونیا كاوبایە

خوا دار خورمای بەرزكردیە، تا حوشتر دەمی نەگاتێ

خواردنی شەو بێ هۆشییە

دوایی یەكەی نەخۆشییە

خۆت تازە هیچ، خوا روحم بە ئەولادت بكا

خوا یەكە ودەرگا هەزار

خۆشی، هەموو خێزانی پۆشی

خورما موتوربە نەكرێ، بەر ناگرێ

خۆی دەترێ، پۆلەكەی دەكوتێ

خوون بە ئاو دەشۆردرێت، نەك بەخوون

خوون: خوێن

خەلات: هەرچی خوا بیدات

خووپێوەگر: مدمن

(هۆشیاری یاسایی–فوئاد تاهیر سادق ل١٠٣)

خەڵتانی خوێن بووە: واتە لەخوێنا گەوزیوە

خوێش: قەوم، گەل، خزم

خەرابات: مەیخانە

خەزایی: باڵندەیەكە لە رەشۆلە تۆڵمەترە، رەنگی ئەرخەوانێكی كاڵ ورەشێكی دێزە بەهاران بەرەوە دەدەن بەسەر دار تووەكان ودەیكەنە زاقو زوقێكی زۆر.

شاخێکه لە مهاباد-سابلاغ
ناوێکه لە کۆیە
سبەی هەرمێ دەپشکوێ
ڕەوە (خەزایی) دێنەوە
کۆتری کێوی
چۆن هێلانەی لێ ون دەبێ
(حاجیلەکانی دەشتی هاموون-ئازاد دڵزار ل٣٦)

---

خۆ بەزمانی خۆشم نەڵێم
خوونی لەقەلبی دانەمایە
(بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخوتنی کوردی-مەسعود محەمەد ل٢٧)

---

خوونی خۆی کردە کاسەوە

---

خوونی بخواتن ئۆخەی نایە

---

خێری خۆت وشەڕی خۆم

---

خێرا مەڕۆ بکەوی، هێواش مەڕۆ دوا بکەوی

---

خێر وشەڕی بەرامبەر یەکن

---

خوون لەچاوی دەباری

---

خوشکەزا هەیە، خوشکەقەزاش هەیە

---

خودا کەریمە، کەریم ترێنیشە

---

خودا کە دەردی دایە، دەرمانیشی دایە

---

خودا عومری نووحی داوەتێ

---

خودا بەڕوحمە بەڵام شەدیدول عەقابیشە

---

خودا رازقە بەڵام ئحمێکی دەوێ

---

خودا دەیزانی زمان ناوەستێ
بۆیە حەپسی کرد هاویشتیە بەستێ

---

خوابکەم قەت نەبوونی نەبینی

---

خزمی خەزووری سەپانی شێخی

خەنجەری لێ دەی خوونی لێ نایە

خەنجەر لەکایەیە

خەڵک کاغەزی سپی دەخوونتەوە

خاکی لە توورەگەی دا بێژرایە

خراپ لە خراپترین چاکترە، خراپترین لە خراپ خراپترە

خۆیان دیوە بە ئەسپەوە
بە هەگبەی پڕ لەقەسپەوە

خۆی لێرە نییە، خوای لێرەیە

خۆی کردووە بە کەرەی شەربەت

خۆی دەمی خوار بوو، دەمیشی لەخەڵکی خواردەکردەوە

خۆی کۆسەیە، بەریشی خەڵکی پێ دەکەنێ.

خۆی پەڕاندەوە، ئەوپەڕی دونیا

خۆم وداریێك، وام لەشاریێك

خۆشی ڕابواردن بەدڵی پاکە، ئەوەی دڵپاکە بێ باکە، چاکە

خۆزگە یادەبووە خاوەن قەرزلێم. لەهەموو جێیەك دەهاتە سەرڕێم

خۆشەویستی چەند چاوی هەیە. بەس نایبینێ

خۆت شێت مەکە لۆتۆ دەرنایینی وتی دەچی

خۆت بەهێشی دەرزی دەناری (دەناری: دەناڵی)
سوژن لەخەرك راكەی ئەوها منداری
(منداری: منداڵی)

خۆ مار نییە بەخۆڵ بژی

خۆ کەرەباب نیمە بەدەندووك شەربکەم

خۆ عیلمی غەیبم لەکن نییە

خۆ دەستی خۆم بۆن نەکردییە

---

خۆ ئەو سەرەم لەبەر هەتاوێ سپی نەکردییە

---

خەنە کە زۆر بوو لە گونانی وەردەسوون

---

خواردنێك هەیە پیتی (ی) لۆ زیاد بکەی دەبێتە ناوی ئۆتۆمبێلێك

(لۆر-ی)

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٢)

---

خوری پیرە مەڕێ. دەتنێم لەبن بەڕێ لە بۆ ڕۆژی خێر وشەڕێ

(بەرماڵ)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٢)

---

خواردنێکە هەتا خوێی لەپاڵکەی تامی ناگرێ

(هێلکەی کوڵاو)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٢)

---

خواردنم بدەیە دەژیم-ئاوم بدەی دەمرم من کێم

(ئاگر)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٢)

---

خۆشە گووشە. خۆشە مووشە

(هەنگوین-شەمەە)

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٣)

خڕار نییە ئاردی لەناوە، لەقۆڕە وپەڕۆیان تێناوە، لەژووری یە قیت وەستاوە

(کەندووی ئارد

---

خوری: پلەیەکی ئاینی، لەنێو مەسیحیەکاندا، پلەکانی ئاینی لەکلیسادا ئەمانەن

(شەماس-قەشە-خوری-مەتران-پاتریەك-کاردیناڵ-پاپا)

(مێژووی هەرمۆتە-د.هاوژین سلێوە ل٢٥)

---

خانەدانی ومێوانداری ونانداان لەشەڕە تفەنگ چاکترە

---

خۆی بەتڕاندن دەدا

---

خۆرە: مکعب

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦١)

---

خەپە،هەپە: چەند پارچەدارێکی خڕ وەیا ئاسن لەناو کونی مژانە وباسکە هەوجار دەتدرێ بۆ بەستنەوەیان لەگەڵ یەکتر

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٢٤)

---

خونبزە: چەند زەلامێك بوون نانخۆر وپیاوی ئاغا بوون، هەموو تفاق وخەرجیان لەچەك و ولاغ وخواردن لەسەر ئاغا بوو بۆ دزی وڕێگری وچوونە سەر خەڵك ودژمنانی ئاغا ومالٌ سوتاندی ڕادەگیران

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٢٥)

---

خرینگی: گریان بەهەنیسکەوە

لە خرینگی (چۆل)ستانەوە

بەرەو قەڵای (ئاوارە)ستان

لەوێوە ڕا

بۆ سنووری (پەژارە)ستان

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل٥٧)

---

خەڕەك: ئامێرێکی کۆنی ڕستنە

ژینگەی ئێرە و

خەڕەکی کەونی گۆڕیوە

نایبنیت

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل٩٩)

---

خەپڵەستوور: قەڵەو وخەپە

---

خۆشی هاوسەرگیری نامێنێ. ئەگەر ژن پاڵپشتی پیاو نەبێ.

(د.کەمال مەعروف)

---

خۆی مامرە وهێلکەی قازکەبێك

خۆی مریشکە وهێلکەی قاز دەکات

(سێگردکان وسێبەر ونشینەکانی-ئاراس ئینجاخی ل٢٤)

---

خوریکە: نەخۆشییەکە خوران وبرینە درمی یە بلاودەبێتەوە

---

خۆ لە ئامە دۆمی نییم

---

خەدگە: جێگای خەوتن، شوێنی نوستن

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٩٢)

خۆی چڕ کردیتەوە

---

خۆتازەنییە حەفت زەمانە

---

خۆت لەئیشان، هەرمەقورتێنە

---

خۆ هەناوی دانەرزایە

---

خەڵك دەتوانێ لە دینی خۆی دەربچێت، لە وەتەنی خۆی دەربچێت بەڵام ناتوانی لە قەومی خۆی دەربچێت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٣)

---

خەریك بوون بە سودی شەخسیەوە یاسای سروشتە وداخوازی ژیانە، بگرە داینەمۆی مێژووی کۆن ونوێییە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٦)

---

خەفەکردنی هەناسەی ڕەخنە لە هەناوی ڕەخنەگردا دەبێتە ئیفلاسی فیکر، کە فیکریش ئیفلاسی کرد ماددەش بەدوای ئەودا کز دەبێتەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٤)

---

خوا بەقسەی نێرەکەری بکردبایە، دەبوو (سار)دوانزەمانگ بەهار بایە (سار: ساڵ)

---

خزم ئازاری هەیە. بێزاری نییە

---

خۆ نان وپیازم لەگەر نەخواردییە (لەگەر: لەگەڵ)

---

خۆت پێوە ماندی مەکە (ماندی: ماندوو)

---

خوشکی خارته وپلکیشت نییه (دایك)ه (خار: خاڵ) (پلك: پوور)

خڕیڵ خڕیڵه، لەبن بەردیله، ئەوەی نەیزانێ پێی دەرێم گوجیله (پێی دەرێم: پێی دەڵێم) (گوجیله: توتکەسەگ)

خاوریس: ئەو قوماشەی بە خاوی ڕسترابێ

خاتر جەم: خاتر گرتن، دڵنیایی

خاتر جەم بە

خۆی لێ خۆش کردیه

خۆزگە بە خۆم کەرم نییە، لەجۆ وکا خەبەرم نییە.

خۆزگە بەوەی خۆی باش ئەناسێ. خۆی ناخاتە ناو هیچ دەنگ وباسێ.

خۆزگەم بەو کەسی خوای لێ ڕازییە. مەریە، شێخە، بەگ یان قازییە.

خواردنی شەو بێ هۆشییە، ئەنجامەکەی نەخۆشییە.

خورما موتوربە نەکرێ، بە نێر ومێ بەر ناگرێ.

خوێندنی قورئان سەرچاوەی نوورە. بێ نوورە هەر کەس لە مەعنای دوورە.

خێر وخێرا دوای مردن، بێ سوودە

خاوەنی قسەی خۆی نیە .

خەتا بارە، تۆبە کارە

خەڵەی خۆم و گەڵەی خۆم .

خەمی کردووە بە جامانە، وورگی بووە بە هەمبانە .

خەو برای مەرگە .

خەنجەر لە کا دەدات .

خزمی ژنان بەرە بەرە، خزمی مێردان دەربەدەرە .

خوا بۆ یەکی دروست کردوون .

خوا بدات مرازم ،حەوت ژنی لۆ بخوازم .

خوا بیبڕێت خازە ڕشکن، بەسەر مندا خۆی کرد بە ژن .

خوا پێ بە (مار)نەدات

خوا خۆی دەمێنێت و موڵکی

خواردی تیکە. کردی فیکە .

خواشی دەوێت و خورماشی دەوێت .

خوا ڕۆژ پێشانی  ماری سڕ نادات .

خوا نەجار نییە. خوا تەختە تاشە، دوو بەندەی خراپ بۆ یەکتری باشە .

خوا هەتا سەر بدات، ڕزگیش دەدات

خۆت مەکە بە ماشەی دەستی نامەرد .

خۆ خومخانە نییە تێی هەرکێشیت .

خۆشیی بنۆشیت، دەبێت تاڵیش بچێژیت .

خۆی لێرەیەو کلکی لە بەغداد تۆز دەکات .

خۆشی بێ، ترشی بێ هەر ئەوەیە

خەرتە: کێڵانی زەوی دوای بارانی پەڵە لەزەوی بەیار یان پەرێز دوای خەرتە کردن دادەچێنرێ بەدەغڵ

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٩)

خەنەکی: خۆگری

ئەو پیشەیە تانجی فێری دەبێ کاتێك کەپیر دەبێ وتەمبەڵ دەبێ باش نێچیر ناگرێ وخۆی ماندوو ناکات.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٥)

خۆمن لە قەڵەم بەولاوە هیچ شتێکم نەبوو

خۆ تەفرە داز گەپێکی نا قۆڵایە

خەریکی نووسین و خوێندنەوە بم دەبێ قەڵەم بکەم بە چەتاڵ و پەڕەکاغەزی پێ بکەم بە پاروو

خوا ماڵی داوه به كەر، كێری داوه به نێرەكەر

خەزێنه هەمیشه له كەلاوه شاراوەتەوه.

خاك مەیل بڕه.

خەبەر بنێرن لۆ میران، نۆكەر نۆكەر مەگێران.

خزم خەزێنەیه، بەبێگانه مەیگۆڕەوه.

خودا ئەگەر قۆچی بەكەر بدایایه. زگی تەواوی خەڵكی دەدڕی.

خودا بدا مەرگم، زاوا نەكا بەرگم.

خودایه لەبەر بەشت مرم، قەلیش دەڵێ: من كۆترم.

خورماش له بەغدا زۆره.

خوشكی بێ برا، وەك داری بێ گەڵایه.

خۆی له بۆ ڕاوچی دەكوژێ تاژی، تا كەرێ نەبێ ئاقڵێ ناژی.

خۆی لێره نییه، خوای لێرەیه

خەمم ئەو خەمەیه

خۆ هێلانه پەرەسێلكەی تێك نەدایه

خەڵات، هەرچی هات

خورما بەدنك

دۆشاو بەكلك

(دنك: دەنك-قل-دانه)

(كلك: پەنجەی دۆشاو مژه)

خێرزه: كۆمەڵێ دەوەنی گەوره وبەچرِی

گیان (خێزرەی مانگه شەوێ)هەیه

مانگ بەدەركەوێ، شەوق دەداتەوه.

خاو خواردن گووكەره، تراشین لۆ ڕیش و سەره

خەسوو، بەردی بن پەراسوو

خەسووی پیره ورچێ، ئاگرت بەربێته پرچێ

**خەنی لە مێشان، کەران گون دێشان**

---

**خەوی سبەینان، مەدە قونەبانان**

---

**خزم زۆر بن. با گاو کەر بن بەگاو گۆربێ**

---

**خشکەی کەوامان دێ، قۆڕەی هەناومان دێ**

---

**خوا ئاگای لە مارو مێرووی هەیە**

---

**خوا پیرتەکا. لەبیرت ناکا**

---

**خوا یاربی. با دوژمنُ هەزار بی**

---

**خۆرو دۆی بەسەر داکرایە**

---

**خۆشەویستی دەردو دەرمانە**

---

**خۆشناو بی غەش نابێ، سوورچی بێ سووچ نابی**

---

**خۆی دیتیە بە کەوێێ ئاغە ژنێ، خورامی دەوێ**

---

**خۆشەویست مردە نەبیت**

---

**خۆم دیتی یە بەکوێ**
**ئاغا غولامە دەوێ**
**ژن دەڵێ**

---

**خۆکەڵی سایە بەت نەبڕی یە**

---

**خۆی وبەختی خۆی.**

---

**خۆی وخوای خۆی.**

---

**خاپەرۆك:** پاشماوەی دەنکە دانەوێڵەی دوای هەڵگرتنی جۆخین وکاوکۆتە، کە لەپاش هەڵگرتنی کاودان لەسەر جۆخینان دەمێنێتەوە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٤)

---

**خرێنە:** جۆرە بەنێکی مووی ڕەشانە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٠)

---

**خاوك:** ئەو بەنە بوو بۆ تێوەڕێخی مافوور بەکاردەهات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٢١)

---

خۆشدۆ: ئەو ئاژەڵەی لەکاتی دۆشیندا شیری باش دەدا وکونی گوانەکانی فراوانە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٦)

---

خەرمان لۆغە: چەند مشتە دەغڵ ودانێك بوو لەسەر جۆخینان دەدرا بە مندالانی گوند.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٥)

---

خێلۆك: واتا شینبوونەوەی دەغلودان لە پەرێز.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣١)

---

خەپە: دارێکی پان بوو، درێژاییەکەی بستێك زیاتر نەبوو، بۆ بەرزی ونزمیی نووکی گاسن بەکار دەهات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧)

خاتری خاتران: بەهۆی هەبوونی ڕێزی چەند کەسێکەوەیە.

---

خاپەرۆك: بەرماوە

---

خامەك: جۆرە قوماشێکە.

---

خانچی: ئەوەی سەرپەرشتی خان دەکات

---

خاوك: ڕێسراوی خوریە بۆیەکمجار، بەلام ئەگەر دووەم جار بابدرێتەوە ناوی دیکەی پێدەڵێن.

---

خەفۆك: ئەو گایەی لەکاتی جۆتکردن دەنوێ.

---

خەرتە: زەویەکە دووجار کێڵدرابێ.

---

خەربەندە: دارەوان

---

**خەرفایە:** هۆشی نەما، زیاتر بەو کەسانە دەگوترێت کە پیر بووینە. لە (خەراف)ی عەرەبی هاتووە کە واتای قسەی بێ واتا وبێ سەروبەر دەگەیەنێ (خرافە)ش هەر لەوەوە هاتووە

---

**خەرمانلۆغە:** دوای ئەوەی بەشی ئاغا لە خەرمان دەدرا، منداڵان بەجام وتورەگە بۆ گەنم دەهاتن. خاوەنەکە گەنمی دەدانێ منداڵان دەیانگۆت خەرمان لۆغەی ئێمەبەرەکەتی کەوتێ.

---

**خەسولکە:** ئەو قامکە قەسەڵەیە لە قورفانگەکەی گوریسی بن ملی ئافرەتان گرێ دەدرێ تا ئێخەی نەبیتەۆە، واتە وەکو خەسوو وایە لە بووك نابیتەوە.

---

**خەفتە:** تێکەڵەی قوم وچیمەنتۆ لەگەڵ ئاو جاری واهەیە چەگڵیش تێکەڵ دەبێ.

---

**خەفتی:** بێجگە لە واتای خەوتن واتای خۆ جوانکردن وئارایشکردن دەگەیەنێت. خەملاندن.

---

**خەفك:** داو. داو دانانەوە.

---

**خەلانە:** شوێنێکی بێ هەست وخوستە تایبەتە بە هێلکەکردنی مریشك.

---

**خەلفە:** کەسێکە هێشتا نەبوویتە وەستا ویارمەتی وەستا دەدات.

---

**خەمرچی:** ئەوەی دەغل دەخەملێنێ بۆ ئەوەی باجی بکەوێتە سەر.

---

**خرچە:** جۆرە گندۆرەیەکی مەیلەوسۆرە.

---

**خرشك:** جۆرە گڕوبونێکی مەڕوماڵاتە بەجۆرێك کرم هەردەینێ.

---

**خروە:** کۆبوونەوەی بڕواداران لە ژوورێك بە مەبەستی خوداپەرستی بۆ ماوەی مانگێك یان زیاتر بە خواردنێکی کەم، لەخروەدایە.

---

**خمچی:** ئەو کەسەی جلێك لەخم دەدات کە ڕەنگەکەی کاڵ بووبێتەوە.

---

**خودار:** جۆرە نەخۆشیەکە بە بەردەوامی لەگەڵ مرۆڤی نەخۆش دەژی بە دڵتەنگی کاری تێ دەکات ولە سلێمانی پێی دەڵێن فێدار.

---

**خۆی تێکە:** پەلاماری بدە، برۆ

---

**خێ دانکە:** تورەگەی خوێ.

---

**خاتوو شەمام.** هەر لەحەمام.

---

خاك له زستانا گەرمە.

خاك وئاو سارد ونەرمن+با وئاگر توند وگەرمن.

خاك، دايكە وئاگر باوكە.

خاك، ڕۆڵەی خۆی لەباوەش دەگرێ

خاوەنی باخ وبێستان+شەرمەزارن له زستان.

خاوەنی باخ، خەفت زۆرتر دەخوات له مێوە.

خاوەنی زوڵم وزۆرە+كه چێشت وكەباب خۆرە.

خاوەنی قسەی خۆی نییە.

خراپ، تاریفی كردی+سەیری خۆت كه به وردی.

خزم، پەرژین دەشكێنێ.

خزمان بۆیان خوارد، خۆی هەناسە سارد.

خزمت مار بێ+با هەزار بێ.

خەنجەر، كێلانی خۆی نابڕێ

خوا بەشی زۆرە+دەیدات به نۆرە

خوا پاكمان كا ولەخاكمان كا.

خوا دنیای ژێرەوژوور نەكردووە

خوا ماڵ دەدا بەجوو، بلوێریش دەدا بەگاوان.

خوا ماڵ ئەدا بۆ خواردن+نەك بۆ تەماشاكردن.

خوا هەر ئەو خوایە+بزن سوار گایە.

خواردن لەسەر ئاگرە+نۆكەر لەوێ حازرە.

خواردنم پیازبێ وقات ونیاز بێ

خواردنی باز، لایەقی جووچكە نییە.

خودا پێ بدا بەمار+كون دەكاتە دار.

خودا پێیداوە ونازانێ بیخوات

خودا، دەرد دەدا بە دۆستانی خۆی.

خودا، هەرچی پێدابو، لێی وەرگرتەوە.

خوری وموو تێکەڵ نابن.

خورما بە دەنك ودۆشاو بە پەنجە.

خوارزا لای خاڵ مەزنە+برازا لای مام بزنە.

خووی کەر، ترینە

خوێن وئاوی تێکەڵ بووە.

خوێن وفرمێسك وئارەق، بێ سەرەنجام نین.

خوێنی کەس لە کەس ڕەنگینتر نییە.

خوێری وئازا پێك هاتن+هەر وەکوو یەك دەرهاتن.

خوێری وماقووڵ+دەمرن بۆ پووڵ.

خڕ بێ ومڕبێ+هەر سك پڕ بێ.

خۆت بپارێزە لە سێ شت، بێ حەیا، سەگ، پردی ڕووخاو.

خۆت بکە تێر وبەکەس مەکە خێر.

خۆت فڕێ دا لەبەرزی+خراپ دەدەی لە عەرزی.

خۆت مەدە بە کوشت+بۆ بێگانە وپشت.

خۆر گەییە دەم کەل+تەمەڵ کەوتە پەلەپەل.

خۆر هەڵهات، چرات ناوێ.

خۆر، لەخۆرئاواوە هەڵنایە.

خۆشە خێ+بەلاّ بەجێ.

خۆشە دۆشاو فرۆشی+کەس نەیبا وخۆت بینۆشی.

خۆڵی بێژراوە وخشتی پێژاوە.

خۆی بێفەڕە وقەبری مەڕمەڕە.

خۆی ڕەنجی دەبا- خەڵك گەنجی دەبا.

خۆی هەڵدەکێشێ وناچێتە پێشێ

خەپلەی جۆ دەخوا+دەستی بەسابون دەشوا.

خەرج، لەخلە وقەرز، لە بلە.

خەرمان سووتاو، لە ئاگر ناترسێ

خەریکی ڕیشی؟+جێماوی ئیشی

خەلە، لەماڵ وبەفر لەچاڵ بۆخۆت دانیشە بێ خەیاڵ.

خەلەی خۆم گەلەی خۆم.

خەو برای مەرگە.

خەوی ڕۆژ سەختە، خەوی شەو نەختە.

خەڵکی بەشەڕەگەڕەك+دەبن بەدژمنی یەك.

خەیاڵ پڵاوە، هەتا چەوری بێ باشترە.

خێر بێ وبێر بێ+چش با دێر بێ.

خێڵەوخوار وخێڵەوژوور+بزنە قوتەوجاجمەسوور.

خودا لە ئاخی هەموو کەسێکە

پەنای بۆ بەرە، فریاد ڕەسێکە

(محەمەد دارياس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

خۆت لەگەڵ چاکە وڕاستی ڕابێنە

دەست بەسەر منالی بچوکدا بێنە.

(محەمەد داریاس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

خانی خۆم کونە قوڕە، لە قەسری میر وئاغان خۆشترە.

خراپیان تێگەیاندیی.

خراپ نوستیی.

خراپ هەستاویی.

خڕ بێ ومڕ بێ، هەر کوڵ پڕ بێ.

خۆ ئاسمان ناڕووخی.

خۆ کابە کەچ نەبووە!.

خۆ مریشك نییە لاقی ببەستم!.

خۆپەسەندی مایەی ڕیسواییە.

خۆهەرکێشان عەیبە.

خۆزگە بەو باغە ورچ لێی دەتۆرێ.

خۆزگە بەو جێیە مەنگوێفی لێیە.

خۆشی خۆشیم بوو کچم دا بە شوو، ئەویش هاتەوە هەژگەلێك لە دوو.

خۆ شەمامە نییە بۆنی پێوەکەم!.

خۆ هێلانە پەڕەسێلکەی تێك نەدایە!.

خۆمانە خۆمانە دەکات.

خۆی دەترێ ولەبارگیرەکەی دەدا.

خۆی دەخواتەوە

خۆی لێ خۆش کردیە.

خۆی لێ مات دایە

خۆی بەگان دا.

خۆی بە گورگاز خواردن دا.

خۆی بە مەلەوان دەزانێ و لە تەنکاویشدا دەخنکێ.

خۆی لە قەرەی نادا.

خودا لۆ خۆی ئاگای لێیەتی.

خودا بدا بەخت دەچێتە سەرتەخت.

خوا بیبڕێ دەوری زەمانە، مەلا گانی دەوێ سەرقەڵەمانە.

خوا پشتیوان بێ

خوا پەکی کەس ناخات.

خوا نەجاڕ نییە وتەختەتاشە، قەحپەوگەدا بۆیەك باشە.

---

خودا چاكی دابوویەی، نەتزانی بیخۆی.

---

چاك كردیان، بەڵام خراپ خواردیان.

---

خوا خوایەتی.

---

خوا لۆ خۆی ئاگای لێیەتی.

(لۆ: بۆ)

---

خوا خۆی دەمێنێ وموركی، پشیلە نامێنێ وكوڵكی.

(موركی: موڵكی)

---

خودا دەردی داوە، دەرمانیشی لە كنە.

---

خوا وڕاستان.

---

خوا غەزەب لە دار بگرێ، دەیكا بە چەقەنەی ئاش.

---

خوا مار دەدا بە جوولەكە وكێر دەدا بە نێرەكەر.

---

خوا لەو سەرە ئاگای لێیە.

---

خوا لێم بە گوناه نەگری.

---

خوای گەرمیان وكوێستان هەر یەكێكە.

---

خوایە ڕازیم بە بەشت.

---

خواردی تیكە، كردی فیكە.

---

خودا دنیای لۆ سەیر وسیاحەتی خۆی دانایە.

---

خودا دەست بە عەمرتەوە بگری.

---

خودا سەد ئەوەندەت بداتێ.

---

خودا سەد ئەوەندی بێنێتەوە جێ

---

خودا گەورە وگچكەی دانایە.

---

خودا هەموو دەركان داناخا.

---

خوون وبەخوون ناشۆرێتەوە.

---

خوون نابێ بە ناو.

خەپڵەی جۆ دەخوات، بە سابوون دەست دەشوات.

خەتای من چییە بە ختەکەم شەڕە، کۆچم ئاوێتەی کۆچی سەگ وەڕە.

خەسوو قەت بووك نەبوبی!.

خەسووی چاك، باشترە لە جووتێك هێستر.

خەرك کاغەزی نەنووسراو دەخوێنێتەوە.

(خەرك: خەڵك)

خەنجەری لێ دەی، خوونی نایەت.

خەنی لە خۆت

خۆشی لە خۆت

خەو و کەو لێك دوورن.

خەو لە دوای نان، میز لەدوای گان.

فەقیر تێرە، خەوی خێرە.

خەوی مەردان، لەسەر بەردان.

خێر لۆ مەلا، نەرێ وەڵلا، خێر بکا مەلا، مەعازەڵلا.

خێرت نییە، شەڕ لەوێ رابوەستێ.

خەنجەر، تا لە کالاندایە بە جەوهەرە.

خوا دەرد لەقەدەر تاقەت دەدات.

خزمی بەرێ، بەرەبەرە، خزمی پشتێ، دەردی سەرە.

خوا چاکی دایتێ، ئەگەر بزانی بیخۆی.

خۆکردی، دەرمانی نییە.

خوا ئەو خوایە، بزن سواری گایە.

خۆتی لێ کەڕ کە.

خوا دەیدا، بەلام بێ ئحم نابی.

خۆ سەری منت بەکاورەمێ نەکریە.

خوادا بینووسێ، قەڵەم بکا کار. ژن لۆ پیاوی پیر، کچ لۆ هەرزەکار.

خوایە ئەو ڕۆژە لۆ نەتکوشتم؟

خۆزگە دەمردم وئەم ڕۆژەم نەدەدی.

خۆی وگونی.

خوایە ڕازیم بە بەشت.

خەنجەر لە کا دەدا.

خۆ تێیدا نەشکایە!.

خۆی لۆ خۆم وکیژی لۆ کورم. هەرکەس قسە بکا زگی دەدڕم.

خەتای من چییە بەختەکەم شەڕە، کۆچم ئاوێتەی کۆچی سەگ وەڕە.

خۆ شفتیت لۆ نەخۆش نەهینایە.

خزمی بەرێ، بەرێ بەرێ، خزمی پشتێ، دەشتێ بە دەشتێ.

خودا بەخت بدا، تەختیش دەدا.

خنکاو هانا لۆ پووشیش دەبا.

خوا یەکە وشوو یەکە.

خۆت ببینە وخۆم ببینە.

خوا نەجاڕ نییە وتەختەتاشە.

خوا بینووسێ، قەرەم بکا کار.

(قەرەم: قەڵەم)

خێر لۆ خوێش، نەك لۆ دەروێش.

خەم هەیە وخەمرەوێنیش هەیە.

خوا کراو دەکا لۆ بەڕوو عەیبی بزنیشی خستەڕوو.

خوا کێر دەدا بە نێرەکەر

خێل لەناو کۆران پاشایە

خێڵ بوو گەمەی بەچاوساغان دەکرد.

خوونی لە قەلبی دا نەما.

خورادن گەندو گووە، کۆر رەنگ ورووە.

خواگیری، نەك بەندە گیری.

خزمەت بەنامەردان وەك خزمەتکردنی باغی بێ میوەیە.

خەسـوو دەرێ خەسووسـم لـە کۆرانـان جاسووسـم، خەبـەری بووکـان دەنووسـم.

(دەرێ: دەڵێ، کۆران: کۆڵان)

خەسووسە، دایم لەدوای بووکان جاسووسە.

خەتی خوار، لەبن سەری گای بنەیە.

خەپەم تەرە مەیتراشە، خزمان گۆتیان زۆر باشە.

خاوەن ویژدان لە گۆڕ ناترسێ.

خاکی لە تورەگەی دا بێژرایە.

خۆ گون نیت سەگ بتخوا.

خۆی شێت کردییە.

خۆ (قونجرکەی)لە ژنە دۆمی نەدایە.

خێر لۆ مەلا، ئەرێوەڵڵا،

خێر بکا مەلا، مەعازەڵڵا.

خەو برای مەرگە.

خەسوو دەترێ، تەخسیر لە بووکە.

خەو هات و مەرگ هات.

خزم خەزێنەیە، بە بێگانە مەیگۆڕەوە.

خوا چاکی دایتێ، بیخۆ.

خۆزگە بەو باغە ورچ لێی دەتۆرێ.

خۆت وەکیل بە

خۆی ڕەنگ دز کردیە.

---

خێی لێ کەوتە ئاوێ، گوتی: با خێری بابم بێت!.

(خێ: خوێ)

---

خۆ چاوم هەیە.

---

خوا ئەو خوایە،بزن سواری گایە

---

خورانی بن پێ: ئەگەر کەسێك ژێرپێی بخورابایە دەیانگوت سەفەرت لەبەرە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٠)

---

خاکاو: ئاودانی زەوییەکی وشکە بۆ نەرمبوونەوەی بەمەبەستی کێلان وکردار.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٨)

---

خورانی سەری لووت: ئەگەر کەسێك لەکاتی نانخواردندا سەری لووتی بخورابایە دەیانگووت میوانمان دێت.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان–حەمید ڕەشاش–ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٩٦)

---

خۆپەنـدمین: لەناوچـەی خۆشـناوەتیدا خۆپەنـدمین واتـا خۆهەڵکێشـان یـان خۆهەڵدانەوە.

---

خۆکەلی سایە بەت نەبری یە

---

خودا گەورە و گچکەی دانایە

---

خوا خۆی دەمێنێ و مورکی.

پشیلە نامینێ و کورکی.

(مورك: موڵك، کورك: کوتك)

---

خوا مار دەدا بە جوولەکە و کێر دەدا بە نێرەکەر.

(مار: ماڵ)

---

خێرە و خوار وخێرەو ژوور

بزنە بەرەو جاجمە سوور.

---

**خانووی خۆم کونە قوڕە**

**لە قەسری میر و ئاغان خۆشترە.**

**خۆی پێوە خەریك ناکات.**

---

**خەو وکەو لێك دوورن.**

---

**خارەکەم هەیە لە دەشتێ، قەڵتارە گووەکی لەپشتی**

**(قالۆچە)یە**

# د

دەست و پێ: خزمەتکار، خەمەتچی، نۆکەر، خورماکار

ماچی دەست و پێی ئەمیری دەستگیری حازرە

شێتە حاجی ماچی لێوو دەستی دەست وپێ دەکا

(حاجی قادری کۆیی . لاپەرە ٤٧)

دەست و پێی ئەو پادشاهی حوسنە کۆیلەم پێ دەڵێن

هێندە ئەنگوستی پەشیمانیدا لە حەسرەت گەزتووە

(ل. ١٢٠ حاجی قادری کۆیی

---

دەست وپێ سپیە: هیچ نازانی

---

دەبۆ: عەمباری چەك و تەقەمەنی هەر پاش چەند ساڵی ترتەسخیری

بەغدادیش دەکا شارەزووری قشلەیە دەبۆ لە بانان دادەنی

(حاجی قادری کۆیی)

دەبۆ: پارچەیەك ئیستۆپی ئۆتۆمبێل

---

دارك و دور: بەخوای مەزنی ئەو دارك و دورەم پێ ناخورێ،من روحەکەی دەخۆم

(شەوچەرە ل٢١-تایەر ئەحمەد حەوێزی)

---

دوو دەو: قازمە، پاچ

---

ددان: دان، دگان

---

دەستەیە: نەکورتە نە درێژ

---

دەستەیەك: واتە ١٢ دانە جەند ژمارەیەك، دەستەیەك چا

---

دەست قوچاو: رەزیل چرووك، قرچۆك

---

دار دولك: ئەو دارە دوو لکی هەیە بۆ دارلاستیك لەسەر شێوەی

---

دەستە باشی: سینی بچوك

---

دەسکەلا: لە یاری موشێنی شای کەلایەکانە، بە کار دێت (مەلا گوون دەسکەلا)

---

داك حەكاوی: ژنێك بە خراپ باس بكرێ

---

دوكانی بابت كرایتەوە: واتە زنجیری پانتۆڵەكەت كرایتەوە

---

دەر لە عاز: یەكسەر، فەوری، دەستبەجێ

---

دەردەكورتان خوو، فێ، یەكێك ئەگەر میكرۆبی گەزاز چووبێتە ناو برینێكی وتووشی ددانە چیرە دەبێ وئەگەر زوو دەرزی نەگاتێ دەیكوژێ

---

دودڵ مەبە: ڕای خۆت جێگیركە، دودڵ مەبە بیكرە قازانج دەكەی

---

دەهری: پەست – توڕەیی – نیگەرانی. سەید برایمی حاجی سەید سەعید یەكەم جار لە سەرەتای شعر دانان نازناوی (دەهری) بووە بە عەرەبی مانای (زەمان) سەردەم دەدا (دهر) الدهر یومان یوم لك ویوم علیك... (ئیمامی علی)

دەهری: توڕەیی

دەهر: هەزار ساڵ

---

لەكون وقوژبنی كەلاوەی دەهـــر

چەندی تر هەن میسلی گەنج وگەوهەر

(حاجی قادری كۆیی ل ٢٢٠)

---

دەمار گرتن: تووڕەكردن، دەمارم مەگرە !

---

درێژبوون: ڕاكشان، پاڵكەوتن

---

دیق – جیق: دیقم كرد، جیق

ئەم لا تات و ئەو لا تات

وەی بابە جیقم دەرهات

(ئەسپێیە)

---

دەرابەكەت داخە: زنجیرەكەت داخە

---

دۆن: رۆن. غیرەت، دۆن، كابرایەكی بی دۆنە

---

دێرە قۆڕ: پیروپەكەوتە، دەڵە قۆڕ، جنێوە بۆ ژنان بەكاردێت

---

دەبا نەیدابا. گەر دای لۆ پەشیمانە

---

دارسێو بەسێوەكانیەوە جوانە

---

داك و دۆت، بووینە جۆت، دنیا سۆت

داکۆنی: ئەو رۆڵەی دایکی زیاتر خۆش بویَ لە باوکی، لایەنگری دایکی دەکات

داوەت قەرزن، تازیە فەرزن

دیلانە: گۆرانی (بەستە، ستران)

دیلانەی دەگۆت ئەوانی دی دەیانگێراوە بە چەپلە رێزان

(مێژووی شاری کۆیە، نەجیبەخانی جەلیزادە ل ٧٨)

داکیَ ببینەو دۆتیَ بخوازە

داروجان: وەك چەڵتوکە لەناو برنج دایە دەبژێردریَ وفرێدەدریَ.

دەك چەرمی چێرانت لیَ بکریَ: بۆ ئەو کەسەیە هەموو گیانی تێکچووە بە پێستی مانگا چاك دەبێتەوە.

دێر: کەنیسە، جێی پەرستگای دیانان

لە کۆیە شێخ محمدی دێریَ هەیە، دیانەکان دەڵێن مەرپێن قەدیشە، دێر لە دێری پیسترە، گوایە نامەکی هاتووە بۆ دێریَ خوێندراوەتەوە گوتویەتی دێر لە دێری پیسترە

واتە خەتەکە لە کەنیسە پیسترە

وامەزانە موسلمانم، دێریَ چاوم هەر لێتە

دەرکە بیَ دەروازە نابیَ

دەرێی دوپشکی عەربەتە دایم کلکی لەسەر پشتە

دیزەی کەچە، گۆزەی کەچە، پێی کەربووینە ناکەس بەچە

لە دەوری دوری دندانی بە قیمەت

ددانی کەندووە لوئلوئی لالا

(حاجی قادری کۆیی ل ٤٢)

دەرێی (دەڵیَ)ی قوزە کەمتیاری پێیە

دوعا لۆ نامینێیە

دۆم بە دانیشتن ماری ویرانە

**دەرکی هەمبانەی کردیتەوە لۆ درۆیان**

---

**دەمی بووە تەرە** تەڵە)ی تەقیو

---

**دەستەك ئەزاز**، دەستەك پیرۆز، نازانی کامیان بگری

---

**دەربێن:** ئەو بەنەیە زاری هەمبانە و کوندە و مەشکەی پێ دەبەستن

---

**دەرێی مزروکەیە** وریاو چوست ولەش سووك وبەجووڵە وبزێوە

---

**دەرێی مەرحەمە:** هێمن وبێدەنگ ولەسەرخۆ

---

**دەستبێن:** ئەو بەنەیە کە شوان سەرێکی لە ملی بەران دەبەستێ و سەرەکەی دیکەش لە دەستی خۆی بۆ ئەوەی بە خەبەر بێ

---

**دۆدان:** وەك مەشکەیە دۆیان تێ دەکرد

---

**دنیا زۆرە**، عاقیبەت. قیامەت قۆڕە

---

**دژمژە:** دەم بەست. دارێکە دەخرێتە دەمی کار و بەرخ و گۆلکی مژە خۆرەوە لە شیری دایکی دەبێتەوە، بزمك

---

**داروغە:** حەسحەس، سەرۆکی ئەو کەسانەی ئێشکی شار دەکێشن، وەختی خۆی بەوانە وتراوە بە بازاردا گەڕاون بۆ ئاگاداربوون لە خەڵك، لە کۆیە بەرەبابێك هەبوو ناویان داروغەیە پیاوی ئاغا، داردەستی ئاغا، سەرکار

---

**داسەکنێ:** دانیشە. مەجوڵێ

---

**دارتێل:** عەموودی کارەبا، لوتکەیەك هەیە لە هەیبەسوڵتان ناوی (دارتێل)ە

---

**دەرپێ قوتە:** شۆرت

---

**دەسرۆك:** رەفتە ئەو پارچە پەڕۆیەی کە بەسەری (بووك) دا دەدرا، یان سەمای پێوەدەکرا

---

**دەعبا:** دڕندە، بە دامێنیش دەگوترێ، دەعبایەکەی گەورەیە

---

**دەمەکی دی:** کاتێکی تر

---

**دوولك:** بە بەدوولکی دارلاستیك و پانتۆلێ (دووگێ)

---

**دافەتێی:** داوەشێی

---

داغان: تەفلیش، تێکچوو، کاولبوو

(عاسمی شاعیر:)

ئەگەر ڕۆژێ بەبێ تۆ بچمە باغان

خودا بەختم ببا وەك کوێر و داغان

---

داغ ئەو پارچە ئاسنە گوێ سەروبنی پی داغ دەکرێ بۆ ناسینەوە

---

دەستم دامێنت: دەخیلت بم، لەڕێ خوای- دەستم بە دامەنت

چەندە بلێی ئازیزی گوڵەباخی پایزی

ئەگەر مەیلت کوشتنە بۆیە وا لێمان زیزی

تۆبی ئەو بونەی تۆ هەی

دەستم دامێنت نەکەی

(خالد دلێر)

---

داسەکنێ: دانیشە، کاتێ تورەیی بەمندالان دەوترێ کە بێعاری بکا

---

داوەوسکە: ئەو داوەی راوی تەیر و تواری پێ دەکرێ

---

داهێلان: شۆڕ کردنەوە، (شاسوار هەرشەمی)

---

داخ سۆر: جۆرە گونبەیەك کە خەتێکی سووری بەناوەڕاستیدا هاتووە (خەت سۆر)

گونیەی داخ سۆر پارەیان هەیە!

---

دووباد: قەڵەو، دووجار بادراوە

---

دوور و تەمسیل: درێژ نەکردنەوە، با دوور و تەمسیلی نەدەمێ

---

دووگرد: بەرماڵی نوێژ

---

درەفش: بەر کۆشەکەی کاوەی ئاسنگەر بووە، ئالای کاوە

حاجییە شیعرەکانی وەك کاوە

ڕۆژی دەبیت درەفشی هەڵداوە

(حاجی قادری کۆیی)

---

دژوون: چڵکن، پیس، دژوونم، خۆم نەشووشتووە

سڕی تێدا نییە ئیشکەر دژونە

ئەبینی هەندەکیش خاوێن وپۆشتە

(ڕۆستەم حەوێزی-خەبات وبەرژەوەندی ل١٧٦)

دەم هەراش: قسە گەورە، بێ شەرم

(دەم هەراشێکیان هێناوە هەر لە خۆیەوە قسە دەکاتن)

دۆبڕ: ئەو کەسەی ماست و شیر و دۆی نەمێنێ، دەڵێن دۆبڕم سەر بێڕسق

دۆبڕ: ولاغی دوو وەرزی

دەك ئەستۆت وردبێ

دەك ملت بشکێ

داك سینگە تەپەت لۆ بکات

دورج: سندووقی بچووکی شت گران بەها

دری لەخۆ بووەوە بورایەوە، لەخۆچوو، لەهۆش خۆچوو

دۆشەگۆرە: دۆشەکی بچووك

دەستاو: پێوانەبەکە بۆ ئاو دەڵێن دەستاوێك ئاوی هەیە بۆ کابان بەکاردێت دەڵێن و دەستاوی خۆشە

دەمدڕاو: دەم شڕ. نهێنی نەپارێز

دێراو ئاو داشتن بە شەتڵ و چاندن دا

دارەمەیت: بۆ بردنی مردوو بۆ سەرقەبران بەکاردێ

دارەدارەی دەکا: تازە بەسەر پێیان دەکەوێ

بێ داروبار: لاواز وبێهێز

دۆر – دۆرە: دەهۆڵ

سامی عەودال:

دۆڵی بۆ لێدەن هەڵپەرکێ دەکا

دەف بۆ لێدەن حەمەشکێ دەکا

دێوەرە: چەرچی. ئەو شت فرۆشانەی دەگەڕێن، عەتاری دەستگێڕ لە گوندان (لادێ)

دەلینگ: ئەو بەشە شەڕواڵە و دەرپێی ژن کە دەکەوێتە لای قولە پێ

دەرەك: دەعبایەکی گۆشت خۆری کێوییە، دەڵەکە، فسۆس

ڕێوی نییە دەرەکە سەری کلکی بەرەکە

دەستە دۆیی: خەبەر لێدان

دەك زمانت لار بێ

دواتان بڕێ

دەك خەجارەت بی (خەجارەت: خەجاڵەت)، تەریق ببیەوە

ددانت لە سینگی بێ

دەك ڕووڕەشی دنیا وقیامەت بی

دەستە خوشك: وەڵاشی کچ و ژن برادەرایەتیٚ ژن و کچ

دەندەڵە: دەفەی سنگ

مەسعود محەمەد لە گەشتی ژیانم دەڵێ:

یەکەم جارمە چاوم بە سەرو سیمای مردووی بێ هەناسەی (حەمەدی ڕەش) بکەوێ

قەوارەی برینی گوللەی لە (دەندەڵە)ی سینگی دیار بوو

دارالملك: پایتەخت، شارێك

دار وموڵکی بابان بوو

(شێخ ڕەزا)

دەبۆڕێنێ: بۆڵە بۆڵ دەکا

لەبەر خۆیەوە هەر دەبۆڕێنێ

دەلاقە: ڕەفتە – وەك پەنجەرە

دەلاق: حەلاق – سەرتاش، بەربەر

دەلووجە: بیبەر

دەلووجەی تیژ: بیبەری توون

دۆخین: بەنەخوێن

دڕنە: هەر عینادی، عەکس پێ داگرتنە–وەرە خوارێ

دەبدەبە: میزڵدان

دەمی بگری، بە قوونی قسە دەکا

دەرێی (دەڵێی) جیوەی تێکرایە (تێکراوە) دا ناسەکنێ

دۆشاو لۆ پاشای قاته

دەستەکی نەفتە. دەستەکی جفتە

دۆشاو بە گونت لە جێیەکی بێ ئاو

دیزە دەگەڕێ دەرخونەی خۆی دەبینێتەوە

دانای دانابێ، تاچەمێتەوە

(حاجی قادری کۆیی)

تەماشای قامەتم پیری چلۆن تیری عەسای دایە

درۆیە داری گەورە وەك نەمامی تازە دانایە

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل١٢٢)

دەرهەم: نازانم مەبەستی چییە، پەشۆکا

دەشلێن دایم ودەرهەم واتا هەمیشە

حەزین ودەرهەمی ئەم شارە زۆری بێگانەن

لە حەسرەتی عەجەبا شارەزووری چەند دەگرین

(حاجی قادری کۆیی ل٨٩)

دفکی دا: لەداخان مرد، بۆ زۆر گریانی منداڵ بەکاردێت

دەستەچیلە: چیلکە وپووش وپەڵاش بۆ ئاگرکردنەوە

دەستنێژ: دەستچێن، پێگەیاندن وپەروەردەی کەسێك دەڵێن دەستنێژی ئەوە

دەوان: چوست وچالاك

باڵای دوڵبەرم میسالی سەرووی ڕەوانە

دڵ لەجوای سەرووی ڕەوان وێڵ ودەوانە

(دیوانی عاسم--لێکۆڵینەوە وساغ کردنەوەی د.کەمال مەعروف)

داغانە: تێکچوو. لەکارکەوتوو، لێك هەڵوەشاوە

ئەگەر ڕۆژێ بەبێ تۆ بچمە باغان

خودا بەختی پیاو وەك کوێر وداغان

(دیوانی عاسم ل١٣٧-لێکۆڵینەوە وساغ کردنەوەی د.کەمال مەعروف)

دێرێ چاوم هەرلێتە

**دیانێك موسڵمان دەبێت تەماشای دێرێ دەكات، دێرێ (جێ نوێژگەی دیانان)ە چاوی هەر لە دێرێ بووە.**

---

**دار هەر دارە، پەلك هەر پەلكە**

**قەوم هەر قەومە، خەڵك هەر خەڵكە**

---

**دار بەری زۆر بێ سەری شۆڕە**

---

**دەنگی هەیە، ڕەنگی نییە، بۆنی هەیە**

**(تڕ)ە**

---

**درەوشە: ئامێرێكە لەدار یان لە هێسك وئاسن دروست دەكرا وەك دەرزی وسوژن بۆ لەنگەرگرتنی سیرمە بەكار دەهێندرێت.**

---

**درێشە: وەك سوژن وایە بۆ پێڵاو دروستكردن بەكاردەهات**

---

**دوژمن لۆیە كاری سەر دەگری**

**بە عەرەبانە كەروێشك دەگری**

---

**دایە خەجێ: خێزانی بەكراغای حەوێزی بوو، دایكی حاجی تەهیراغای بووە، حاجی تاهیراغا بووە سەرۆكی شارەوانی بەغدا، دایە خەجێ خوشكی عەلی بەگ داسنی بووە.**

---

**دو گلە مەڕی: گەمەیەكی منداڵانەیە، لەنێوان كوڕان وكچان**

**ئاغا ناردی بۆ مەڕەكی**

**شوان دەڵێ بەخوا ناخوا قشپلەكی**

---

**دەغدەغە: ختووكە وخوریەی دڵ**

**دڵم كەوتە دەغدەغە ولێم بوە مەراق**

**(مێژووی شاری كۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٢١)**

---

**دەستەبرا: برادەر–ڕەفیق**

**كاك عەبدوڵڵا لەگەڵ شێخ عومەری بیارە دەبنە دەستە برا**

**(مێژووی شاری كۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٦٤)**

---

**دەقری قری: تەنگاو ونیگەران بوو**

**مەلا لامع لێو هەڵ پچڕێ دەقری قری چش پێ ناكرێ**

**(مێژووی شاری كۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٩٦)**

ددان گڕ: ددان دەرپەڕیو

داری شەکراوی، لقان دەهاوی، سێ
لەبەر سێبەری، یەك لەبەر هەتاوی
(٥ نوێژەکان)

دوو دەلەقن: دو دەزەقن، چار دەچەقن
دوو دەرەقن: (بزن-گیسك)ە
دوور دەلەقن: گوێیە
دوو دەزەقن: چاوە
دوو دەرەقن: قۆچە- (شاخ)ە
چار دەچەقن: لاقە-قاچە

دەڵێی داری ئالسەدرێیە

دەك بتۆقی: دەك زراوت چی، دەك زیپەکەی

دیتە: شاهد
(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٨٩)

داری وشك بەر ناگرێ

داش بە داش

داشی سوارە

دایەوە کەندێ

دونیا توخمی تەمامە

دونیا وەك تاسی حەمامێیە، هەر ڕۆژە بەدەست یەکێکەوەیە

دوو لاقی هەبوو، دوو دیکەشی لۆ قەرزکرد

دۆستی وامان هەبێ دوژمنمان لۆ چییە

دین نەمایە، ئیمانیش هەر ئەوەندە دەکا

دار بەڕوو ڕەگ قەوی بەیەك تەور ناکەوی، ناکەوێتە سەر زەوی

ددانت هێشا، ڕاست بیکێشە

دهستگیرانی کەس ناشرین نییە

---

دنیا دنیایە، بزن سورای گایە

---

دنیای لێ بوویتە کونە دەرزی

عەجمانی نییە لەسەر ئەرزی

---

دووژن لە حەوشێ، وەك مانگ وخۆر دەدرەوشێ

---

دۆستت هەزاربێ کەمە، یەك دوژمن مایەی خەمە

---

دۆم وشەرمیان نەگۆتییە

---

دەروێشی، بەدڵخۆشی

---

دەریا بەتنۆکە باران پەیدا نەبووە

---

دەك ماڵت وێران بێ شەوە، لۆ چ منت نەبردەوە

---

داکەوتێیتی: الواقعیە

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٧)

---

دەستی خەڵکی ماری پێ بگرە

---

دەمت بەحورمەت، سەرت سەلامەت

---

دەنگ دەکەم دەنگم دەچێ، دەنگ ناکەم ڕەنگم دەچێ

---

دیوار بروخێ، سەربانیش دەڕوخێ

---

دەچمە ئاسمان با دەمبا، لەسەر ئەرد، ئاو دەمبا

---

داسنی: ئێزیدی

چ داسنی بێ ئیسلام بێ یا دیان

لەگەڵ یەك دەکەن وەك برا ڕەفتار

(ڕۆستەم حەوێزی-ڕاپەڕینی کۆیە)

---

داوێ: دەهاوێژێ

---

دێر: سەگی مێ

---

داخوون: حەوانەوە

---

دوی: دوای ئەو (لەدوی چوان مەچو)

---

داشداری: شەریکی. هاوبەشی

---

دەرێ: دەرەوە

دەرێ: دەڵێ

---

دەستی پێدا هینا: واتە هەرچی کەوتە بەردەستی بردی

دەستی پێدا هینا: دەستی پیانا

---

دەسرازە: پەتێکی چندراوە بۆ بەستنەوەی منداڵ لەناو لانك (بێشکە)بەکاردێت

---

دەست لۆ هەناران دەبا، هەنجیران دەپچڕێنێ

(بەرەو راستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی–مەسعود محەمەد ل٣٠)

---

دەولکە: سوراحی

بەدەولکە قوڕ هەڵکێشێت بۆ دەرەوەی بیر

(بەرەو راستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی–مەسعود محەمەد ل٣٣)

---

دووگردی لەسەر ئاو دەگەرێ

دووگرد: بەرماڵ

---

دووربڕۆ، سەلامەت وەرەوە

---

دوونگی بەرانی، ئاگرێ جێی نانی

---

دیارە، تێی ناگا لۆیە کیلۆ خێیەکی بن پێ قورسترە لە کیلۆ گەنمەکی

---

دیسان گا گووی کرد. ئەو ناوەی پیسکرد

---

دونیا شامی شەریفە

---

دونیا سەری بەپووش نەگیرایە

---

دونیا بن قووڵە

---

دزدز دەناسێ

---

در چییە پارچە گۆشتێکە

در: دڵ

---

دونیا کە دەوری نا گاری دیتی یە

تا روما نابێ زۆر هاری دیتی یە

دونیا وەك هەنگوینە ئێمە مێش هەنگوینین لێی نابینەوە عەشقی شیرینین

دەستە چەورەکەت لەمن هەڵمەسوو

بوك لەگەڵ تۆمە گێت لێ بێ خەسوو

دەستی ڕاست بەشی نان خواردنە

دەستی چەپ پیشەی تارەت گرتنە

دەستی کەوتیتە ناو گووی

دەستی مار بڕا ژەهری پێ درا

دەستی لە دنیا شووشتی یە

دەستێکی چامی گەیاندێ

دەست لەهەموو کونەکی وەردەدا

دەستی لە گونان درێژتر هاتەوە

دەست لەدەست، قەوەت لەخوا

دەست دەست دەناسێ

دەزانی مێشوولە ٣٢ ددانی هەیە

دەریایەك کامەڕانی، تنۆکە خەفەتەك لانابات

دەرسی بەشەیتانی دا دەدا

دەرۆزەکەر توورەگەی پڕە، ڕووی ڕەشە

داس هی دروونەوەیە

داری ئەستوور نابتە گۆچان

داری لەسەر بەردی دانەنایە

داربە پوازی خۆی دەقەرشێ-دەقەڵشێ گوڵی دۆست زیاتر لەبەرد دەیەشێ

دۆ بێ هەژاندن کەرە نادات

دەوڵەمەند هەقی خۆی بەدەستەوە

دەوڵەمەندی بەدڵە بەماڵ نییە

دەمی هەیە زۆر بڵێیە

(قەڵەم)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٤)

---

دۆخینم ڕاکێشا، ورگی بەگۆرە وەربوو

(گیپە)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٤)

---

دەزانی ونازانی

(مردن)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٥)

---

دەمت بە قوونی، دەستت بە کێری

خۆش خۆشی هەڵدەستیت ئاگری لۆ دێنی

(قەنە-نێرگەلە)یە

---

داری خەفت بەر، خۆ وشەی کوندەی، ئجاری زمانی

(دارمازوو)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٥)

---

دارێك هەیە بێ گوڵە. میوەی تابڵێی شیرن وبەدڵە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٥)

---

دارە لەسەرداری، ئاوریشمان مرواری ئاسن بۆنە ئاساری

(تەش)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٦)

---

دوو لە خۆرە سێ لە سێبەرە

توو ئازابە ناوی بەرە

(نوێژەکان)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٦)

---

دووە ونابێ بەسێ

(شەووڕۆژ)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٣٦)

---

دەروا بەڕێوە، دوور ناکەویتەوە

(چرکەی کاتژمێر)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٣٦)

---

دەیبەستیەوە دەڕوا، نایبەستیەوە ناڕوا

(پێڵاو)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٣٧)

---

دەخوا بێ قوونە، دەڕوا بێ شووتە

(قرنە)

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٣٩)

---

دەیبنی لەبەرت نییە، لەبەرتە نایبینی

(کفن)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٣٩)

---

دەفڕی دەنگی هەیە، دەنیشی سەنگی هەیە

(فڕۆکە)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٣٩)

---

دانیشە کەری کەودەن

---

دەمی ژن هیچ کاتێ، ئیسارەحەتی نەداتێ

---

دەوجا وەرە گونی بگری دەست نوێژت بشکێ

---

دەم شڕە

---

دەرکەکی بەخێر خوا بکاتەوە

---

دەنگو دۆر: دەنگۆ، دیعایە

دەنگو دۆری لە دوور بوو

---

دانیشتە: متقاعد

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٢)

---

دەستەمستە: دەسکە دەستەندوو دارێکە پڕ گوڵمی بوونیار بۆکاتی کێڵان

---

داڕسان: دوو واتایەی هەیە

١. كابرا قسەی لەگەڵ ناکرێ، دام ڕاسایێ و هەندەی نەما بوو لێم بدا، واتە شاڵاوی بۆ هێنام بە مەبەستی لێدان

٢. هاوینان کەپووی دادەڕسێ، واتە خوێن لە کەپووی دێ

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

دارەت: نموونە: لە دارەتی دنیایێ هیچ شك نابەم. بە مانای موڵك و ماڵ دێ. یان لە دار الدنیا-وە هاتووە

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

دڕ: واتە یەکێ بەناو حەشاماتدا ڕێی خۆی بکاتەوەو بەری بەربدەن (دڕی بە حەشاماتەکە داو هاتە پێشەوە

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

دانولە: دانو، گەنم دەکولێندرێ، کەسارد بووە وە پێی دەڵێن دانوولە، دواتر دەکرێتە ساوەر وبرویش.

---

دەرێی گووی لە قونێ عاسێ بووە

(دەرێی: دەڵێی)

---

داکە مارانە: پنچیکێکە بەری وەك فاسۆلیایە بەلام ناخورێ مالات دەیخوات

---

دارکاژ: دار کاج درەختێکی هەمیشە سەوزە

---

دەندەڕشك: تۆی کەنگر

---

دەبنەسێتەوە: لەکورتی دا، بێهێز دەبێ

---

دەرخستنی ڕاستییەکان قاوەی تاڵە شاردنەوەی هیچ پاساوێك هەڵناگرێ.

(د.کەمال مەعروف

---

دووکلکە: زیندەوەرێکی بچووکە

---

درۆزن وادەزانێ بەدرۆکردن ناشرین وناشرین تر دەبێ

(د.کەمال مەعروف

---

داشۆران: بۆ (انجراف التربە)تعریە دەست دەدات دەڵێی: بەو باران ورەهێڵە لایکی زەوییەکەم وا شۆرا

(زاراوەسازی پێوانە-مەسعود محمەد ل٢٩)

دۆغەوا: بڕوشی خووساوە وپیاز وگۆشت وکفتەیە

دۆبەکەشك: خواردنێکە

دەلەعاز: یەکسەر، ڕاستەوخۆ

دەمارگرتن: واتە تووڕە بوون

دابڕ: قاطع

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٥٩)

دووبەدەر: بەو کونە دەڵێن لە دوولای شتەکون کراوەکە دەربکات.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٤٥)

دروینگ: دەراسە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٩١)

داهاتانە: چریبە الدخل

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٣٧)

دێتەوار-بینەوار: نیگافراوان

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٥٥)

دیدەوار: بۆ کەسێك بێ وردەبیاتی ودیتراوەکان بەڕوونی بینێ

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٥٥)

دەوری چوار ملیار بەشەری ئەم جیهانە حەیفە پێی بگوترێ مرۆڤ

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٦١)

دڵداری سەرچاوەیەکی پاك وپیرۆزە ئەگەر بە کردەوەی بەدلێل نەکرێ

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٢٧)

دەبێ مرۆڤ ورتە لەمەیل وئارەزووی خۆی ببڕێت، کاتێ خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژوو دەبێ

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٢٧)

---

درۆکردن لەگەڵ میللەتدا بەلامەوە خیانەتی بێ تەئویلە

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٦٥)

---

دەجاڵ خۆی نەبوو تا کەری هەبێ، کەچی هەزاران ساڵە خۆی وکەرەکەی دروستکراون، دەجاڵی دوێنێ خۆی لکاندبوو بە فیکری قیامەت وجەهەننەمەوە، هی ئیمرۆ لەگەڵ نیشتیمان پەروەری وسوودی گشتی خۆی پەیوەست دەکات.

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٥)

---

دەسکاریکردنی مێژوو و رووداوەکانی بۆ هەر ئامانجێك بێ، نارەوایە، درۆ وهەڵەکە بخرێتە ناو مێژووەوە ئێستاکە ودواڕۆژیش بەهەڵە دەبات

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٤

---

دیموکراسی رووەکێکە نائەسنای جیهانی سێهەمە، رەگی دانەکوتاوە، مەگەر ئەو قەوزەی لێرەو لەوێ بێرەگ، نەدەپشکوێت ونەبەریش دەگرێت.

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٣)

---

دانهێنانی هەڵەکردوان بە هەڵەی پێشەوەیان نابێتە چاکە وپیاوەتی ئەگەر سووربن لەسەر هەڵەی ئێستا ودواڕۆژیان

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٤)

---

دەبێ لەدۆزینەوەی هەموو کێشەیەکدا بەولای بەزەیی ولایەنگیری ورق لێبوونەوە بچین تاکو لەبەندی عاتیفە وحەزی شەخسی ڕزگاربین بێ چاویلکەی تەرەفداری سەیری پرسیارەکە بکەین

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤١)

---

دەبێ ڕووناکی لەدەرەوەی تاریکییەوە بێت وبی ڕەوێنێتەوە، هەروەك ناساغی بۆخۆی نابێتە شیفای خۆی، واتە: خۆی نەفی ناکات. دەبێ دەرمان لەهەرێمی ڕووناکی وزانستەوە بێت ناساغیەکە نەفی بکات

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤١)

---

دیاردی: کاتێك کەسەگ نیچیر دەبینێ، دیاردی بۆ دەکەن جا هێرش دەبا

---

دوو ڕوو، بێ ئابڕوو

---

ددان هێشان، دەرکێشان

---

دەمی وەکو دەمی قەحپەیە

---

دەرێی سینگیان لەقوونی کووتایە

(دەرێی: دەڵێی) (کووتایە: کوتاوە)

---

دۆستی چاك پارەی ناوبەخەڵی خۆتە

---

دەمی نییە، ددانی هەیە

(شانە-شە)یە

---

درێژە پێی دەرێن (خڕ)

(دۆڵ)ە (پێی دەرێن: پێی دەڵێن)

---

دەنگی هەیە، ڕەنگی نییە شت فڕێ دەدا ودەستی نییە

(ئاو وبا)یە

---

دەریای شینە، ئاوی تێدا نییە

(ئاسمان)ە

دەگرمێنێ وەك هەور، فڕێ دەدا سپی وچەور

(مەشکە)یە

دۆستی خۆتە ودوژمنی خۆتە

(زمان)ە

دەڕوا لاقی نییە. هاوار دەکا زمانی نییە، فرمێسك دەڕێژێ چاوی نییە

(هەور)ە

دەرێی کوڕی حەمە قەدۆی موسرێ یە

(دەرێی: دەڵێی، موسرێ: موسڵێ)

درێژ وەك حوجی بنی حەلاق

دەرێی (جیوە)ی لەقونێ کرایە

دەك مارت نەرمێ میرزا

دارکونکەرە: باڵندەیەکە

دار گەندەڵ دەبێ هەتا جارێك بازی بەسەرەوە هەڵدەنیشێ

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی–مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی)

دەخوا نانی هۆزان، دەکا لەقەپۆزان

دەستی خۆی بینێ، بابی خۆی ناناسی

دری لەناو دەستی بوو

(در: دڵ)

دەزرێن: ئەو پەتەی شوان کاتێ دەنوێ لەدەستی خۆی وملی ماڵاتەکەی دەکات، گەر شتێك بوو بەخەبەبێ

دەستندە: کەم کەمە هاوکاری کردن ویارمەتی دان بەپارە

دگدگ: جۆرێکە لە پۆشاکی شەڕ

دەستەونەزەر: دەست لەسەرینگ، ڕێزگرتن

دەم وقۆپان: شەرەوالی شەڕ

دەغەزار: وەرز وبێزاربوون

داری لەسەر بەردی دانەنایە

دەبێ نەتەوە ویستی کورد ژیرتر وهێمنتر ودووندێشتر ودەستپارێزتر وبەرژەوەندەنیتربێت، برا کۆمیونیستێکی کە لەسەرکەوتنی کرێکاری جابولغا وجەزیرەی واقواق بەمیراتی خۆی دەزانێت، واقیعبەت وەها داوا دەکات لە مرۆڤی نەتەوەیی لە هەڵوەستی سافیلکە وعاتفی وخۆشی باوەڕی خۆگیری بکات وهەرگیز برامێرخاسەکانی دەمی لێقەوماویی گەلێکی تر بە وەکیلی خۆی دانەنێ لە بڕیاردان وبەرنامە دانان

ئەو مێرخاسانە کرودیان دانابا بە وەکیل وەیا رەفیقی سەفەر کە هەرگیز نەیانردووە هەلبەت ناڵیچم کورد خۆی بەرفتاری ئەنتیکە خۆی بکاتە کۆ سەبەبی، ناڵێم دەستی یارمەتی رەت بکاتەوە، بالە شەیتانیشەوە بێت، چونکە قەومی موحاجی عەتفە، دەست بەتاڵە لە خەرمانی خۆیشی، بادیسان یادی باوکم بکەمەوە کە لەسەرەتای سییەکاندا ئەمە گووتووە لەزەمینەی چنگ لە نیشتمان گێرکردن:

بستێکی لە خاك وبەردی کوردی

نادەم بەمەرقەدی لوعرە وەردی

بیرێکی لە نەوتی بابەگوڕگور

نادەم بەمنارەکەی ئیمام دور

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٥١)

دەبێ کورد شەرەفی کوردایەتی بپارێزێ بەرەفتاری پاك وبەکردەوەی چاك

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٥٢)

دەبێ کورد لەپەندی مێژوو وناو مێژوو فێربێت کە چاوی بە کوشتنی پێشمەرگە نەبریسکێتەوە، کوێبوون چاکترە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٣١٨)

دەسا بەهەرچی پاك وپیرۆزەوە سوێند دەخۆم، هەڵوەستم بەرانبەر کۆمیونیزم ومارکسزم لەڕووی پەرۆشیمەوە بۆ (ئادەمیزاد)بووە (لە بەرایی هەمووانەوە: کورد) کە باوەڕ دەکەم هەڵەی کوشندە هەیە، بۆ چوونەکانی مارکس

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٨٠)

دەرێی کوز تێر کێرە.

دار وپەردوو، تف لە هەردوو.

داری بەڕوو ئاسان ناکەوی، بەیەکەم تەور ناکەوتە زەوی.

دەرد وبەڵای کەس، ناکەوێ لە کەس.

دەردی بێ دەرمان مەرگ وپیرییە، عاقیبەت هەردوو زەوی گیرییە.

دەزانم ژەهری مارە، بەڵام چارم ناچارە.

دەسخەڕۆمت کرد، ڕەنجەڕۆم مەکە.

دەستی کردووە بە ڕۆنی داخا، دەستی بڕیم وکردی بەزاخا.

دەوەرە خۆت مەگێ.

دز یەکە گومان هەزار.

دزاو دز کەوتن

دڵخواز، بویتە پەلکەپیاز.

دنیا هەرەسێکە نەفەسێکە، هەردەم بەدەستی کەسێکە.

دیتنی چاوان، کارێزی دڵان.

دیل ئازاردان نیشانەی نامەردییە.

ددانت گەوهەرە مەیدە لەبەرد.

داری دا بە ڕوحیا

دانی شاشە، بەختی باشە.

دایکی دز یان سنگ دەخوات یان سنگ دەکوتێت .

دز و پاسەوان کردەیان یەکخەن، بە کونەبانا حوشتر سەر دەخەن .

دڵ لە دڵ مەدە .

دڵ و دڵخواز، دەبنە نان و پیاز .

دوژمنی خۆی دانابوو بە دۆستم، چاوەڕێ بکەم بکەوێ کۆستم .

دیاری مێرووله لاقه کلۆیه

دیزەیەك کەیبانو بیشکێنێت تەقەی نایەت .

دیزە ڕەشەی خڵتە لەبن، خڵتەکەی خۆت مەسوو لە من .

دێگەڵەی نەدیوە، چەند ماڵە .

دێر بێت و نێر بێت .

دین سز ئیمان سزی پێویستە .

دەستشکاو باشترە، لە دڵشکاو .

دەست پانکەیتەوە، لە پێ دەکەویت .

دەست دەخاتە قوڕگی گورگەوە و دەیخنکێنێت

دەستت بە کەوگیر بێت. چاوت لە فەقیر بێت .

دەستی لە دنیا شووشتیی یە.

دەستی شەیتان بشکێت

دەستی شێر لەت و پەتم بکات، نەك چەپۆکی ڕێوی خاڵ و خەتم بکات .

دەستیم بە بۆنەوە نەکرووە

دەنگ دەکەم بەد ناوم، دەنگ ناکەم تەنگاوم .

دەڵێیت پاپۆڕەکەی نوقم بووە.

دەڵێیت گۆشتی قازی خواردیە بۆیە دەنگی وا خۆشە .

دەڵێیت گوو گێژی کردووە .

دۆکولیو: دۆینە

ئەو چێشتە لەگەنمەکوتاو وپونگ ودۆو خوێ دروست دەکرێ بەشێوەی شل
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل٤٤)

---

دیگۆلی: ئەو جورە تفەنگە کورت بوو وەکو قولە برنەو دەست کردی فەرەنسیە وپێنج فیشەکی پرنۆی دەخوارد ولەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول پەیدا بوو.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل٦٩)

---

دۆبڕ: فرۆشتی مێگەل بەتەواوی
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل٩٦)

---

دەغەلی: ئەو نەخۆشیە بەزۆری تووشی مەڕوبزن دەبێ بەتایبەتی بەرخ کار بەهۆی کەم شیری وکەم لەوەڕیەوە بەو هۆیە زیاد ناکاو چەند خزمەتی بکرێ هیچ سوودی نییە.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل١٠١)

---

دانگە: بەشێك لەپاوانە کە ڕۆژانە دەدرێ بەمێگەل
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل٩٦)

---

دووبڕ: دوو ساڵەی ئێستر وکەر
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل٩٠)

---

دیزە: دیزەی لەگڵ دروست دەکرێ ئەو جۆرەیان بەزۆری بۆ ڕۆن تێکردن بەکاردێ.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم
ل٧٨)

---

دایە مەمدە بە جولآ
دایە مەمدە بە جولآ
بابە مەمدە بە جولآ

جوڵا تەقە تەقیەتی

دوو پوول و نیو حەقیەتی

ئەویش کرێی ژنیەتی

دایە مەمدە بەجوڵا

جوڵا پێ چاڵی تەنگە

ترِی ......دەلێ ی تفەنگە

دایە مەمدە بەجوڵا

چاوم کەوتەوە گونی

وەك پشیلە ی کور کنی

کافر نەبی وەژنی

دایە مەمدە بەجوڵا

چاوم کەو تەوە کێری

پێچ پێچ وەك شاخە نێری

کافر نەوکەوتە ژێری

دایە مەمدە بە جوڵا

(فۆلکلۆری کوردی: محەمەد تۆفیق ووردی ل: ٣٨ (

---

دراوسێ لە دراوسێ، دەگرێ سەراسێ.

---

دار نەبێ، ڕۆژوو لە کوێ دەبێ

---

داکت کورد وبابت کورد، ئەم عینوانەت لە کێ گرت.

---

دڵ پیر نابێ، چاو تێر نابێ.

---

دنیا جووڵە جوولێتی، موختار قوونەقوونێتی.

---

دنیا دوو دەرگەیە، لەوەی دێیی، لەوەی دەردەچیت.

---

دوژمن بکەی بە دۆست، دۆست مەکە بە دوژمن.

---

دۆم دەڵێ: دنیا بە قڕچێ، مشتەی منی تیا نەچێ.

---

دەعیە ودەماری نێرەکەر نایکێشێ.

---

دەمی بەلۆرك وپەنیرێ، پێلچکی بە قوونی فەقییرێ.

---

دەعبای گۆشتخۆر، دندوکی خوار وقولابی یە.

دەستی شکاو لە ملی خاوەنیەتی.

دەوڵەمەند دەیەڵێ لە ئاش بێتەوە، فەقیر نایەڵێ لە ساج بێتەوە.

دەوڵەمەند هەر چەند خەڵکی لە دەورە، بایەخی نییە سێبەری هەورە.

درک بچێنیت درک دێتە ڕێت.

دزی نەگیراو پاشایە.

دنیا سێبەرە دوای کەوێ دەڕوا، کەڕوت وەرگێڕا ئەو دێت لەدوا.

دۆخینی حەرامم نەکردۆتەوە

دوژمنی باب نابێتە دۆستی کوڕ.

دوژمنی ناوەخت ڕەگ دەردەکێشێ، دار پواز لەخۆی نەبێ ناقلیشێ.

دوعای پیاوانی ژیر بە هەستە، ئەم دەستە موحتاج نەبێ بەو دەستە.

دارێك هەیە بە پێنج لقە، هەر پێنج لقی ئەو هەقە.

(پێنج فەرزی نوێژ).

دارێك هەیە بێ گوڵە، میوەی تا بڵێی شیرین وبەدڵە.

(هەنجیر).

دەریای دوو ئاوی دوو ڕەنگ، بێ شەپۆل ودەنگ.

(هێلکە-چاو)

دەمی شاخە شاخی چەرم، دەنگی زلە تووکی نەرم.

(کەڵەباب: کەڵەشێر)

دەستمان ناگاتە لچکی کەواکەت

دەبدە بەهەشت

هەشت بگرە لە مشت

دژمن سەیری پێراوت دەکا

دۆست سەیری کراوت دەکا

(پێراو: پێڵاو)

(کراو: کلاو)

دەبڕێ ودەکوژێ نایشارێتەوە

دەڵێ (رەبی لە قەبریشا لەگەڵ لوورەی سەگ بەخەبەر بێ)

گوشاد عبدول رەحمان بایز لە شعرێکی لە کتێبی (میربار) ل ۲۹۸

داری بە بەر، بەردی تێدەگێرێ

داری تەڕ دووکەڵ دەکا

داری خوار، لۆ سەرباز

داس خوار، تووتن هارە

داکە مارانەیە

داکی کوڕێ، کەتە قوڕێ

دەچمە جێیەك گۆشتی بگرم. نەك دەردی بگرم، پێ بمرم

دەخوا ساواری، ناچتە هاواری

دەرێی گای قەشە

دەرێی گورە مەجرسێیە

دەورەمەند ترێنی، فەقیرە پسێن دەمە دەمی لۆ گەرمەکە

ددانی نییە، ئەستوورکە جۆی دەخوا

در خۆش مەبە بە مردنم، ئەتۆش دەمری دییە کنم

دەرزییەکم تێراکەی، سوورژنەکت تێرا دەکەم

دری تەرەی دەخوازی

دری منداری لەسەر بەفرێیە. دری داکی لەسەر ئاگرێیە

دز بە دزی دەگیرێ

دش و درێشە

دنیا پڕ لە گورە، تاقە گورێکم بەدرە

دنیا چەرخ و فەلەکە

دنیا خرا دەبوو، دوو سوار لە جەردەیی دەگەران

---

دنیا کێ دەی خوا؟زمان لووس، کێ دەی با؟بسك لووس؟

---

دوژمنیایەتیی پیاوان، لەدۆستایەتیی ناپیاوان چاترە

---

دوژمنی خۆت، بەهەند هەرگرە

---

دوژمنی کەون لە دۆستی تازە چاترە

---

دوو قەحپە بە شەرهاتن، هەردووك دۆستی یەك دەرهاتن

---

دوکان دوکانی خۆتە، گەزی چاو لە دەقران کەمتر نابێ

---

دوو لە ئادار، یەك لەنیسان، چێترە لەمرکی خوڕاسان

---

دۆین بێ، شاز لێی بنێ، پشیلە لەپان تێبنێ

---

دێزەی سەرنشێوە، سەبر سەبرۆکەم لە گەر باخێوە

---

دیوار چاوی نەبێ، گێی هەیە

---

داکانە وبابانە: چۆلەکەی نێر ومێ

---

داڕووجان: جۆرە گیایەکە لەنێو برنج سەوز دەبێت تا گوڵ وتۆ نەکات نازاندرێ داڕووجانە.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٢)

---

دارخەزنە: دوو دارۆکەن کە هەردووکیان بەقەد قەڵەمێك درێژدەبن ولەقەڵەم ئەستوورترن، لەنێوەڕاستی نیرەکەدان، واتا لەسەر پشتی نیرەکە چەقێندراوە.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨)

---

داوەر: ئەو گوڵەگەنم وجۆیانە بوون کە بەبەرداس نەکەوتن.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤١)

---

دەمەسوو: کولبوونی بیور وتەورداس وداسی سەپانان بە هەسان.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤٤)

---

داڕەندە: دارێکە وجووتیار لەناوەندی جۆخینێ دەیچەقێنێ.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٠)

---

دنگ (دینگ): دوو بەردی زۆر گەورە وپانە لەسەر سەکۆ دادەبەسترا وکاریتەیەکی پێوەبوو بەهۆی ئەو کاریتەوە بە ولاغ دەسووڕێنرایەوە. دینگ بۆ کوتانی ساوار وگەنمە کوتاوو لەشارەکاندا هەبوو.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧١)

---

دێمکە: وەك جۆرێك وەهایە لەکوندە وجانگ دروستدەکرێ بۆ ئاو خوارنەوە بەکاردێ.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان- حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٧)

---

دەڵێی گیپەی جۆیە

---

دەوسە: ئەو ئاژەڵانەن لمووز ولێوی سەرەوەیان درێژترە لەهی بنەوەیان.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٨)

---

دۆخۆر: جاران لە گوندەکانی کوردستان خەڵکی هەژار زۆر بوون. هەندێك لە هەژارەکان دەچوونە لای دەوڵەمەند وخاوەن ئاژەڵەکان چوار سەت بزنیان بە دۆخۆر لە خاوەن ئاژەڵەکان وەردەگرت. بەلام ڕۆنەکەیان لەگەڵ خاوەن بزنەکان دەکردە نیوە، ئەگەر مانگاش بووایە هەروابوو.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٠)

---

دارگورد: ئەو دارەیە بەنی رابەڵەی لێدەبەسترێ بۆ ڕاگرتنی تەون.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٩)

---

دەستەندوو: دارێکە ونزیکە مەترێك درێژە، لای ژێرەوەی باریکە ولای سەرەوەی دەسکێکی پێوەیە. (هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٦)

---

دەستەمستە: واتا دەسكی دەستەندوو، ئەو دەست مستە لەكاتی جووتكردندا جووتیار دەستی پێوەدەگرێ
(هەگبەی زاراوە رەسەنەكان-حەمید رەشاش-رێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٦)

---

دووپر: كاتێك كوندە، یان مەشكە تفر وتوێژی هەڵدەدا دەیانگوت دووپر بووە.
(هەگبەی زاراوە رەسەنەكان-حەمید رەشاش-رێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٩)

---

دانگە: شوێنێكی كەم ودیاریكراوە. لەكاتی نێرینەی بەهارێ خاوەن مەڕەكان دەڵێن لەوەڕ هێندە خۆشە، مەڕ یەك دانگە تێر دەخوا، هەروەها دەڵێن دانگە قەرسیلێك بدە مەڕەكان.
(هەگبەی زاراوە رەسەنەكان-حەمید رەشاش-رێكخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٠)

---

دارەلامە: جۆلانە

---

داس بڕ: ئەو زەویەی كە یەكێك بەردەوام خۆی دورنەی تیا بكات، یا بیدورێتەوە.

---

داڕشت: ئەو دەخلەیە بەتایبەتی قەرسیل دوای ئەوەی مەڕی تێ دەكرێت بەهۆی ئەوەی زیاد گەشەی كردووە نەوەك بكەوێت ودوای خواردن وهەڵستانەوەی پێی دەگوترێت داشت

---

داكەمارانە: جۆرە گیایەكە.

---

داوگە: شوێنی دانانەوەی داو

---

دایە دوی: لە دووی دا، مەیلی زۆر داوەتێ

---

دایەوەكەندێ: دۆراندی

---

دەستەگور: بردنی بەشێك لە هەر شتێك.

---

دەست ومست: توانا وخۆڕاگری.

---

دەقن: قوڕولیتە، قوڕێكی خەستە ئەگەر مرۆڤ بكەوێتە ناوی بە ئاسانی دەربازی نابێ.

---

دەقنانووس: ناوی پاشایەکی بێزەنتی بووە، لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی پاشایەتی کردووە.

---

دەم دەمی: هەر جارەی لەسەر بیروڕایەك، ڕاڕا، وەختی یە.

---

دڕن: بۆنی ناخۆشی گۆشت

---

دۆریخە: ئاودانی چەڵتوك. قوڕە برنج، مەدرەب.

---

دۆشەنی: ئەو ٣-٤ بزنەیە کەشوان بۆ خواردنی خۆی ڕۆژانە دەیدۆشی.

---

دێمچە: پارچە زەوی تەختایی، بەرهەمەکەی دێمی بێ.

---

دوڕخان: واتا ناوەوە. یان ژوورەوە، جاران ئەگەر کەسێك نەخۆشبووان و نەخۆشییەکەیان لەنێو هەناوی بووایە ولەدەرەوە دیارنەبووایە، دەیانگوت نەخۆشییەکی دوڕخانە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٩٩)

---

داری قەڵاشکری: ئەو مۆرە دارانەبوون کە دارکەرەکان دەیانقەڵاشت وبۆ سووتاندن بەکاردەهات. (هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٩)

---

داری قەراش کەری: دارێکە درێژییەکەی هەر مەترێك دەبێت، بەڵام لەنێوەڕاستەوە کراوەتە دوو دار.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٩)

---

دووپشتەکی: سواربوونی دوو کەسە لەسەر پشتی یەك وڵاغدا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٧)

---

دراوی سەرکڵاو: ئەو دراوە تومەنی ئێرانی بوو، لەسەر تەپڵەسەری کڵاو بەڕێز دەدورا ولەناوەندی دراوەکاندا ڕیاڵێکی گەورە هەبوو، پێیان دەگوت پارەی سەرکڵاو، یان سەرسەران.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٥)

---

**دۆریخە:** قەتارە شینایی بەزیکزاك. واتا ئەو ئاوەی لەیەك خەت دەکەی ئاوەکە بەخۆی دەستووڕێتەوە تا پڕدەبێت.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٨)

---

**دمکانە:** بەری دارمازییە و وردیلەیە.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢١)

---

**دووخی خەنجەر:** دوو خەتە زەقەکەی ناوەڕاستی تێغی خەنجەر بوو.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٩٣)

---

**دیواری مەشکانی:** بەرینیی دیوارەکە بەقەد درێژایی خشتەکە بوو.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥١)

---

**دیواری لانکانی:** بەرینی دیوارەکە ئەوەندەی پانی خشتەکە بوو.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥١)

---

**دارگورد:** جۆرە دارێك بوو لە تیرۆگ درێژتر بوو لە نێوان داوی ڕایەڵەی تەون دادەندرا وبەنەکانی ڕادەگرت.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٣)

---

**دارغەدەنگ:** قامیشێکی ئەستوور ولووس بوو، لەناو داوی ڕایەڵەی تەون دادەنرا بۆ چەپ وڕاستکردنی داوی ڕایەڵەی تەون بەکاردەهات.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٣)

---

**دارخەپە:** ئەو شەپکە دارە بوو کە دەکەوتە نێوان هەوجاڕ ومژانەی جووتکردن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٣)

دابنرێ پارە+وەك بەرد ودارە.

داخم ئەوداخە وخەمم ئەو خەمە+هەر وەك باواجی سەرم بەتەمە.

دار بدەی بەورچ ئاسانە+لێ سەندنەوەی گرانە.

دار دانا ئاسانە+بەرهەم هێنانی گرانە.

دار نییە نەهەژابێ.

دار نەبێ، ڕەژووش نییە.

دار، ڕیشەی کوتا+ناکەوێ بە با.

دار هەڵکشێ+ڕادەکشێ.

دار، بۆ داربڕیش سێبەر دەکا.

دارا، بەدەستە+فەقیر پێی مەستە

دارایی وهەستی+بە مەستی وپەستی.

داری ئوستای بەر نەکەوت+لەژێر سەر نەکەوت.

داری ئەستوور، نابێتە گورز.

داری بێسەمەر، بەردی لێنادەن.

داری بەردار، سەری شلە+داری بێبەر، ڕۆحی زلە.

داری بەردار، بە بەرد ودار+داری بێبەر، بەبێ خەتەر.

داری زۆر گەورە+چارەی بەتەورد

داری گەندەڵ زوو ئاگر دەگرێ.

دارەوانیشە وشاخەوانیشە.

داکەوتن لە ئەسپ، باشترە لەداکەوتن لەکەسپ.

دان بدە بەمەل، یان ئازادی کە.

دانا بەحەرفێ وکەر بەنەقیزە.

دانیشی لەرێی بەخت+مردن دەتکا تەخت.

دانیشە لەسەر دەرپێ ی خۆت.

دایکی (کوژراو)دەخەوێ، دایکی (بکوژ)خەوی لێناکەوێ.

دایکی کورە+پێلاوی شرە.

دایم بچیتە سەردار+جارێ دەکەویتە خوارەوە.

درۆ، ئەوەڵی خۆشە وئاخری بۆشە.

درۆ، کەری درۆزنە.

درەم ودینار دایك وباوکیەتی.

درەنگ هەیە رێ دەکەوێ+هەیە بەزوویش تێیدەکەوێ.

درەوشێ لەپێما بێ-نەك هەوێ لەجێما بێ.

دز وپۆلیس یەککەوز-خەڵکی رەحەت ناخەون.

دز وگورگ ومار+بەشەو دەکەن کار.

دز، بگرن داری تێ دەبڕن.

دزان شەڕیان تێکەوێ-دزیەتی دەردەکەوێ.

دژمن بۆ مەڕی هەژار-فەرقی نییە گورگ وسوار.

دژمن پێستت داکەنێ-نەك دۆستت پێت پێکەنێ.

دژمنت خستە کزی+تۆیش بترسە لەچزی.

دژی یاسا، دەم بەجوێن ودەس بە عاسا.

دلێر پێدەکەوێ+نەوێر تێدەکەوێ.

دنیا ئاشە وخەڵکی ئاشهارە.

دنیا وەك چەمە+زانین بەلەمە.

دواکارە، ناودارە.

دوو کەس چوونە لای قازی، وەکوو یەك نابن ڕازی.

دوو ڕێوی یەکگرن شێرێك دەکوژن.

دووپشکی چ لەحەوا+نەبۆ قینە ونەبۆ هەوا؟.

دوو زمانی وجوێن+نزیکن بە خوێن.

دووکەڵی بۆ چوو+ئازیزی خەسوو.

دوونگ مەدمنە دەستی پشیلە

دوونگی لەبزن دەوێ.

دوێنێ ڕەحمی نەکرد+ئمڕۆ بوو بە پرد.

دوێنێ کڵاوی با بردی+ئمیڕۆ دەگەڕێ بە وردی.

دڕاو، پینە دەکرێ، تڕاو، پینە ناکرێ.

دڕك مەچێنە، دڕك دەربێنە

دڕندە، بوو بەنێچیرت، قەپیان نەچێ لەبیرت.

دڵ پیر نابێ وچاو تێر نابێ

دڵ، سفرە نییە، لای هەموو کەس ڕایخەی.

دڵ وەك مێشێ

لەپاك وپیس دەنیشێ.

دڵ، کەدەبرژێ، کزەی دێ

دڵ هەیە ناسك ونازدار، دڵیش هەیە وەك بەرد ودار.

دڵ بەتاوان ڕەشە وبەفرمێسك گەشە.

دڵت پاك بێ، قەینا جلت پیسە.

دڵی بێ ئەوین، شووشەی بەتاڵە.

دڵی خەڵکی دێشێنی، هیوای شەیتان جێدێنی.

دڵی میوان لەگوڵ ناسکترە

دڵی نامەرد+ڕەقتر لەبەرد

دڵی نییە بەماڵەوە+شەیتان دەیخاتە خەیاڵەوە.

دڵی، پڕبێ لەجنێو+ڕاستی نایەتە سەر لێو.

دڵێ، زۆرشت بخوازێ+بە ئیسراحەت نانازێ.

دۆست، دەڕوانێ بۆ کڵاوت+دژمنت دەڕوانێ بۆ پێڵاوت.

دۆست، دڕك ناچێنێ+دڕك دەردێنێ.

دۆستی نەزان لە دژمن خراپترە.

دۆعا، تیرە وبەگیرە

دۆڕاو لەگەڵ خۆی شەڕیەتی.

دەچین چۆڵ بەچۆڵ+بۆ داهات وکۆڵ.

دەخوا بەپەلە+لەکارا شەلە.

دەدا ئازار+دەچێژێ بێزار.

دەرپێی کشمیرە ومێزەری حەریرە.

دەرفەت ئەسپێکە. زین کراوە بۆت.

دەرفەت بەکێش+دەمانباتە پێش.

دەروێشییە+دڵخۆشییە.

دەریا، بەدەمی سەگ گڵاو نابێ.

دەریا، بە دەولکە خاڵی نابێتەوە.

دەریا، بەنمەبارانێك پڕ ئاو نابێ.

دەس لە هەویرە+دەم بە تەگبیرە.

دەست، بۆ کارە+دەم بۆ هاوارە.

دەست بەدەست+تا شوێنی مەبەست.

دەستی بشکێنە+قەدری مەشکێنە.

دەستی پاك، بەهەنگوین پیس نابێ.

دەستی کرد بەزاخا

دەستی کردووە بە ڕۆنی داخا.

دەستی کەوتووە بەهەرزان+کەوتۆتە لەرزان لەرزان.

دەستی لەگونان درێژترە.

دەستەی ژێر+بەبێ بیر+نایکەن تەگبیر.

دەستەی نەسازان+كاریان ترازان.

دەستخەڕۆکردن+ڕەنجەڕۆکردن.

دەلاك، بێكاربن سەری یەكتر دەتاشن.

دەم تەڕە وكاسە وشكە.

دەم جەمە+دڵ بێخەمە.

دەم درێژان، دەستیان كورتە

دەمت كلیلە وزمانت هەڵگریەتی.

دەنگ بكەم، بەدناوم، نەیكەم، سووتاوم.

دەنگنەكەر، تڕی دەنگكەری بڕیوە.

دەنگم خۆش بوایە تۆزێ دەگریام.

دەوار دەوار+كۆنە هەوار.

دەوەر، دەوری كەچەڵە+چونكو لەپاڵ مەنجەڵە.

دەوڵەمەند دەمرێ بۆ ماڵ+هەژار بێخەم وخەیاڵ.

دیاری قیامەت، چاكە وتەقوایە.

دیتنی هەر گوڵێ+بەهارێكە بۆ دڵێ.

دیداری ڕووخۆش+دەرمانی نەخۆش.

دیزە وگۆزە سێ دەسە+لە بۆ حەفتا وەرەسە.

دیسانەوە دایكی بووك+دەستی كرد بە نووكە نووك.

دیلەكانێ هەڵخرا+كەس هوژمی بۆ نەبرا.

دین، بە تاوان لێڵ دەبێ.

دیومە، ڕۆژوو بخوات نەمدیوە نوێژ بكات.

دێر بێ و وەكوو شێر بێ.

دێر هات وبەخێرهات

دەمم مەکەوە.

دەمی لە قوونی سەی پیسترە.

دەم هەراش قوون کوێستان.

دەمی دەرێی مەقەستە بە یەکی دەدا.

دەمی بگری، بە قوون قسە دەکات.

دەمی بوو بە تەرەی تەقیو.

ددانی ددانی نەدەگرت.

دەمی بوو بە تاقی چرا.

دەمی لە قوونی پیسترە.

دەنکی لێ نەهێشت.

دەنگی ترپێی دەگاتێ

دەنگی لە تێرەوە دێ

دەوڵەت مێشە، لە گووش دەنیشێ.

دەنگی لە کەندوو دێتە دەر.

دەورەمەند پیرۆزت بێ. فەقیر لە کێت بوو؟

دەورەمەنــد بــە درە. بــە مــار نییــە: گــەورەیی بــە عــەقرە، بــە ســار نییــە.

(دەورەمەند: دەوڵەمەند، در: دڵ، مار: ماڵ، عەقر: عەقڵ، سار: ساڵ)

دەمی خۆتی لەگەر گراو مەکە.

دێگــــــــەرەی نــــــــەدیوە چــــــــەند مــــــــارە.

(دێگەرە: دێگەڵە، مار ماڵ)

دێــــــری حیــــــز، گــــــۆری گــــــورگ خنکێنــــــی لێ نابــــــێ.

(دێر: دێڵ،گۆر: گۆڵ)

دێری فسکەن، تاژی ڕەشکوژی نابێ.

دەردی ئەجەل، دەرمانی نییە.

نێر بێ وتێر بێ.

دێی فرە کێخوا، فەقیر هەرناگرێ.

دیاری قەسپێکە، بەقەد ئەسپێکە.

ددانی لێ تیژ کردیە.

دیتنی عەزیزان، چ ساتێك وچ سارێك.

دیدار غەیب، ئەسپ غەیب.

دیزەکەر دانیشتوی یە، مەنعی گۆزەکەر دەکات.

دەوڵەتی جوانی ئەوەتا شوانی. دەوڵەتی پیری، ئەوەتا میری.

درم بڕوایی نادات.

دری ژەنگی هەڵهێنایە.

دنیا چەرخ وفەلەکە.

دینا خانە، ئینسان بازرگانە.

دنیا بنی قووڵە.

دنیا زۆری پێدەوێ.

دنیا کلکی درێژە.

دنیای لێ ئاخر بوو.

دایکی دنیای گایە.

دنیا یا حەریف، دەیخوا، یا زەریف.

دنیا بێتە بۆست، دوژمن نابێتە دۆست.

دنیا چاو لێکەرییە.

دنیا دوو ڕۆژە.

درودرخواز، نان وپیاز.

دنیا بۆ کەس بەقای نییە.

دنیا قوونی نەمێنێ.

دنیا کێ خواردی؟: زمان لووسان، لووس وپووسان، بێ ناموسان.

دنیا هەروا نامێنێ.

دنیا هەروا هاتووە وڕابردووە.

دنیا هەزار خۆشی وناخۆشی تێدایە.

دنیا هەزار نەخۆشی وسەرهێشانی هەیە.

دنیا بەرزی ونزمی زۆرە.

دنیا هەر ئەورۆ وسبەی نییە.

دنیا هەورە. گورگ دەمی چەورە.

دۆی بدە بە دۆنەدیوان وا دەزانن ماستە، ماچ بدە بە کوڕەتیوان وا دەزانن ڕاستە.

دۆینە، بە ئۆینە.

دۆزەخ، لە دەرگایشی بگەڕێتەوە هەر باشە.

دۆستت شاد بێ ودوژمنت کوێر.

دۆست دوو جۆرە: گیانی ونانی.

دۆست ودوژمن لێك جیا ناکاتەوە.

دۆست ودوژمنی خۆی ناناسێ.

دوژمنایەتی زانا لە دۆستی نەزان چاکترە.

دۆستی دۆستم دۆستمە، دوژمنی دوژمنم دۆستمە.

دۆشاو بە گونت لە جێگای بێ ئاو.

دۆعای کەر قبووربایە، جۆ دەباری.

دونگی بەرانی. ناگرێ جێی نانی.

دوانزە ئیمام دوانزە بران، هەر دوانزەیان یەك یەك کوێخان.

دۆستایەتی بەهات وچووەوە خۆشە.

دۆست گرتن زەحمەتە، دوژمن تاشین ڕەحمەتە.

دەوڵەتی دنیا گەر نەتکا بەدوو، دەتکا بە یەکێ لای سەرووی هەموو.

دادەنیشم ئاو دەمبات. هەردەستم گورگ دەمخوات.

دار ئاوەسوو بەقوونی خەسوو، دار تەمووره بەقوونی خەزووره.

دار بە شلکی نەچەمێتەوە، بە وشکی ناچەمێتەوە.

دار بە قوون نەگەڕاوەتەوە.

دار ترەکی، بەرد ترەکی. ئەو نەترەکی.

دار زۆر بەرز بێتەوە. دەچەمێتەوە.

دار وبەرد هاتە زمان. ئەو نەهات.

دارەك لەسەر سە، سەد دار لەسەر ژن.

داری لەسەر بەردی نەمایە.

داری پیر بە دار نابێ. یاری دوور بە یار نابێ.

داندۆکە، کابان کۆکە

ڕووداریك لە زۆرداریك خراپترە.

داوەتی میران، گڕ لە فەقیران.

داوی لە داوی ئەوان ئارایە.

(ئارایە: ئالاوە)

داك لای ئەولاد، قەت کۆن نابێ.

داکت چاك، بابت چاك.

داکی خۆگێیە.

داکی خۆی دەگێ.

داکی دز دوو تڕ لێ دەدا. یەك لەترسا، یەك لە خۆشیا.

درۆزن شتی لەبیر نامێنێ.

دز ئەگەر مەیلی بێ. تاریکەشەو زۆرترە لە مانگەشەو.

دز خێرا بێ، تاریکەشەو زۆرە.

دزیش بی، ویژدانت هەبێ.

دۆست لەسەرت دەڕوانێ، دووژمن لەپێت.

دش، چش.

دڵ مێشە، لە گوویش دەنیشێ لە گوریش.

(گور: گوڵ)

ددانم بەزاری کەوت، ئەوەندەم گۆت.

درۆی بە کلك وگێ دەکات.

(گێ: گوێ)

درۆی دەکات ودەرپێی لۆ ناکات.

(لۆ: بۆ)

درۆ فەقیرە هەموو کەس پێی فێرە.

درۆ لە دوای مردوو دەکرێ.

دۆعایەك بکە لۆ ئامینێ بی.

دنیا یا زۆردار دەیخوا، یا بێعار.

دادی تۆم پێ با نادرێ.

دای زل نابێتە گۆچان.

دوور لە ڕووی حازران.

دایکی دز، سنگ دەخوا وسنگ دەکوتێ.

دەست کردنەوە پیرۆزییە.

دەستیان لەدەستە. تۆیان مەبەستە.

دەست لە دەست وقەوەت لە خوا.

دین ودنیا، لێك نابن جودا.

دوایی خەمان بێ

دوژمن کەریشی بگێی هەر باشە.

دەبێ ریخی لە قوونی هەر سووی.

دوو شت مرۆڤی دەدەن عەزابێ، گوڕەی ژن بابێ ودەنگی دۆلابێ.

دوو جوولەکە لەسەر ماری موسڵمان شەڕیانە.

دەزانم ژەهری مارە، بەڵام چارم ناچارە.

دەزگیران! ناتدەم بە دوو هەنجیران.

دەزەڕێ، ناپەڕێ.

دوو فەلە کاروانێکە، دوو ژن حەمامێکە، دوو کەر گاڕانێکە.

دوژمنی زانا بوو بە دۆستم. چاوەڕێ بە بکەوێ کۆستم.

دوو فوو و سەبرێك.

دوو کەس بچن لۆ بۆقێ. نەشیکوژن دەتۆقێ.

دوور هەڕوو دروست وەرەوە.

دووربینی، پەشیمانی بەدواوە نییە.

دوور لە بەختی فەقیری. گاجووت بێتە بەر نیری.

دوور نەڕۆین.

دووگردی بەسەر ئاودا بگەڕێ، کەس باوەڕی پێ ناکا.

دانا بە درکاندن، کەر بە نەقیزە.

دەستی نەکردی، داینە لەسەر مردی.

دەرپێی داوە بە شانیدا

دیزە ڕەشەکەی دوو کون لەبنا، دەستە چەورەکەت مەسوو بەمنا.

دنیا بوویە کەس، کەسی نەگۆتیە بەس.

دیان لۆیە عەزیزن، دەموچاو دەشۆن لەپاشان دەمیزن.

دەروێشی، بەسەرخۆشی.

دنیا دەمە، هەموو کول وخەمە.

دەردی ئەجەل دەرمانی نییە.

**دەستێ کە فێر بوو بە گەندەکاری، عاری نایە توو لەشەرمەزاری.**

**(توو: تۆ)**

---

**دزی خۆماری ناگیرێ.**

---

**دزی خۆمـــــــــــاری، دەرگـــــــــــا بـــــــــــەتاری.**

**(خۆماری: خۆماڵی)**

---

**دێری حیز، گۆری گورگ خنکێنی لێ نابی.**

---

**داریان لە قوونی دەکوتا، دەیگۆ ئەو تەق تەقە چییە.**

---

**دێ پڕە لە دەنگ وباس، داوە خۆی لێکردووە کاس.**

---

**دین سز، ئیمان سزی لۆ چاکە.**

---

**دوو ئەسپ، لەسەر ئاخوڕێك نالەوەڕێن.**

---

**دەستی کەرەم ناگێردرێتەوە**

---

**دنیا هەموو دوژمنی کەوە، کەویش دوژمنی خۆیەتی.**

---

**دیدار غەیب، ئەجەل غەیب، نەسیب غەیب.**

---

**دێی فرەکوێخا ئاوەدان نابێ، پیاوێ زۆر بڵێ نوکتەزان نابێ.**

---

**دە بخۆ دەی!**

---

**دەردێکی دامێ دەرمانی نەکرد، رەشەبا بە بەفری کوێستانی نەکرد.**

---

**داری بێ پەلك سێبەری نییە.**

---

**دەمی سەگ بە تیکە ببەستە.**

---

**دەم تەڕی کاسە وشك.**

---

**دەستی چەپت حەوجەی دەستی ڕاستت نەبێ.**

---

**دەنگی ئەوەندە ناخۆشە، دەڵێی میز بە تەنەکە دا دەکات.**

---

**دەرێی کابرا ترییە، ئەوی لێ دەرپەڕییە.**

---

**دەرێی کەندووی بەتارە**

**(بەتار: بەتاڵ)**

---

دەرێی قونکە هەوجارە.

(دەرێی: دەڵێی)

---

داك ئەگەر بوو بە زڕداك، بابیش دەبێتە زڕباب.

(داك: دایك)

---

دەمی دۆشاوە، دری خووناوە

---

دوژمن بە کەم مەزانە.

---

دەمم مەکەرەوە.

---

دەستی کێر، لەسەر سکی تێر.

---

دیانی پیر موسڵمان نابێ.

---

درەخت، لەپێشدا ناوکەیەکە

---

دنیای کۆن کردووە.

---

دەستمان ناگاتە لچکی کەواکەی.

---

داوای ڕووتبوونەوە، باتەشتی زێرت بەسەرەوە بێ.

---

دنیا بەهەشتی کەرە.

---

دەفەی دەنگ نادا.

---

دوورە، نوورە.

---

دانەوەی قەرز، فەرزە.

---

داخی گرانە.

---

دەم لەدەمی مەنێ.

---

دەستی کەس وەك هی خۆت نایخورێنێ.

---

دەرگایان بە قوون پێ کردەوە.

---

دنیا کەرمیزە.

---

دووڕوو قسەیان بێ ئیعتیبارە

وەك نیسکی نەبەر نەپشتیان دیارە

در: دڵ

دەبێ لە دەمی منداڵەوە ڕەمزی وەفاو ڕاستی فێربین

(د.کەمال مەعروف)

دەنگی خۆی بیستیتەوە.

دەرمانی دوور شیفایە.

دەسوڕێتەوە لەناو کۆرانان.

(کۆرانان: کۆڵانان)

دەمرێ و دەژێتەوە

دەورەتی جوانی، ئەوەتا شوانی،

دەورەتی پیری، ئەوەتا پیری.

دوو دیان کاروانێکە.

دزی دزییە، چ هێلکەیەك چ گامێشێك.

دینی نیە شەیتان ببیا.

ماری نیە ڕەحمان بیبا.

(مار: ماڵ)

دنیا گوونی بێغەمە

دەردێکیان دایە، ئەو دنیای بە چاوی خۆی دی.

درەخت، لە پێشدا ناوکەیەکە.

دنیا لە دوای حەزرەتی شێخ، گووی سەگی تێبێ.

دار بە قوون نەگەڕاوەتەوە.

دەستی هەزاری وەك تووی لە پشتەوە بەستیە.

دەشتی بەر ماران گور گرتوویەتی،

در هەر یەکێکە و یار بردوویەتی.

(مار: ماڵ، در: دڵ)

دیزە و گۆزە نەبێ. هەموو شتێك بە لێدان چاك دەبێ.

دەڵێی جیوەی تێ کراوە: واتە عەجوول وبزێوە



راغ: مێرگــــوزار، داوێنــــ چــیا ســــەوزبێ، داوێنـــــی چـــیا ســـەوز بــــاغ و راغــــی بلبلـ ــــە دەیکاتـــــە جێـــــی راغ و زەغـــــەن گـــورگ و مــــام رێــــو لـــە بێشـــەو لانـــەی شـــێران دادەنـــێ.
(حاجی قادری کۆیی ل ۱۷۹ چیمەن)

راکشان: درێژ بوون، پاڵدانەو

ردێن: ڕیش

ڕەشکە وپێشکە: باش نەدیتن چاوم ڕەشکەوپێشکەی دەکا

ڕێشمە: پەت، ئەو پەتەی سەری ئەسپ وگوێدرێژ پێ دەبەسرێتەوە چوندراوە وەکو دەسرازە

رووسم: بەردێك لەناو زەویدا هەڵنەقەندرێت دەڵێن رووسمە هەڵناکەندرێت. ئەو برە پارەی کە حەمامچی لە بووك وزەیستانی وەردەگرت، چونکە بەتەنیا نەبوو چەند ژنێکی تریشی لەگەڵ بوو

ڕێسمان: ڕیس، گوریس
ئاسمان و ڕێسمانی فەرقە

ڕێسمەدان: قایم کردن، داخستنی دەرگا، ترازاندن لە ڕێسمەی برد واتە لێیکردەوە

ڕەن: پارچە زەوی بە پیتی دەم زێ و ڕووبار، لە گوندی (کانی بی)ی دەشتی کۆیە ڕەنە ڕووت هەیە.

ڕەشەبەر: نەخۆشییەکی گدانی ماڵاتە
زیاتر لە بزن دەدا، پەکی دەخا

ڕەژوو: خەڵووز، زوخاڵ. دەبێت (ڕەژوو) لە ڕەشەوە هاتبێ
(ڕەشوو)

رەفیسك: چالآیی پشتی ئەژنۆ

رژد: زۆر کوور وسەخت

رەسەن: ئەصیل. جسن

ریژنە: رێژنە باران. تاوە بارانی بەخوڕ

رێپێوان: بەرێدا ڕۆشتن بە کۆمەڵ

رکابەری: منافەسە. بەربەرەکانی

ریسوا: شەرمەزار. سوك وکەم، ئابڕووبردن

رووبار سەرچاوەکەی خاوێنترە

رەبی نینۆکت نەبی خۆتی پێ بخورێنی

رێوی بخەوێ خەون بە گۆشتەوە دەبینێ

رەبی مارو مندارت لە برسان بمری

رەزیل و سەفیل بی. کەنەفت بی

رەبی مەیتتان لۆ بێتەوە

رەبی لەناو قەبریش نەحەسێیەوە

رەبی گرێی بەختت نەکرێتەوە

رنەك : رەندەکە ئەسپی پێ دەخورێنن

ریپۆق: چلم، جیقنەی چاو

رەمل لێدان: لە گۆترە پێشبینیکردن

رانکی لەپێ نییە. ئێمەنی سۆر لە پێ دەکا

رێوی لەڕە، جلی تەڕە. لە گەوەڕە، تەڕ لەوەڕە

ریخی لە قونی دەی کاوێژێ دەکا

راوی ســــــە دەنـــــــێ ئیمـــــــانی لـــــــێ دەســـــــتێنێ
واتە هێندە ساختەچییە (سە-سەگ)

ڕەوا رێك دەکەوێ. کێشە چارەسەر دەکا

له شەوچەرە ل ٨٦ باسی مام واحیدی مختاری سۆلدروو دەکا

مۆرو ستەمپای حازری لە باخەڵە پیاوی رەوایە

---

رەمەزان، قاڵبی قوزان، قوز دەرپەری، چووە ناو مەڕی، سە پێی وەڕی

---

رەباس: خاکاو، پاراو

---

رەوسە: پوختەی خەرمانی گەنم

ناخی زەوی رەباس دەکرد

لە زستانا تۆوی دەشیاو!!

هاوینانیش رەوسەی سوری خەلەو خەرمان !

---

ریش: زام-برین

لەگەڵ ئەم ئاهووە دێ ئەم سەگی ریش کۆن ونوێ

دێتە سۆ دێتەوە سوو ریشی کە کەوتە جدەوە

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل١٢٠)

---

رەنوی بەفر: کاتێ بەفری شاخی بنی شلدەبێتەوە دەبێتە ئاو دەکەوێتە خوارەوە دەنگێکی گەورەی وەك گرمەی لێوە دێ

---

راکشاوی: درێژبووە، راکشێ: درێژبە

---

راشکاوی: بەصراحە، بەڕونی

---

راپێچەکیاندا: بەخێرایی بردیان

---

راماڵین: پێش خۆدان بەخێرایی، مەڕەکانیان راماڵی

---

راپسکاندن: راتەکاندن (بۆ خۆ قوتارکردن)

---

رامان: داڵغەلێدان وبیرکردنەوە، هۆش ڕۆشتن

---

راهی: ڕێگا، لەراهی خوای. راهی کرد، جێبەجێی کرد

---

رێوی لەترسی گەرمای پایزی دەچیتە کوێستان

---

ریقنە: جیقنە، پیسایی باڵندە

---

رێسی ملی: پشتەمل

---

رەتدان: ڕەتبردن، ساتمەکردن

ڕەتێکی برد وکەوت

---

ڕق بەڕقێ: لە دژی یەکتری بەکاردێت، رکابەر

ڕق بەڕقێی یەکتریان دەکرد

---

ڕاست دەڕۆم بابی حاکم دەگێم

کەم دەخۆم دایەی حەکیم دەگێم

---

رم تا جێی نەکەیتەوە نەیچەقێنێ

---

روو لە نامەردکردن

خراپترە لەمردن

---

ڕێحانە ڕەشە

بۆنی خۆشە

---

ڕۆڵەی بێ دایە

تاجر بێ مایە

دارە بێ سایە

---

رمبەی لێ دەهات، واتە بەهێز وقەڵەوە

---

رگانێ: دارەکی مەیلەو باریك بستەك ونیو درێژ دەبی سەرەکی تیژ دەکەن وەکو پەلیکی لەجێیەکی کە قوڕ بێ.

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (١٦١)

---

ڕێدان: ئیجازە-مۆڵەت

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٤)

---

رسم: بەردوتاتە، سەری خاکە بنی بەردە

(مێژووی کۆیە-بەرگی دووەم-بەشی یەکەم، تایەر ئەحمەد حەوێزی ل٣٤)

---

ڕۆژێکم مابێ لەکارا. کلکت دەکەم بەدارا

---

رووی گەشە، هەناوی رەشە

---

ڕۆیی بەگوڕ، چەقی لەقوڕ

---

ریشت هێشتەوە، دەبێ شانەی بۆ هەڵگری

---

ڕێگای دور چارەی ڕۆشتنە

سەفەرە: هەر لەبەرە

چارەی ڕێ هەر ڕۆیینە

سەفەرێکی پیرۆزە

هی هیوا ونەبەز یینە

(بەرەو لوتکەی ئاوات- خالید دلێر ل١٠٧)

---

رشتی هەرس: جهاز العقم

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٨)

---

رست: قائمە سلسلە

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٨)

رست: ئەو پەتەی سەگ وتاژی پێ رست دەکرێ، ئەو داوەی جلی پێدا هەڵدەواسرێ بۆ ووشککردنەوە.

---

رادەکی: حدی

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٧)

---

ڕێکەوت وهات: قچاو وقدر

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٩٨)

---

ڕێ باوەڕ: مڑهب

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل١٠٢)

---

راهاتوو: معتاد

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل١٠٦)

---

ڕەبی نان نەبی بیخۆی

---

ڕەبی مووت لە پەنجەی بی

---

ڕەبی داوەشێی وەکو کفتەی هەرووەشێی

---

راتب ورەحمەت ولێبی: فەقێ لەدەرگای ماڵانیان دەدا تاخواردینان بدەنێ

---

ریسەکەمان بۆوە خوری: ئیشەکەمان هەڵوەشایەوە

---

رواج: باوە، داوای لەسەرە، خواست

---

ڕادان: ئاو لادان

ڕادان: دانانی منداڵ بۆ بەتاڵبونەوە (پیسایی)

ڕشت: سوور بوون. داکۆکی کردن

ڕەت: هەڵەنگوت. ڕەتی برد

ڕینگە: نازناوە لە کۆیە

ڕەسەر: بەو مەڕانە دەگوترێت کە تووکی نێوچاوانی درێژە ودێتە سەر چاوی (گوندی قازبەگیان-شێخ ئازاد قازبەگیان ل٦١)

ڕەشکەی نانی تۆی دەرمانێ (دایك کە بە منداڵە پێست ئەسمەرەکەی هەڵدەڵێ)

ڕیزپەڕ: شاژ

(بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی-مەسعود محەمەد ل٢٧)

ڕاستە چاکە وخراپە لە دەست خودایە

بەڵام خەتای بەندەشی تێدایە

ڕەسم وئاینی ئەم زەمانە وایە

لە ڕۆژی ڕەشدا کێ بەوەفایە

ڕەش وڕووتی کڵاوت نییە

ئەو جەژن بەجەژن پڵاوت نییە

ڕەنگێکی هێنا ویەکی برد

ڕزق لە ئاسمان نایەتە زەوی

شەڕی ئەوەیە توو بەدووی کەوی

ڕۆژمان هەر دێت

ڕم بەکەوان، ئاهاویشتردێت

ڕووحیان لەسەر سەری یەکە

ڕوحم بە فەرخە مار ناکرێ

ڕووبەڕوو دەم چەور. پاشملە دەم تەور

ڕوونی ڕژای دەکاتە خێری بابی

ڕووی زۆر قایمە

ڕەوشتی ژن لەزێڕ چاکترە

---

ڕیشم کەوتیتە دەستیان

---

ڕۆژی بارانان قوڕە

---

ڕیشەی جەرگی دەرهینا

---

ڕیشم لە ڕیشی ئارایە

ئارایە: ئالأیە

---

ڕووی گەشە، هەناوی بۆشە

(قامیش)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٢)

---

ڕاستە هیچ گومانی تێدا نییە، مشتومڕی لەسەر نییە

(مردن)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٢)

---

ڕەگی لەبن عەردی، دان لەسەر عەردی، ئەگەر بزانی مەردی

(گوڵە گەنم)ە

---

ڕەپ ڕەپ وەستاوە، پەڕۆی تێگیراوە

(کەندوو)ە

---

ڕوحی لەگەر عانەکی دێتە دەرێ: واتا ڕەزیل وئارچاغە

---

ڕەباس: پارچە زەوییەکی تۆکراوی ئاو دراوی تێراو بێ

---

ڕخۆك: خۆڵی مردوو، بێ هێز

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٣٠)

---

ڕبێدە: سوو، ڕبێدەخۆر واتە سووخۆر ئەوەی قازانج دەخاتە سەر پارەی قەرز

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

ڕووەت: ڕێز، ڕوو (برا قسەکی بکە، ڕوەتی مەجلیسێ هەبێ.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

ڕەوشتی مرۆڤ لە عەقلی دەبیندرێ نەك لە کۆئەندامی نێر ومێدا

(د.کەمال مەعروف)

ڕێماشتن: تێگرتن

بەردێکم تێماشت، بەردێکی پێ دەمالم

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٥٨)

ڕاتەولاندن: بۆ ولاغ لەوەڕاندن دەبێ کەبەگوریسێکی درێژ لە لەوەڕگەی دەبەستنەوە وبەهەموو لایاندا بایی درێژایی پەتەکە دەتوانێ بۆلەوەڕ سووڕ بخوا تۆبڵێی (ڕاتەولاندن)لەبنەڕەتدا یەك ڕیشەبن لەگەڵ تەویلە (زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٦٥)

رووتاریا: پرۆلیتاریا

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٩٥)

ڕەواندن: حەلاڵکردن

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٩٧)

ڕەنگژە: بۆ جێگەیەك دەست دەدات ڕەنگ بداتەوە بەعەرەبی (مصبگە)ی پێدەڵێن.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٦٥)

ڕەشات: بۆ بزن بەکاردێت

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٧٢)

ڕەنگاندن: تلوین

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٨٩)

ڕیشەکێش: استئصال

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٣٧)

ڕیشەبڕ: درەختێکی تەوێ نەیهلێت، ڕەگەژێر خاکەنانی دەبڕینەوە دەڕێت ئەمە ڕیشەبڕ ڕەگبڕی پی بگوترێت کەدیت ڕەگەکانیشی دەرکێشیت دەبێ ڕیشەکێش ڕەگکێشی بکەیت دەتوانین لەڕەگ وڕیشەوە، دەرهێنا

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٣٦)

ڕاسان: تصدی

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٤٦)

ڕاستی لە هەموو نەزەرییە وبیروباوەڕێك موقەدەسترە

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا

ل٢٥)

---

ڕۆژێك دێت کەفالەتی کۆمەڵایەتی لەهی شەخسی مسۆگەرتر دەبێت، دەترسم منداڵی ناو شووشە لەهی پزدانی دایك بەرەواجتر بێت مرۆ دەگاتە خێرایی تیشك ولێشی تێدەپەڕێت

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا

ل٦٢)

---

ڕاستی شەرەفی گوتار ونووسین وکردارە، لەبەر مەشخەڵی ئەم دروشمە ڕێم داوە بە خۆم چی بەڕاست بزانم ئەوە بنووسم

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٥)

---

ڕاستی لە زەرفی گونجاوی خۆی دابڕا نەزۆك دەبێت، ڕەنگە بەدئەنجامیش بێت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٦)

---

ڕۆشنبیر لەپەنجەکانی خۆی بەولاوە چ چەکێکی پێنییە خەلق بترسێنێت دەیان شتان بروخێنێت، بزوێنەری پەنجەی ڕۆشنبیر بریسکەی مێشك ودەروونیەتی

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٩)

---

ڕەشە وەك مەیموون، لووسە وەك سابوون (قالۆچە)یە

---

ڕەشە وەك قیر، سپیە وەك شیر. تیژە وەك تیر (سیخوڕ، سووچەر)ە

---

ڕێسمە: گرێژنە، ڕێسمەی دەرگا

رەمانە: جێگەی گەیشتنەوەیەکی سمت وڕان

ڕکێف: ئاوزەنگ، دەسەڵات

دەڵێن لەژێر ڕکێفی دانییە

ڕووسیای شۆڕشی ١٩١٧ وخاوەن پاشخان وژێرخانێکی مادی ومەعنەوەی چەندی سەدان ساڵەی بەهات وبات وپڕ شانازی وچڕ بەئەدیب وزانا وهونەرکار وخاوەن شاری (قوببە زێرەکان)ی دەمی هێرشی ناپلیۆن (مۆسکۆ)بێت چ بەنگێکی خوارد ببێتە قاپقاپەی چەتیمێکی ماڵی ستالینی دڕندەی تاوانبار وخاوەن قەسابخانەی کوشتن وبڕین ونەفی وبرسیەتیێ

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٦٩)

ڕاسێەکەی لە گۆشەی سەقافەت وفکری ڕووتەوە ژەنگ هەڵێنان وەیا ناتەداوی وەیا مشتوماڵ نەدران خۆی لەخۆیدا ناقولاش بێت، ئەگەر (سیاسەتی کوردی) بەهەڵە نەبات زەرەرێکی ئەوتۆی لێ ناکەوێتەوە، هێندە هەیە کە جۆرە سەقافەت هەیە هەمووی سیاسەتە. وەك مارکسیزم وەیا عەقیدەی دینی تازەبابەت کەجاران دین بریتی بوو لە دەرس ودەوری مزگەوت وعیبادەت وتەڵاق وچاکردنەوە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٦٥)

ڕۆژگیران ومانگگیران کاری شەیتان جنۆکە نییە، دیاردەکی فەلەکی وبەدیهییە، بەڵێ دەزانم ئیسلام هەروەها لەخۆوە، دەقی ئایەت وحەدیس نەهات تێمان بگەیەێ فەلەك چییە ولەقوتبەکان شەش مانگ شەوە وشەش مانگ ڕۆژە، بەڵام دەبێ دان بەو ڕاستییە تەئریخییە حا بهێنین کە قەشەکان دەرگەیان لەسەر فەلەکناسییە داخست ومەلاکانی ئیسلام دەرگەیان کردەوە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل١٣٢-١٣٣)

ڕاستیە ئەگەر بەعەقلیەتی بڕێ بڕمێ کوردستان ئاوەدان بکرێتەوە هەر خۆی کوردەکە، لەجیاتی ئازەری وئێران ونازانم کێوە، دەماری خۆی دەردەکێشێت ودەمارەکەش دەکاتە تەقەڵ دروومانی ئەمەکفەی خۆی بە بەژنی خۆی هەڵبڕیوە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٨)

ڕۆژێ دەڵێی قۆچ پاشایە، شەو دەنوێ لە جلە گایە.

ڕۆن بۆ هیزە، گۆشت بۆ دیزە.

ڕووی زەمانە ڕەش بێ، با ئێمە ڕوومان گەش بێ.

ڕێوی فێڵاوی، ژن مەکراوییە، پیاو گێلە و وەکو مراوییە.

ڕێوی فێڵی خۆی دەکا، مریشك باوکە ڕۆدەکا.

ڕێوی لە برسانا نەی دەتوانی بڕوات، دەیانگووت: زۆری خواردیە.

ڕێی ڕاست ئەوەیە گەر ڕاستیت دەوێ... کەدیوار ڕووخا، بانیش ئەکەوێ.

ڕاستیی ڕەوتی، چەوتیی کەوتی.

ڕاگرتنی زۆردار، زوڵمە لە هەژار.

ڕاو و ڕێویم بۆ مەهێنەرەوە

ڕەش و ڕووت و بێ دراو لە زستانا بێ کڵاو.

ڕەنج بەبا چوو، بۆ دەریا چوو.

ڕۆن لە پیاو بکڕە و گەنم لە ژن.

ڕووی ڕەش بێت یاران، منی خستە ناو منداران.

ڕووی زەمانە ڕەش بێت

ڕێ باریکە ،شەو تاریکە

ڕۆستەم نێر بوو؟ یان مێ؟

ڕوو سپی بی: وەڵامی پیاوانە بۆ ژنان وکچان

(کەلەپووری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٤٩)

ڕاست بە ڕاستی، خوار بەشکستی.

ڕێویی ببێتە پۆست، دوژمن نابێتە دۆست.

ڕاخەری عاردە وپێخەفی ئاسمان.

ڕاوی کەو بە کەو دەکرێت.

ڕەحم کردن بەزۆردار، زوڵمە لە هەژار.

ڕەز لۆ ڕەزەوان، پەز لۆ پەزەوان.

ڕەش بی وبۆر بی

با هەر زۆر بی

ڕاستە ڕاستە

کەرە ماستە

ڕەشەبا، کراوت دەبا

ڕەشمار بێ ئەستوندە ڕاناوەستی

ڕەمەزان دەخوا، شەشەران دەگری

ڕووباری لێژ، شەپۆلی هوردن

ڕووت و برسی بی، قەرداری خەرکی نەبی

ڕووت و قووتی زگ بە تارە

ڕووتی و نا بووتی

ڕوژ لە پشت کۆژە، لەفسکەنی وابی ڕۆژە

ڕێوی مریشکی بگری، سەیری بن کلکی دەکا

ڕدێن شین: ڕەنگکردنی ڕدێن (ڕیش)بە خوم، لەکاتی مردنی کەسێکی ئازیز ژنان جلیان لە خوم دەگرت، سەریان لەقوڕدەنا، پیاوانیش ڕیشیان دەهێشتەوە ولەخومیان دەگرت.

ڕەشی بە قانوونێ

سپی نابی بە سابوونێ

ریسی خۆی دەداتە خەرکی، ریسی خەرکی دەرێسی.

ڕۆژ ڕوناك وشەوت هەر ڕۆژبێ، نامەکەت پێم گەیشت، دڵمی فێنێك کردەوە، دەتووت شەماڵی بەیانیانی لای هەیبەسوڵتان وباخچەکانی ئۆمەرخوچان وگەرمووك وکانیلەبوو.

(محەمەد تۆفیق وووردی)

گۆڤاری رامان ژمارە (٢٦٩)ساڵی ٢٠١٩ نامەیەکی م.محەمەد تۆفیق ووردی بۆ م.تاهیر ئەحمەد حەوێزی

ڕەوسە: کۆمەڵە دەغڵودانی خاوێنکراوی سەرجۆخینە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٤)

---

ڕشت: واتا نووکی گاسن زۆر لەخوارەوەیە وجووتکردنەکە بەگرانی دەڕوا ولەبەر ناچێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧)

---

ڕەشکە: لەشێوەی تۆڕی ماسی لەبەنی مووی بزن دروستدەکرا وتایبەت بوو بەکاکێشان کای پێدەکێشرایەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٦)

---

راکێش وبکێش: ململانێ.

---

رفۆك: ئەو خاکەیە هەمیشە دادەکەوێ.

---

روارە: پێچکەی لانك.

---

ڕێژەو پێژە: ئاوێکە تەنها بە کەلك شوشتن دێتن.

---

ڕێسمە: گرێژنە.

---

ڕێشمە: هەوسار.

---

ڕێی تێناچێ: جێبەجێ نابێ

---

راویە: تێرکەیەکی دوولای لەمشەمما دروستکراو بوو تایبەت بە ئاوکێشان.

---

ڕەژوو فرۆش، دەستی ڕەشە ودڵی پاك.

---

ڕەژوو ڕەشە+پشکۆی گەشە.

---

ڕەژوو، ڕەشیش بێ، هەر کوڕی دارە.

---

ڕۆژ چرا دابگرسێنی+شەو بە تاریکی دادەمێنی.

ڕۆڵەت شوان بێ بەفەڕە+دڵسۆزی ماڵ ومەڕە.

ڕاز بوو بە دوو+ئەدر کێ زوو.

ڕازی نەبی بە بەشت، ناحەسێتەوە لەشت.

ڕان ومێگەلت کۆیە؟+دز وگورگ ڕەنجەڕۆیە، کشتوکاڵت بڵاوە+دور لەئاگر ولافاوە.

ڕووبەڕوو هەڵیکێشام+پاشملە پێیداکێشام.

ڕووخۆش وژیرە -وەك شەکر وشیرە.

ڕووگیری، لە زۆرگیری خراپترە.

ڕوومەتی قیرینە. بەختی شیرینە.

ڕووی سوورە+مەسرورە.

ڕووی شۆخ وشەنگ+دەوای دڵی تەنگ.

ڕۆژانی تەم+بارانی کەم.

ڕۆژگار بۆ بەندە- سەرانسەر پەندە.

ڕۆژگار ڕوو بکاتە هەرکەس+سامان خۆی دێتە بەر دەس.

ڕۆژووی بێ نوێژ+تۆپی سەرەولێژ.

ڕۆژێ دەیکەنە سەردار+ڕۆژێ دەیبەنەسەردار.

ڕۆستەم کاکم بێ -نابێ باکم بێ.

ڕۆن بۆ هیزە وگۆشت بۆ دیزە.

ڕۆڵەی تاقانە، یا شێتە یا دێوانە.

ڕەحم بە خوێنمژ وزۆردار+دژمنییە بۆ هەژار.

ڕەفیق، لێزانە+کارت ئاسانە.

ڕەفیقی قەل، بەشی هەر گووە.

ڕەقەن بکێڵە+قەرز مەهێڵە.

ڕەنجی داوە بۆ پیری+تێر دەخوات نانی تیری.

ڕەنجی کۆڵبەکۆڵ+ بۆ فێڵبازە وزۆڵ

ڕەنگی زەردە+هێمای دەردە.

ڕەنگی سوورە+لە ئێش دوورە.

ڕەنگی سەوزە+کانی وحەوزە.

ڕەنگی شینە+ماتەمینە.

ڕەنگی ڕەشە+سەربەهەشە.

ڕیشی مام حاجی، لۆکەی هەلاجی

ڕێ باریکە، شەو تاریکە.

ڕێزی کیسە، بە پووڵە.

ڕێگە، خەڵوەتە وگورگ بەهەڵمەتە

ڕێگە، لە دز وجەردە ناگیرێ.

ڕێوی ئیش بۆ خۆ دەکا+مریشك باوکەڕۆ دەکا.

ڕێی بریوە، پێڵاوی دریوە.

ڕەنجەڕۆت کردم، دەستخەڕۆم مەکە

ڕۆحی تێدا نییە.

ڕاستی نییە.

ڕژدی، ڕیسوایی لە دوایە.

ڕقێك مار ئاوەدانکەر، ڕقێك مار وێرانکەر.

ڕقی خۆی پێڕشت.

ڕم جێ بکەرەوە، ئەوجا بیوەشێنە

ڕۆحیان لە قوونی یەکدایە.

ڕان بێ شوان گورگ دەیخوات.

ڕۆژێك بە مل بەرزی، نەك سەد سار بە مل حیزی.

ڕەنج، پەیژەی سەرکەوتنە.

**ڕێگەی کانی پێچاوپێچە، خەوی نایە بیانگەی کێچە.**

---

**ڕووی مەجلیسانی** نییە.

---

**ڕەنج، سەرئەنجامی** گەنجە.

---

**ڕەنجبەری ماری خۆیەتی وئاغای ماری خەرکی.**

---

**ڕاست بەڕاست،** خوار **بەشکست.**

---

**ڕوولە با میز دەکا**

---

**ڕەخش لۆ ڕۆستەمی، گاڕان لۆ دوشەمی.**

---

**ڕۆژێك بەشێری،** نەك سەد **ساڵ بە کەرەبابی.**

---

**ڕاست لەمەزەبیدا** نییە.

---

**ڕەوشـــــــت لەگـــــــەر شـــــــێری دێ ولەگـــــــەر مـــــــەرگی دەڕوا.** (لەگەر: لەگەڵ)

---

**ڕەشی خۆم باشترە** لەسپی **خەرکی.**

---

**ڕژدی، ڕسوایی** لە دوایە.

---

**رایەخ: شتومەکی** ڕاخستن.

---

**ڕەخسکان:** ڕەخساندن، **ڕەخسان**

---

**ڕۆژی تەنگانە، ڕێوی کلکی خۆی لێ بەرایە.**

---

**ڕەقە وەك توو،** ڕەشە **وەك موو، دەوڵەتی بابی دەیدا بە شوو**

---

**ڕێگەی بەگەوە:** ڕێگەی **بە پێچوپەنایە ولەناوچە شاخاوییەکاندا (هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەڵاح سەعدی ل٢٩٩)**

---

**ڕەوەك: مـــــاڵاتی** ســــرك **وترســــنۆك، ئەوانــــەی لــــەناکاو** ڕادەپــــەڕن. **(هەگبـەی زاراوە** ڕەسـەنەکان**-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچـوونەوەی: سـەڵاح سەعدی ل٣٠٨)**

---

**ڕان وگردەڕان یان** ڕان **وشلکەی ڕان.**

---

**ڕەباس: جۆرە** ئاودانێکە **واتا تێرئاوبوونی شینایی ودەغڵودان بەشێوەیەك ئاوەکە لەسەر ڕووپەڕی** زەوییەکە **گۆم بکات.**

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٨)

---

ڕێژەوپێژە: هەموو جۆرە ئیشوکارێکی ماڵی بزانیبایە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٥)

---

ڕووبار زۆرن، بوار نین.

---

ڕەشە، تام و بۆی خۆشە.

---

ڕەشە، خاوەن بەشە.

---

ڕەشی بەر هەتاوێ، سپی نابتەوە بە تاوێ.

---

ڕێوییەك هاتیە لە سنە، کلکی کردیە بە پنە، بە قوونی پیاوی دووژنە.

---

ڕەحمەت لەوەی دوو دران یەك دەخا.

لەعنـــــــــــەت لـــــــــــەوەی دوو دران لێـــــــــــك دەکـــــــــــا.

(در: دڵ)

---

ڕێوییەك هاتیە لە سابڵاغ، کلکی کردیە

بە بەیداغ، بە قونی پیاوی بێ دەماغ.

---

# ز

زاری بەرێت خۆش بێت، بەنوقر ونەبات بێت

زگی من عەنباری ... ی کەس نییە واتە نهێنی کەس ناپارێزم

زەرنیخ قات بوو ... ن جووبوو، جووش شەموو بوو.

زەمانی عیسا وموسای نییە هەرچی درۆی کرد چاوی کۆر بێ.

زووراندنەوە: کولاندنەوە، برینەکەی زووراندەوە.

زوورایەوە: کولابوەوە. هێند هێشا زوورایەوە

زورنا سەقەتە: (زورنا قووتە) بێچوە چۆلەکە، فەرخە کێشکە

زلچی: شلپە

وە لە ڕونی زلچەی دەهات

(شەوچەرە ل ١٠ ... تایەر حەوێزی)

زێدە بەدەر: زیاد لە پێویست، لە حەد بەدەر

فاتح ڕەسول لە کتێبی کاروانێکی دوورودرێژدا چەندان جار (زێدەبەدەری) بەکارهێناوە. بەراستی نەنکە ئامینە زێدەبەدەر لەسەرەخۆ پشوو درێژ و خواناس بوو، ل ٢٦

زرۆبی: ناو ساحە .لەکۆیە مستەفای زرۆبیان هەبوو زرۆبییەکەی تەنك وەك کاغەز وابوو

زڕباب: باوە پیا ...

زڕداك: باوەژن

زڕبرا: دوو برا دایکیان جیابێت

زڕخوشك: دوو خوشك دایکیان جیابێت

زەبون: لاواز، هەژار

زەقنەبووت: ژەهر (بەزەقنە بووتت بی) قوزەڵقۆرت

---

زینی لە کەرێ دەخا

---

زارك: دەركە، کونی شتەك. دەك زاركی درۆیان بەقوڕ بگیرێ

---

زاركی دەركێ: بەردەم دەرگا دەروازە

---

زبارە: هەرەوەز، لەناو جووتیاران باوە

---

زی: یەخەی کراسی کوردی و دڕك،دڕکەزی

---

زەندەق: زراو چوون، ترسان، ئەترەش

---

زگ بێستانە، هەموو شتەك دەبینی

---

زمان درێژی دەست کورت، ترسنۆك

---

زەواق: بێزارکردن، لە زەواقیان ناوە

---

زرت و زەلام: گەورە، زەبەلاح

---

زەڕی کرد: زیانی دا بەتایبەت بۆ ماڵات بەکاردێ

لە خۆشناوەتی واتە ئیکی کرد جووت بوو

---

زاکو ماك: مەڕو بەرخ یان بزن و کار بە یەکەوە فرۆشتن، مەڕدارو قەساب بەکاری دەهینن

---

زێرچەنە: خواردنێکە بەسەری مەڕ وبزن تەماتەو باینجان وبامیە تێکەڵ دەکرێ

زێرچەنە: ژێرچەنەیە خواردنێکی رەزەوانەکانی کۆیەیە، لەگەڵیاندا بۆ جێگری دیکەش دەگوێزرێتەوە بەزۆری هۆبەی سەرلەبەر لە ئێوارەیەك ئەو ژێرچەنەیە دەکەن لە داوەتی خۆیان ئەمیش وشەی فەرهەنگییە.

(زاراوەسازی پێوانە مەسعود محەمەد ل٥٩)

---

زمانت بە بڕین چێ

---

زمانت لەقورگی عاسیبێ

---

زمان درێژ: جوێنە، دەمەوەر

---

زەلامی خوار سە لێی دەترسێ: سەگ دەترسێ وا دەزانێ بۆ بەرد راوەشاندن و هاویشتنی شۆربۆتەوە

---

زەیقەت: لە ناخۆشی و تەنگاوی

زیرە لەگۆی درت دات، زیرەت لێ هەڵسێ

زەردە زیرەت پێوەدا

زمان درێژ، زمان لوس، زمان شیرین

زەفت نابێ: ڕاناوەستێ، داناکەسێ

زلە: گەورەی مێشك بۆش، کەتە

زەرفێن: یاری سێن وزەرف، سینی سینیانێ، یاریەکە بەشەوانی مانگی ڕەمەزان دەکرێ:

ئەی مەلا قەت تۆ لەزەرفێندا وەها ئازانەبووی

یالەحیزی بەختی من، یامۆرەکەت مووی پێوەبوو

(شێخ ڕەزای تاڵەبانی)

زستان سەپانە هاوین تێلەکێش

زگ سفرە نییە بیدرێنی

زگ بگیری مشتێکە

بەری دەی دەشتێکە

زێوەردە: قەرە خەرمان

زستان پینە وپەرۆ

هاوینان وردورد برۆ

زستان ئاگر وئەز

لواران ئەز وپەز

هاوینان ئەرز ورەز

زستانان سارد وتەز

زەردی زەعفەرانە. نام لە حوشتران، ناردم بۆ کافران

(توتن)ە

زۆران: صراع

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٩)

---

زۆررەوی: مبالغە

زێدەرەویش بەکاردێت

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٥٩)

---

زاوا ڕێوی: ئەو زاوایەی زۆر پابەندبێ بەماڵی خەزووری ولەگەڵیان بژی، زاوابەندی

---

زۆردار بیانگەی وا دەبینێتەوە. پەکی ناکەوێ

بیانگە: بیانوو

---

زەبروزەنگ: بەهێزو توانا

---

زێڕ: ئاڵتوون

---

زیلەمۆ: ژیلەمۆ (پشکۆ)

---

زەعیفە: ژن، ئافرەت

---

زڕ: ناڕەسەن، ناجسن، ناپەسەند

---

زیپکە: عازەبە

---

زار: دەم

---

زۆر بە حینجە وفینجەیە

---

زۆرمل حیزە

---

زۆرمان دی ویستی دۆستی خۆی بخا

کاتێکمان زانی وەك دیوار ڕووخا

---

زاوا کەری خەزورە

---

زاوا زێڕینە

---

زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە

---

زەڕینی هەیە، پەڕینی نییە

---

زرتە زەلامێکە، زرتە بۆزێکە

---

زستان هات خەمی هەژارە

لای دەوڵەمەندیش هەروەك بەهارە

زمانی بگری بەقوونی قسە دەكات

زمانی لەناو دەم وشەویلاكی خۆی دایە

بەس قورمیشەكەی لەسەری ژنەكەی دایە

زێر بەقیمەتی خۆی زیویش بەقیمەتی خۆی

زین لۆ ئەسپ، كورتان لۆ كەر

زەردیلـــــەی بـــــە ڕۆژ مێـــــوان، بەشـــــەو ونبـــــووی نـــــاو زینـــــدان

(تیشكی هەتاو)ە

زەردە ڕۆژ نییە، بار هەردەگریٚ كەر نییە، دەفڕی فڕۆكەی هەیە

(مێش هەنگوین)ە

(هەگبەی دێرین–هۆشیار نوری لەك ل٤٣)

زمانی لەپشتی، كلكی لەتەنیشتی، رزقی لەدەشتی

(ئاشی ئاو)ە

زگی پڕە، بێ سێبەرد

(چاڵی گەنم)ە

(هەگبەی دێرین–هۆشیار نوری لەك ل٤٣)

زەمین لافاوە، شارێك لەسەر ئاوە، هەموو زیندەوەرێكی لەناوە

(كەشتیەكەی نوح)ە

(هەگبەی دێرین–هۆشیار نوری لەك ل٤٣)

زۆر بەغارە، لاقی نییە. ماڵیشی لەبن عەردییە

(مار)ە

زستانێ خڕە، هاوینێ پڕە

(ڕەشماڵ)ە

(هەگبەی دێرین–هۆشیار نوری لەك ل٣٩)

زۆر ڕەقە، دەبێ بەئاو

(بەفر–سەهۆڵ)ە

زیندییە، مردی دەکا، مردی زیندی دەکا

(مریشك وهێلکە)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٤)

---

زەردە زەردە، لەبن بەردە

(دووپشك)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٤)

---

زێدەگری: مزایدە

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٩)

---

زمان گۆری: دوبلاج

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٩)

---

زبارەی هاوپەرێزی: وا رێك دەکەوت دووچینە دروونە دەکرا، هەریەك بۆ کابرایەك، ئەو چینەی لەسەروە دروونەیان دەکرد چێشتانێ یان نیوەڕوانێ لەدروونە دەبوونەوە، دەهاتنە سەر بەرێز و تەبارەی جیرانەکەیان ئەو ماوەی لەرۆژەکە ماوە درونەیان بۆ ئەوان دەکرد بەزبارە

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٣٢)

---

زارجوەبنێشت: لە (زار+جو+ە+بنێشت)ەوە هاتووە. واتە هەندە بنێشت کە لە زارتی بنێی و بیجوی.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

زرپۆ: بە یەکێ دەگوترێ تەنگەستوورو هەندەش کەڵەگەت نەبێ

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

زیبەند: جێگەی تەیمانکراو وگیراو بەدرکەزی وتەل

ماچەکانت جەعفەر

ڕەنگاڵەی خۆشەویستی بوون

لەزیبەندی پڕ حقدی ڕەگەزپەرستی

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل٩٤)

---

زاناندن: الادراك المعرفی ئەو زانینەیە بەهەوڵی تێفکرین وخۆ دەرسدان پەیدا دەبێ نەك زانینی عادەتیی کە لە خۆوەدێت

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٧٩)

---

زڕشەمشە: خشڵێکی ئافرەتانەیە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٧٣)

---

زانستی کورد لەرابردوودا یەکجار دەوڵەمەند بووە، لە ئابووری کورد

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٢٦)

---

زانست وباوەڕ وئایین کەوا کڵکڵی ژیانی "مەعنەوی" کورد پێک دێنن یەک دێڕ و وشە وپیتی لەسەرچاوەی کورد وکوردستانەوە هەڵنەقوڵیوە وهەموویان دەرەکین

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٧)

---

زاڵم وخوێنڕێژ مێژوو دەهەژێنن، دنیا دەشڵەقێنن، ئەوانە هەموو دوژمنی ئادەمیزادن، خوێنی خەڵک لە شادەماریان فڕکەی دێت. ئەمانە وەک شەمشەمەکوێرە لە تاریکە شەوی مێشکی من وتۆدا دەژین هەرچاومان هەڵێنین دەڕمێن. ئەمانە لەبەر بچووکی ئێمە زلن، ئەو ساتەی من وتۆ خۆ بە کەم نەگرین دەبنە هیچ

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٦٤)

---

زۆرجاران ئاکامێکی گەشی لایەنی ئەرێتی هۆش دەکەوێتە باوەشی واقیعێکی هێندە دواکەوتوو هەر هەناسەی تێدا هەڵێنی هەلا بەهەلا دەبێت وئەوەی لەسەریشی بکاتەوە ماڵی دەڕمێنێ

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٤٧)

---

زۆرجار پیاوی فێڵباز دان بەهەڵەی کۆنی دا دەهێنێ وفرمێسکانیش هەڵدەوەرێنێ هەر بەنیازی ئەوەی فێڵی نوێت لێ بکات

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٥)

---

زانین ونەزانین، ڕاستی و وڕێنە، هەموو هەر بەچکەی هۆشن، بەڵام وەها لەهۆش دەوەشێتەوە بڵێین لایەنە پەسندەکە بەچکەی شەرعییەکەیەتی ونەوی ناپەسندیش بەچکە زۆڵەکەیەتی.

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٠)

---

زگی پڕە وبێ سێبەرە

(چاڵە گەنم)ە

---

زەمانە داربەڕوو دەکاتە دارەمەیت

---

زێر وەشان: زێر شاباش کردن

---

زەمهێر: ئالیك

---

زۆر دەڵێ وکەم تێ دەگا.

---

زۆر مەکە لە خۆت زیاد لە ئەندازە، تەجروبەی خۆت بکە ئەمجا ژن بخوازە.

---

زارم بەشیر سووتاوە، بۆیە فوو لەدۆ دەکەم.

---

زاوا بۆ ڕۆژی داوا.

---

زەماوەندە، هەیت وهووتە، گۆشتی نییە. شۆربای ڕووتە.

---

زگی پرسی، چ نا پرسی، خوای ناناسی.

---

زەردە لوو، بۆ گەروو .

---

زەمان هەندێك کەسی گۆڕیوە، هەندێکیشی هاڕیوە .

---

زمان درێژ بیت دەستت کورت دەبێت. کەخۆت هەڵکێشا گوێت لە زڕت دەبێت .

---

زستان دەڵێت: ڕۆژێکم مابێت لەبارا کلکی بزن دەکەم بەدارا .

---

زووڕات: زووڕات لەوەرزی پایز دەچێندرێ و لەهاوین دا پێ دەگات لەسەردەمی کۆندا دەکرا بەنان وەکو گەنم

(کەلەپوری کوردەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٨)

زەلام بۆ کوشتن، ژن بۆ دانیشتن.

زێڕ بوونە پولەکە، مێرد بونە جوولەکە.

زگی تێرم، ئەسپی ژێرم.

زاری خەڵکی کونە دیوار نییە، پەرۆی تێ بئاخنی.

زانیت کە حەریف لە خۆت زیاترە، شەڕی خۆتڕێن نەکەی چاکترە.

زۆری پێیە وکەمی دەردەخا.

زینی ئەسپ، لۆ کەر نابێ.

زگ تێشوو هەر ناگرێ.

زەردە زەعفەران نییە. نووسراوەیە وقورئان نییە.
(لیرە).

زەردی چوار پێیە، کانیلەی لێیە، ئاگری پێیە.
(سەماوەر).

زیندووی بێ گوڵ، باغی بێ دڵ.
(هەنجیر).

زەوی تۆی نەدەی شین نابێ

زیوان دەچێنێ

زمانی گەلەك لووسە

زاوا نیتی دانۆك، بووك دەیەوێ گۆ بەرۆك

زگ بیستانە، هەموو چەخشنەکی دەینی

زمان لووس و کلك پان، سەر چاوەی هەموو قیتنان

زندی و مردی بە ئاوێ پاگژ دەبنەوە

زۆر بە پلك و پلتوورە

زۆر برێ، هەمووشت دەرێ

زێڕ بووینە پوولەکە، مێردبووینە جوولەکە

زێڕ دەریّ هەرم گرە، زێڕ دەریّ بە خۆم وەکە

زمـــان ووشـــەیە،واتایە،راڤا و دەربڕینە..بیرکردنـــەوە و رەوشـــت و بـــاوەڕی نەتـەوەن..زمانیش رێبازە بۆ دەربڕین و گواستنەوە و بەکارهێنانی بیرکردنەوە، لـە شـێوەی دووان و نوسـیندا.. بیرکردنـەوە ووشـەی بـێ دەنگـە،زمانیش بیرکردنـەوەی دەنگدارە.

فوئاد تاهیر سادق

باسخوازی (باسی کۆمەڵایەتی،دەروونی،زمانەوانی و گشتی یە) (ساڵی ١٩٨٥)ل٣٥

زەمۆمـە: دوو پارچە دارە، کـە لـە داری بـەڕوو خۆشـکراوە. لـەکاتی لێکدانی هـەوجاڕ ومژانەدا ئەو دوو زەمۆمانە دەچنە نێو کونەکانی هەوجاڕ ومژانە ولێکدەبەسترێنەوە.
(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمید ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەڵاح سەعدی ل٢٦)

زمانت بگرە دەستم بەدامان
تا دەژی بڵێ ئەی زمان ئامان

زڕجۆش: جۆرە لەحیمێکی زۆر قایم وپتەوی چەخماخچییەکان بوو، ڕەنگی زەرد بـوو بە قەوانی زەررد دەکرا، پێیدەگوترا (زڕجۆش).
(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمید ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەڵاح سەعدی ل١٣٠)

زەرگار: جۆرە کلاشێك بووە لەموو دروست دەکرا.

زەگەزەوی: جۆرەگیایەکی بەهاریە گەڵاکـەی زۆر وردە، سـەلکەکەی دوای دەرهێنـانی لە ژێر زەوی وسپی کردنی دەخورێتن.

زەفتیە: جۆرە پۆلیسێکی نیمچە خوێندەوار بووە لە دەوڵەتی عوسمانی.

زەگور: بۆشایی ناودیوار.

زەواق: بێزار، هەراسان.

زرتەزەلام: شینەزەلام

زگڕۆ: کەسێکە هەرچەند پارەی دەستکەوێ خەرجی بکات وبیخوات.

زۆج: ساویلکە. خۆ رۆج نیمە باوەڕت پێ بکەم.

زیقۆ: چیڕ، منداڵێکە واز نەینێ لەسەر مافی خۆی خۆی بپچڕیتەوە،نازناویشە.

زانا، لەپرسین ناترسێ. نەزان، لەهیچکەس ناپرسێ.

زاوا تەزێنە وخێزان بەزێنە.

زاڵم بێ هێزبوو+پەست وبێ ڕێزبوو.

زاڵم زەواڵ بیکا گیر+نەی پەرژێتە سەر فەقیر.

زاڵم، لێکەوت+دەچێتە مزگەوت.

زستان خۆشە لەبەهار، خەوتوون دووپشك ومار.

زستان نانەوا وهاوین بەفر فرۆش.

زستانان سەفەر+ئەتخاتە خەتەر.

زمان ئەسپی سەرکێشە+لەغاوی کە وڕایکێشە.

زمان قورس وگوێ سووك بە.

زمان، مارە وگورگی هارە.

زمانی شکاوە.

زمانی یەك، دەزانن.

زمانی چزوودار.

زمانی وەك مقەس+دەبڕێ هەموو کەس.

زوو پەشیمانی باشترە لە دێر پەشمانی.

زۆر شتی شکاو لە ساخ بەنرخترە.

زۆر گەڕیوە ودونیای دیوە.

زۆر لەماڵ نەبوو+ژنیان دا بەشوو.

زۆردار لێکەوێ دەبێتە وەلی.

زۆردار، خوێن دەمژێ وفیکر ناکوژێ.

زەماوەن، هەمووی بەقەرز ناکرێ.

زەوی تێر نەبێ لە ئاو+گژوگیا نابێ پاراو.

زەوی شۆرەکات، گوڵ ناڕوێنێ.

زەوی نەرم، خۆشەویستی گای تەمەڵە.

زەوی نەرم، هەموو کەسێ دەیکێڵێ.

زەوی وزار+دز نەبەرە وبێ ئازار

زەرم داوا و (بەڵا)م کڕیوە.

زێڕ کۆنە نابێ.

زێڕی بێ بار+بەزەهری مار.

زێڕی پاك، هەرگیز لە کوورە ناترسێ.

زێڕی ناو خاك، ڕۆژێ دەردەکەوێ.

زگ کەوتە هاوار+ نامێنێ قەرار.

زگی بەپشتیەوە نوساوە.

زگی، بەنانی گەنم دێشێ.

زەکاتی مرۆڤ، کردەوەی جوانە

ویژدان وزمانیش، لوتکەی ئینسانە.

(محەمەد داریاس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

زوڕنا بدە بەدەست ناشی. فوو بەسەرە گەورەکەیدا دەکا.

زوڕناژەن بێ وشایی کوڕی بێ.

زرێ بێ ولەسەر پشتی کەرێ بێ، جا وەرە هیوات پێیبێ.

زمانی بگری بە قوونی بە جواب دێ.

زۆر بە حینجەوفینجەیە.

ئاین وئۆینی زۆری لەبن سەریدایە.

زۆر دوور نەچین.

زۆردار ئاوی سەرەوژوور دەڕوا.

زۆری لەسەر دەڕوا.

زەماوەند بە چەوری وشیرینی.

زەماوەند وزڕێ زڕێ، شۆربای ڕووتە ولاقە مرێ، لۆ کێ دەچێ خوا بتگرێ؟

زەماوەندی سە وگورگ، شیوەنی شوانە.

زاری کردەوە، دەڕێ: گوو!.

زێڕ لە خاکدا ژەنگ ناهێنێ.

زێڕی بێ خڵتە.

زێڕی هەژدە عەیارە.

زۆر سەراوان وبناوانی تاقی کردۆتەوە.

زۆری قووڵی مەکەرەوە.

زین لۆ ئەسپە وکورتانیش لۆ کەر.

زمانی تێك ئارا

زێڕی پاك ژەنگ ناهێنێ.

زەوادی خوا شك نابات.

زمانم کول بوو.

زەوی وەك چەرمی گایە.

زۆر سەراو دەراوی دیوە وقاچی تەڕ نەبووە.

زێڕ دەچێتە سەر خەزێنە.

زەبری کوتەك بەدەست، ئاشی دێم دەگێڕێ.

زۆی هەیە، دەوەن دەهاڕێ.

زگی تێرم کاری دەستی ماندوومە.

زگ توێشوو هەرناگرێ، پشت توێشوو هەردەگرێ!.

زاری کردەوە، دەڕێ: گوو!.

زستان خۆت گیر مەکە، بەهاران خۆت تەڕمەکە.

زستان باران بی بڕۆ، بەهاران هەوربی مەڕۆ.

زمانی لەدەمدا نییە.

زگی، نانی گەنم هەرناگریَ.

زەماوەند وزریَ زریَ، قلی نۆکەر ولاق مامریَ.

زگی مەنجەڕێك نیسك دەگریَ، کەلیمەیەك قسە ناگریَ.

زمانی بڕاوەبە، سەری حەساوەیە.

زەماوەندی سەگ وگورگ. شیوەنی شوانە.

زوڕناچی کە برسی بوو. بیری شایی دەکا.

زمانی خەرك، قوونی خۆت نییە بیقووچێنی.

زرگار: ئەم جۆرە پێڵاوە بنەکەی قالَتاغ بوو دەورەی دەچندرا بەبەن وسەر پەنجەکانی والاَ بوو وقایشێکی بەقەد دوو پەنجە پێوە بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاَح سەعدی ل١٥٦)

زەنگور: پارچە کەرپووچی ناواخنی نێو بۆشایی دیواری بەرینە.

زۆر لە شارە کۆنەکانی کورستان لەبەر هێرش وپەلامارەکانی بیانی شوورەیان بووە...نموونەی ئەو شارانەی کە شوورەیان بووە ئەمانەن:

ئامەد (دیاربەکر) (کۆساری کۆیە)، (خورماڵ، گوڵ عەنبەر)

(فوئاد تاهیر/لەنێو شانازییەکانمان سلێمانی ٢٠١٧)

(خەرك: خەڵك) (لۆ: بۆ) (نوستی: نوستوو) (ئی مە: هی ئێمە)

ژیانی مرۆڤ بەبێ مردن بێ تام دەبێ

(د.کەمال مەعروف)

ژن هێنان وخانووکردن. ئیمام عەلی زامنە

زۆری ڕوو دایتێ.

زمانی خۆش، لە بەهەشتەوە هاتیە.

زۆر بێ و بۆر بێ، بۆر بێ و نێر بێ، نێر بێ و تێر بێ.

# ژ

ژنی پیران، وەکی میران، لەجێی مەڕان

ژنی بەمێرد باغی بە پەرژینە

ژنی مێردان بە، لەبن بەردان بە

ژوشك فەرخەکەی خۆی پێ نەرمە

ژنت بمرێ، پیست لێ دەبێتەوە بە خوری

ژن مێردی بە دڵی خۆی بێ، شەو باچارۆگی خۆی بێ

ژن بەسەر وپۆر، وراغ بە جل وحۆ

ژن لەپاش ساڵەوەختەکی، ئەسپ لە پاش مانگێکی مەتحی بکە

ژاژی: ژاژوو

ژاوەژاو: هەراو هۆریا، دەنگەدەنگ

ژەك: شیری دایك لە دوای منال بوون ڕاستەوخۆ

ژن ببونە گەورەی ماران (مالاز) گیتگیان دەبڕییەوە، کاریان نەدەبڕییەوە.

ژەنگ ئاسن دادەرزێنتێت، خەفەت دڵ

ژن لە مشك دەترسێ، مشك لە پشیلە، پشیلە لە سەگ، سەگ لە پیاو، پیاو لە ژن.

ژن باخە، تا ئاوی دەی دەگەشێتەوە

ژن هێنان وژن نەهێنان هەردووکیان هەر پەشیمانیە

ژنم دەوێ ژنانە، پێستە بکات حەمبانە

ژن بەزیز بوون سووك دەبێ

ژن ڕەوشتی شیرین بێ، با نا شیرین بێ

ژن هەیە شارێکی دەینێ. ژنیش هەیە شەیەکی نایێنی

شە: شانە

ژووشك فەقیرە، کەچی مار دەخوات

ژیان گرانە، مردن ئاسانە

ژیکەلە: خنجیلە وحوان

ژوان: پێگەی دوو عاشق

ژوور: هۆدە

ژیر: زیرەك، زرنگ، هۆشیار

ژن هەیە وژنۆکەش هەیە

ژن قەلآی مێردانە

ژن چییە بە ئاوێنە وکلدانێك هەردەخەرتێ.

هەردەخەرتێ: هەڵدەخەڵەتێ

ژوورێکمان هەیە تاریك تاریك

پڕ لەژەنگ قلیشەی باریك (دەم وددان)ە

ژیانخواز: علمانی

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٠)

ژنی جوان دەردی بێ دەرمان

نەکوشتن نەتەلآقدان

ژن سەری ڕەسەن بێ. زێڕی بەرت بێ

(د.کەمال مەعروف)

ژێرپۆش: بەزرادە دەشێ بۆ (البسه تحتیه)لەژێر کراسیش گونجاوترە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٥١)

ژێرلێوخستن: وشەیێکی پێکاو وردە، عەرەبی ڕەهەکی دەڵێ (لفف)دەقی خۆی وشەی (ژێرلێو)بەواتای گوتەی سەرپۆش کراو لەبیری درایەوە بۆ فەرهەنگ وزاراوەش جوانە

(زاراوەسازیی پێوانە--مەسعود محەمەد ل٥٣)

ژمارنیگ: حاسبە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٩٠)

ژمێرک: عداد

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٢٣)

---

ژیانی مرۆڤ بەبێ مردن بێتام دەبێ

(د.کەمال مەعروف)

---

ژیان هەناسە هەڵهێنان وخواردن ونوستن چییە، مەبەست ئەو مرۆڤایەتییەیە کە لەو دیو خواردن ونوستن وهەناسە هەڵێنانەدا سەردەکات

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٠)

---

ژنت بمری، ریشت دەبێتە خوری

---

ژن کچی شوو بکا دەماخی سازە، کوڕی ژن بهێنێ کز ولاوازە.

---

ژنان بەچی دەناسی، بەداوێن وکراسی.

---

ژنی شارەزا، ماینی خانەزا، پیاوان بنازا.

---

ژن بێ باوەڕ و خۆش باوەڕە

---

ژن هەیە ماڵ وێران دەکات، ژن هەیە ماڵ ئاوەدان دەکات

---

ژن و فیل لە مشك دەترسن

---

ژنی پیاوی کوێر ئارایشتی ناوێت .

---

ژیرە، بە تەکبیرە .

---

ژیشك دەڵێت: لە بێچووی من نەرم و شلتر نیە ...!

---

ژن کە تووڕە بوو، ئەو گۆزەیەی کە پڕە لە نهێنی دەیشکێنێ.

---

ژن وەك هەنگە، یا هەنگوینت دەداتێ، یا پێتەوە ئەدات.

---

ژن بێ باوەڕیشە وخۆش باوەڕیشە.

---

ژن دەڵێ: نانی وشکم دەس کەوێ، خۆشە نەك پلاو لە پەنای هەوێ.

---

ژنی ژنانە، داینێ لە دیوەخانە.

---

ژن گرێیەکە بە کەس نەکرایتەوە

**ژن و جۆتیار بە خاترانە نابنە مار**

**ژنی باش بە کەس و کات دەکا، ژنی خراب لە کەس و کارت دەکا**

**ژنی بەوە سەر خەنجەرانە، مەی بەوە سەر کەسەران**

**ژنی جوان، دەردی بێ دەرمان، نەکوشتن، نە تەراق دان**

**ژار وسەم بخۆ+بەڵام خەم مەخۆ.**

**ژن بکەن بە کوێخا. ساڵێ جەو جار بزن ئەبڕێتەوە.**

**ژن بوو بە گەورە+بگرین بە دەوزە.**

**ژن بە لاوی بخوازە+جەگەریش گەرم وتازە.**

**ژن بەشوو وزەوی بە باران، دەگەشێنەوە.**

**ژن، زوو لەشت بێزار دەبێ.**

**ژن قەڵایە وپیاو تەڵایە**

**ژن کە دڵخۆشی ماڵ بێ+پێی خۆش نییە بەتاڵ بێ.**

**ژن لە دێ بێنە وقوماشیش لە شار.**

**ژن ماڵ دەکا بە لانە، دەیشی کا بە وێرانە.**

**ژن، بەدەنگ، گوڵ بەڕەنگ.**

**ژن، بەسووراو، پیاو بەخەبات، ڕوو سوورن.**

**ژن، پیاوی دەوێ+پیاو ناوی دەوێ.**

**ژن لەجەماڵدا+پیاو لە کەماڵدا.**

**ژن، تا منالی نەبێ بێگانەیە.**

**ژن، داوێنەکەی دژمنیەتی.**

**ژن، لە مێرد وزێڕ بێزار نابێ.**

**ژن، لەمناڵ بووندا تۆبە دەکا.**

**ژن، ماڵ ئاوەدان دەکا وکاولیشی دەکا.**





ژن، نانی وشکی دەویٚ+نەوەك گۆشتی پاڵ هەویٚ.

---

ژن، هەسانی مێردە.

---

ژن، هەم خۆش باوەڕە وهەم بیٚ باوەڕە.

---

ژنت هێنا با کچ بیٚ+با قەوی وکاڵ وکرچ بیٚ.

---

ژنت هێنا، بەختەوەری+بیٚ ژن وماڵ دەربەردەری.

---

ژنی باش بۆ کەچەڵ، بەشی باش بۆ تەمەڵ.

---

ژنی بیٚ جیاز+بیٚ دەمار وناز.

---

ژنی بیٚ حەیا، دەبێتە مێردی پیاو

---

ژنی بیٚ مناڵ دڵبەرە+مناڵی بوو کارەکەرە.

---

ژنی تەڵاق دراو+گای قۆچ شکاو

---

ژنی باش وژیر وجوان+بۆی دەستێنن دوان دوان.

---

ژنی جۆڵا، شاڵ وگوڵۆڵە دەدا بە کۆڵا.

---

ژنی خان وبەگ دەزیٚن+ژنی گاوان دەتەزیٚن.

---

ژنی داویٚن پاك+مرواری تاك.

---

ژنی دەوڵەمەند، مێرد کۆیلەیەتی

---

ژنی گەڕیدە+حەیای پەڕیدە.

---

ژنی منداڵدار وپیاوی وڵاغدار لەزەت لەسەفەر نابینن.

---

ژنی نییە ولانك دەکڕیٚ.

---

ژنیٚ، بێدەنگە، دوانیان، زەنگە. سیٚ، کورە هەنگە.

---

ژنی بەوەفا+هەنگی بیٚ جەفا

---

ژنیٚ کەوتە شوێنە پەستی+ئامان دەرچۆ لەدەستی.

---

ژنیٚ ددانی خواربیٚ، بەچاو پیٚدەکەنیٚ.

---

ژەم ژەم بخۆ+کەم کەم بخۆ.

---

ژیان ئاوەڕۆیە وچەمە+پاك وپیسی تیٚدا جەمە.

---

ژیان دەریایە، مەچۆ قولایی.

ژیان وئومێد لە یەك بەستراون.

ژیران، خەمی شێتیش دەخۆن.

ژیلەمۆی کۆنە، گەش دەکاتەوە.

ژینت مەخە ناو ئاگر. هەر وا نابی بەتاجر.

ژێردەستی؟ دۆزەخ بەشتە+سەربەستی؟ جێت بەهەشتە.

مەکری پیرەژنێ، ڕێوی دەکاتە کونێ.

ژن دەڵێن وەك هەناسەیە لۆ مێرد.

ژیان چ تار، چ شیرین. هەر مردنی لە دوایە.

ژن لۆ شەو وڕۆژێکی نییە.

ژن دەتکاتە پیاو، لەپیاوەتیشت دەخات.

ژنی مێردان، لەبن بەردان.

ژن لە پەراسووی چەپ دروستکرایە، ڕاستی بکەی دەشکێ.

ژن وئەسپ وچەك بەقایان نییە.

ژن ومار: نەك مار وژن.

ژنێکم دەوێ زمان دلێر. باوان وخەزوور بەیەکەوە نێر.

ژنێك نۆزدە مێردی کردبوو، بە ژنێکی تری دەگۆوت: بەهەردووکمان بیست مێردمان کردیە!.

ژنی بمرێ، ژن خوشك لە جێی.

ژیانی قەبری نایەتە کرین، عەمەلە ودەتهێنێتە ترین.

ژنیان گۆتییە بەزولفەوە، جەرەیان گۆتییە بە قورفەوە.

ژنی گەڕۆك، سەگی بەرەلا.

ژنێ سەر بەتۆز، نە ژنێ قیت قۆز.

ژنی چاك نیعمەتە، ژنی خراپ زیللەتە.

**ژنێ خۆی دەگێ، منەت دەکا لە دێ (ژنێ خۆی دەگایی، منەت دەکا لە ئاوایی).**

---

**ژنی دووەمی زۆر ناشرین بوو. کەریش بوو، پێیدا هەردەگۆت.**

---

**ژنێ قیت وقۆز، لێ ی بکۆریەوە بنی ئالۆز.**

---

**ژنێ بە مێرد مەگرە بەیار، سواریی کەرێ مەگرە بەسوار.**

---

**ژنەکە تڕەکی کرد لە مندارەکەی خۆی دا، پۆلیسەکەش تڕەکی کرد هەر لە مندارەکەی دا.**

---

**ژنە لە خەودا گۆتیە مێردەکەی باسی بەهەشتێم لۆ بکە گۆتی: لە جەهەنەمم.**

---

**ژن بەرازی بێ چەکە.**

---

**ژن زیندانە، مێرد تێدا زیندانییە.**

---

**ژن بینم یا نەینم هەر پەشیمانم.**

---

**ژن هەم دینە، هەم دین بەرە**

---

**ژنی خۆی پێ تێر نابێ، کەری بەبەرەوە دەگێ.**

---

**ژن بەدخوو لە مارتا، ئاگر بەتین لە پارتا.**

---

**ژنــی شــەدەلار، پیــاوی گــێ بــەگوار، ســار دوو بــەهار پەســندنین.**

**(گێ: گوێ، سار: ساڵ)**

---

**ژنی پیران بە، وەکی میران بە.**

---

**ژن یەکێکیان کاروانە، دوانیان عوربانە، سیانیان ئاخرزەمانە.**

---

**ژنێکە بیژمێری.**

---

**ژن ئەگــەر نەخشــینە، مــاری ڕەنگینــە.**

**(مار: ماڵ)**

---

# س

سفت و سۆ: شوێنی .ریینێك به ئازار بێ سەرەدەری لێ دەرناکا بێ ئاگا

سەگ وتوولە، نایەن .ربزی پەپوولە

سۆرەو تۆرە، نەبن ورە، سۆرەو تۆرە مێروەك زۆرە، ئەگەر ژنێك لەماڵەوە دش وخەسووی هەبێ

سەربڕانە: رووداوێکی مێژوویی خوێناوییە لە زەمانی بابانەکاندا ڕوویداوە گوایە عیساغا مووتەسەرو کۆیە بووە لەسەر قسەیەك غەفورییەکانی کۆیەی کوشتووە، قرچ و بڕی کردوون بەو ڕووداوە دەڵێن سەربرانە

لەڕۆژی هەرەوەز میوانە

سەربڕین دەڵێن سەربڕانە

محمد تۆفیق وردی مامەیارەی قارەمان ل٥١

سەری ڕەشەمە وکانوونێ، کەپوو پیسترە لە قونێ

سەری نایەشێ پڕێسکەی لێدەبەستێ، سەری نایەشێ سێتای لێ دەبەستێ

سە بە عاسمان حەپیسە: واتە سوودی نییە سەگ با هەر بەمانگێ بوەڕێ

ساپیتە: بر میچ، قوبادی جەلیزادە لە هەیکۆکانی قوباد ل ٣٤

دوو کۆتری ماڵی قەلاکێش

تابن ساپیتەی ئاسمان هەڵدەکشێن

لە پڕ بە تەقلە لێدار ملۆر دەبنەوە

سوو: داخ، خەم خەفەت،دەمرێ لەداخان، دەڵێن سووی بۆتەوە

سەدە: هێلێکی راستە لە کێڵان

سواڵە: دەسکێ دەغڵی دووراوەی دەستی سەپان مەڕۆ

سۆراغ: بەدواداچوون، بەدواداگەڕان

سەروسەکوت: دەم و چاو، شێخ رەزا دەڵێ:

ئیدیعای عیلم وئەم سەروسەکووتە

سیکتری کەن، کە هەر بەشی سوو کووتە

سەفەرسەلامەت

سیواك: ئەو دار وچیلکەی لەدەمی وەردەدەن بۆ ددان خاوێن کردنەوە

سمێرفش: سمێڵ گەورە، سمێڵ بابڕ، لە کۆیە مەلایەك هەبوو پێیان دەگوت مەلا قورمیش سمێلی بادەدا

سوێسنی، تەپلە گونی

هەتا ماوی ژنی منی

سۆفیلکە: کڵاوە کوڕە، باڵندەیەکە سەر بەکڵاوە

سەرچێر: جنێوە واتە سەرمانگا

سیرمەسە: لاوازو لەڕو چورچ

ساپ ساپانێ: گەمەیەکە (مێژووی کۆیە ل ١٣٩)

ساپ ساپانێ بە پارە دەکرا، بە بەردێکی پان وگۆیەکی خڕ دەکرا

سەی دەرمارە: ئەو سەگەیە خاوەنەکەی نانیشی نەداتی پاسی هەر دەکا، ماڵ بەجێ ناهێڵێ

سەی پێ سووتای: ئامارژەیە بۆ جنێو: دەڵێن:

دەرێی سەی پێ سووتای

وەکو سەی پێ سووتای هەر دەگەڕێ

سەرت تاشن- سەرت بە تاشین چێ: بە گاڵتەوە دەگوترێ ژنان لەناو خۆیان، بۆ پیاوانیش بەکاردێت کە کارێکی خراپی کردبێ

سەر دڕ: جلوبەرگی چنراوی دەستکردی جۆڵا، ئەو کەسەی جلوبەرگی زوو دەدڕێ وخۆی لەبەر ناگری

(حاجی قادری کۆیی ل ٣٧)

شەبیهی جۆڵا ڕازی نابێ بە سەر دڕی خۆی

مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا

سەر درە: یەکێك زوو جل بدڕێ

سەری گەورە دەورەتە

سەگەوان: سەرپەرشتی سەگ، وەك شوان

خۆم بە داراو ئەسکەندەر وخوسرەو نادەم

گەر بزانم لەبەر ئەم دەرگەیە دەبمە سەگەوان

(حاجی قادری کۆیی)

سەرمازیلە: سەر گچکە، نازناوە لە کۆیە

سەرکودیلە: سەر گچکە، سەر بچوك (سەری بە موس لوس کردبێ)

سەد ساڵی دیکە لەگەڵی بژی لە قولینچکی زگی ناگەی، واتا زۆر زان و سرِ قایم و نهێنیی خۆی دەپارێزێ

سەگەناس: بێ وەزع و شەپرێو، نەخوشییەکە

سیخن: مریشکی تازە پەڕ دەرهاتوو

سوا: جێیەك بۆ کەلایانێ دیاری دەکەن

ساقۆ : پاڵتۆ

سوالف: گفتوگۆ

سۆتەك: خۆڵەمێشی جگەرە، سوتوو

سیلە: گۆشە، سیلەی دایێ واتە ڕۆیشت، سوچ

سێوەرە: گیایەکە ماڵات دەیخوا، سێپەرە

سوول: تاقگەی بچوك، بافڵ

بەبادینی (سۆلاف). لە چنارۆك سولی خالە باس، سوولی خاتون وپاشا هەیە

سیخورمە: نقورچەو تێوەژنی کەسی تەنیشت بۆ ئاگادارکردنەوە لەقسان

سۆل: وەك نەعل وایە بەرەبابەك هەیە لە کۆیە پێیان دەڵێن سۆلدروو گوایە حەزرەتی حاجی قادری کۆیی شاگردی سۆل دروو بووە: لە ب پپ٩ی +وەرگیراوە

سابوونەڕەقی، لە تەق تەقی،پشتم تەقی، یارییەکی منداڵانە

سەپان: سەپانی پووشی کورتانی دەغڵ دروێنە دەکات

---

سەرو جۆتکە، مووش وکەلا

---

سێبەری بۆخۆی نییە بۆ خەرکی دەبی

---

سەی بەسەی بخنکێنە

---

سەری ئاشە بنی ماشە

---

سینی نییەو دۆیە، قسەی ئاغا درۆیە (دروشمی شیوعیەکانی کۆیە بووە)

---

سەر پەڕگ سەرێ: سەری سەرێ: سەر پەڕگ

---

سیسارکە کەچەر: داڵە کەرخۆرە

---

سیو سیوە: بنکەی دەرگا- گێژەنە، دەرگاکەی لە سیوسیوە دەرهێنا

---

سەری لەدوو قونێ نا: واتا ڕاوی نا، بە غاردان بەدووی کەوت

---

سەحەر: کچە جوولەکەیەکی کۆیی بووە، بۆیە سێوە دەڵێ ئەوەل سەحەرە

کازیوە: بەری بەیان

---

ساری وشک، بیتوێن سەرپشک، ساری تەڕ، بیتوێن لەڕ (سار-ساڵ)

---

سەر گەورەمان مام وسووە. ئەویش قوونی بە گووە

---

سەرە ویلك: نانەبەرە، سەرپۆشی نان دوای ڕشاندن تا نەرم دەبێتەوە

---

سەری بچی نوێژی ناچی

---

سینگ: دارێکە بستێك دەبی لایەکی تیژە لە عاردی دەچەقێنن بۆ بەستنەوەی مەڕوپەڵەور

ئەسپەکەت دەرکرد لەدەستم وای دریغ بۆ ئەسپەکۆیت

سینگەکەی ماوە کەریم خان پێم بڵێ بیکوتمە کوێت

(دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی-ساغکردنەوە وشەرحی شوکر مستەفا)

---

سەقا: ئاوگێر، لەناو کرێکاران یەك ئاو دەگێرێ پێی دەڵێن سەقا، گەورەترین بەلێندەر ناوی (ڕەشید عارف سەقا) بوو ئەندازیار بوو خەلکی کۆیە بوو، دیاروناسراو بوو.

**سماق:** ترش. لەدەڤەری کۆیە ناوی چەند جێیەك هەیە سماقی تیدایە، وەك سماق شیرین، سماقە. کەلکە سماق.

---

**سندۆڵ:** جۆنی

---

**سەبەتەکەر:** ئەو کەسەی سەبەتەو تلیانە دروست دەکا

---

**ساوەر لەئاوکە.** ماین لغاوکە: واتە زوو ساوار حازر دەبێ

---

**ساورمە:** داری وشك کە بۆ زۆپاو چێشت لێنان بەکاردێت، گزرە

---

**سواڵەت:** پارچە شکاوی دەفری گڵێن

---

**سیپارە:** نامیلکەو پەرتوکی بچووك وپەڕە کەم

(ڕۆستەم حەوێزی)

سیپارەمان هەڵدەگرین

مووچانەمان وەردەگرین

---

**سەقیل:** ڕەزیل

---

**سواندە:** وەك ستارە لە بانی هاتۆەتە پێش، دەڵێن: گوێسەبانە

---

**سامی سەران لە مێزەران**

---

**ساووڵ:** بەردکێش کردن، مەعموورە، مەعمول

---

**سرە مۆك:** مێوژی خراپ

---

**سەرتۆپ:** یەکەمین پلە، لە هەمووان باشتر، یەکەم بەش لە تۆپی قوماش

---

**سەرت لە قوڕێ نێن.** سەرو بابانت لە قوڕێ نێن

---

**سەرت لە هەشێ نێن،** سەری خۆت خۆی. بەمنداڵێك دەڵێن کە زۆر بگریا

---

**سینی نییەو ماستە.** قسەی شەعب راستە (دروشمی شیوعییەکان بووە)

---

**سیپە:** سندوق. جاران دەیانگوت سیپە تۆچا

---

**سە:** سەگ، کسۆك

زۆر سەگم دیوە فەقەت نەمدی ڕەقیبی هەندەسە

وەزعی نامەوزون دەبێ وەك خانووی بێ هەندەسە

(حاجی قادری کۆیی ل ٢٧٢)

(سامی عەودالّ)، دەڵێ:

هەنگوین چەند خۆش وشیرینی هەبێ

بەکەلکی چی دێ لە پێستی (سە) بێ

سەلکەتەشی: سەرە مێکوتە - مێکوتە

سەخرەجن: لە چیرۆکی میللی کوردی گوایە کوڕی پاشای جنۆکانە کڵاوەکەی ئەفسانەییە، هەر کەسێ لەسەر خۆی بنێ بزر دەبێ لەبەر چاوان کـــــڵاوی سەخرەجن: هەرچی خاوەنی بیەوێ بۆی جێبەجێ دەکا (سیحر جنە)

سەرەخۆرە: کەسەکی نەگبەت، دەبێتە هۆی مردنی ئازیزانی بەرەبابێك هەیە لە کۆیە (قەساب)ن پێیان دەڵێن بەرەی سەرەخۆرەی، ئەگەر ژن لەکاتی منداڵ بووندا بمرێ ومنداڵەکەی بمێنێ پێی دەڵێن سەرەخۆرە

سۆرکە: سووریژە

سەری زمانت بە برین چی

سەرت شین کەی لۆ خۆت

سمڕ سمڕانێ: قەرەپەستە. قەرەباڵغی

سەنعەتکار بازنی زێڕی لە دەستە: واتا هەمووشتێکی هەیە ژیان و گوزەرانی مسۆگەرە، واتە هەرگیز داماویی وپەك کەوتوویی ونەبوونی بەچاوی خۆی نابینێ

سەردولکە: پاڕانەوە، شین وشەپۆڕ، لاواندنەوە بۆ مردوو بە گۆرانی لە کویە پلکە سوراحی سەردولکە بێژ بووە.

سیرمە: بەنەچەرم

سیپەلاك: سی

سەمەندۆك: راجی شاعیر لە ل ٢٠٨ دەڵێ: سەگی پێ پەتك دەکەن

لە دونیا هەر دڵی عیشقە سەمەندۆك

تەنی پیرو رزیو وشك وقرچۆك

سەلکە بزۆت: داری ئاگراوی - دار کە خرایە ناوئاگر ولایەکی سووتا، پێی دەڵێن سەلکە بزۆت.

سیقەتۆرە: زەڕنەقوت، بێچوە چۆلەکەیەکی بێتوك، گەدەی باڵندە

سندرقۆق: دەبێ دەعبایەك بووبێ زۆر قوتە قوت دەکات، لە کۆیە کوڕێك هەیە پێی دەڵێن سندرقۆق دەبێت (عیبری) بێت واتە (قوم قومۆك)

سوژدی: جۆرێکە لە پڵاوپالێو، کاسەیەکی کون کونە: کۆیە دەڵێ: سوزمە

سەرکوتکە ئاسن: کەللە ڕەق

سپیاۆکە: خواردنێکە هێلکە وپیاز لەئاو کوڵاندن
هەندێ وتارو چاوپێکەوتنێ وێژەیی – خالید دلێر ١٩٨٥ ل ١٢٢

سێ یاری هەیە هەموو دەمان، سەك لۆ گەمان، یەك لۆ خەمان، یەك لۆ ماری مان ونەمان!

سێ کەس ناپەسندن: دەوڵەمەندی دز، فەقیری بە بوغز، پیری عاشق

سمپارە: سمارتە پارچە مقەبایەکە زوورە (زبرە)

سستەك: خاك وزەوی رزیو، ڕاجی دەڵێ:
ئەوەندەم خوێنی جەرگ ودڵ مژیوە
بەجێ ماوم لە شەپرزە وزار وسستەك

سوورتك: سوورتك بووە، سواوە، شەرمی بەهیچ نییە، چاوقایم، سۆنە. منداڵی هار وبزێوی کە گوێی لە هیچ نییە

سلێمانی ورگ
هەولێری موڵك
کۆیی جلك

سالووس: فڕوفێڵ وفێڵباز
وا حەشرە سۆفی ئەفەرموو هەتا لەدونیادا
سیا هەر دەببی و خەلق بزان سالووسی
(دیوانی حاجی قادری کۆیی)

سێبەڕۆ: لەرزوتای بەهێز (نەخۆشییە)

سووسەکردن: هەست پێکردن، پەی پێ بردن

سەرمۆر: نەشکاو نەکراوە، دەست لێ نەدراو

**سەری هێناو برد: بیری کردنەوە تێرامان**

**چەندی سەری هێناو بردو تێنەگەیشتم**

---

**ستارە: دیواری نزمی سەربان**

---

**سێرە: سەرلوولەی تفەنگ بۆ نیشانەلێگرتن**

**سێرەی لێگرت.**

---

**سەپکە: نانێکە نەبرژاوی نیوە هەویرە، بەتایبەتی بۆ سەگ دروست دەکرێت، لەکاتی نەبوونی برسیەتی مرۆڤ بەناچاری دەیخوات:**

**سەپکەیی بکا گۆزە ئاو بێنێ**

**تووتن ئاوبدا منداڵ بەخێوکا**

**شیعری توتنەوان لە دیوانی دڵدار ل٤٢**

**ئامادەکردن وڕێکخستن وپەراوێز دانانی رەمەزان حەمەد حسین وسەنگەر نازم**

---

**سەراورد: جۆگەی ئاو شەلەگەی لێ هەڵدەبەستن بۆ دێراو ماکاو وقەتار بۆ ئاودان**

---

**سەرچیخ: سەهوو، بەهەڵە، ئامانجی نەپێکا: فیشەکەکە سەرچیخی گرت**

---

**سەری لەبن بەڕێ**

**قوون دەکا شەو لەوەڕێ**

**ژنێکی خاوەن دۆست لەبن چیغی رەشماڵ، سەری لەکن هاوسەرەکەی بووە، پشتی لە دەرێ بووە**

**سێ ودووی لێ مەکە**

---

**سابوونی لووسم لەبن پێی مەدە**

---

**سەربەسەر، بێ دەردی سەر**

---

**سەر دادەپۆشێ**

**بن دەفرۆشێ**

**یان:**

**سەرپۆشی بن فرۆش**

---

**سەری دنیا بە پووش نەگیرایە**

---

**سەی لەسەی بەردە، خۆت تەماشای کە**

---

سەری سیری. قونچکی پیازی

---

سزای گرانجانان نەکرینە

---

سرۆ: ناوەڕاستی تیرەی دار

---

سێوەك بووم لە سێوی مولکی

کەوتمە دەست مل بەچلکی

نازانم خۆی دەمخوا یان دەمداتە خەلکی

ئەو پەندە قسەی کچێکی لێوەشاوە وشەنگ وچەلەنگ بووە، فڕاندویانە حەزلێکردەیەکی هەبووە، نەیزانیبوو بۆ خۆشەویستەکەی بووە یان ئەو کابرا چلکنەی فڕاندوویەتی

---

سەلام وعەلێك ئاغای دەنگنەکەر

پیلکەم دڕا قۆلم هاتە دەر

بەڕۆژ ڕۆژە سالی بردەسەر

---

سوارێ هات لەو لاوە، سێ توورەگەی بەداوە، یەکێ توو، یەکێ موو، یەکێ گوو، چنگم دا لە موو، قەپم دا لە توو، لەقم دا لە گوو

بۆ بەهەربۆدن ولێك تێك چوون بەکاردێت، کە هەلەی کرد پێ دەکەنن.

---

سێ مانگیلە. داك خەنیلە

کەمندالێ بووە سێ مانگان دەستی دەگرن وبەری دەدەن دەلێن گۆدە گۆدە ئەو قسەیە دەکەن.

---

سەرکدوولە: کوڕەك هەبووە، لە کۆیە زرینگ وعاقل وتەرەکە باز وفێل باز بووە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل١١٢)

---

سری بەر مەڕییە

---

سەرکەوا، سەرکەوێ: لەکەوا کورترە لۆکەی دەهاوێن.

باوی سەرکەوای نەمایە هەر داکم سەرکەوای لەبەردەکا، وەستا غەفوور لۆکەی دەدرووی.

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٧٧)

---

سەری سوری عەلامەت: بنی قوولی قیامەت، بەتەڕی لەناوم نا بە ئیشکی دەرم هێنا، سەی عەلا محەمەد، نان کە دەخرێتە ناو تەندوور بەتەڕی دەچێتە ناو تەندوور بەگەرمی وبرژاوی دێتەدەر!

---

سندووقی سووری هەمەدانە، هەموو ساڵێ لێت میوانە.

سایەقەی سامالّ، هەوری فەرەنگێ، دوو ئاو لە جامێ هەرەیەك لە رەنگێ
(هێلکە)یە

سەری بەردە بەردنییە، گیا خۆرکەر نییە، هێلکە کەرە ومریشك نییە.
(کیسەڵ)ە

سێ پا دەرزەمینی، شەش پا دەرحەوا، جرتی خۆی لەفرتی دا، فرتن کردە جرتی،
وەرنە لووی ئەوی پرتەپرتی (مەشکە لەدەوا کە کابان دەیهەژەنێ).

سندوق سلێمان، لە دەشتەکییان، تێیدایە پیر وجوان
(گۆڕ) (قەبر)ە

سەری بەتوو-بنی بەدایکت
(مەمك)ە

سەری یەك وبنی دوو، بە قوونی باب وباپیرت دا چوو
(شەرواڵ-دەرپێ)یە

سەیری دووبارە دولبەرم: بەناز برنج تەترە دەکا

سۆفیکەی بەر ماڵ بەشان، رۆژ دەڵێ ئەلا وئیمان، بەشەو دەڵێ ژنەکەی جوان.

سکت ی شێخ وەسانی وخورانی
بەلەعنەت بن لەگەر شەیتانی

سواری ناشی: سوار دەبێ جرەو نەگەی هاردەبی

سەپێ: ارتجال
(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٦٦)

سەد سوژن گاسنێکی تێ نابی

سەری بەقوری دەینایە پێکەنین

سەرێکە هێناومە، نایگەڕێمەوە

سەرێکی هەیە هەزار سەودا

سە بەپیستەوە دەخوا

سه زمانی بکاته برینی خۆی، چاك دەبێتەوە

سه گووی دەخوارد، دەیگوت خوا رزقم دەدا

سەی خۆمە قول وقاچی خۆم دەگری

سالحه فەندی قوندیلە، عالەمی هەمووی کرد بە دیلە، سالحه فەندی تەمسیلی عەسکەری دەکرد هەموو کۆیەی لە قاڤیٚ نابوو، تفەنگیان لیٚ دا پیٚ نەمرد وشەل بوو.
(مێژووی کۆیە- تایەر ئەحمەد حەوێزی ل١٢٤)

سەرەنیا: کە گاسنیٚ یاخود کارێکی دیکە لێی دەسوێن ئاسنگەر بایی پێویست بەسەریەوە دەنێتەوە دەگوتریٚ (سەرەنیای کرد).
(زاراوەسازی پێوانە مەسعود محەمەد ل٥٧)

ساڵی تەیاران، ساڵی ١٩٢٢ ئینگلیز کۆیە بۆردوومان کردووە

سەری نایەشیٚ، پرێسکەی لیٚ دەبەستیٚ

سامان تاسەر برادەر نییە

سۆتکەش رەشە، بۆنی خۆشە

سەربانی خۆمان تنۆکە دەکات، سەربانی خەڵکی دەگێریٚ

سەش بوەریٚ، کاروان ناوەستیٚ
سە: سەگ

سینگ شێری پشت مل ماکەر

سەگی خۆمانە، دەکا پاسی بێگانە

سەفەر ومعامەلە، سەنگی محەکن

سروشتە: غریزە
(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٦٠)

سەرکەش: مشاکس
(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٦٠)

سەری ئاشە بنی ماشە، واتە مەشغوڵە

سەری لەدووی قونی نایە: بە ژن وپیاوی بێتاقەت دەڵێن
دوای کەوتووە

سەربەڕۆ: جنێوە

سیڕەی قۆندەرەی دێ، سکی قوڕەی دێ

سایە: سێبەر

ستاربی: خاوەنماڵ بی

سوا: سیلاك بوو، واتە دایسی نەما

سیچکان: هێسك وپروسکی نەماوە

سەربزێو: عەجول

سێلچ: بەوانە دەوترێ کە لچیان بریندار بووە بوە بە دوو پارچەوە

سور گوم: لەناوبردن، بزرکردن

سەرەنگرێ بوو: واتە بەسەر سەردا کەوتە خوارەوە

ساحێبی باخ وبێستان
شەرمەزارە لەزستان

ساحێبی قسەی خۆی نییە. پیاو نییە

سەری بەقوربانی زگی دەکات

سەر قۆزی بن ئاڵۆز

سەرئەنجامی پیست دەباغ خانەیە

سەرە گوریسێکی بەدەستە

سەر دڕو بن دڕی جەوارێکن (جەوار: جەواڵ)
سەرمایەت لۆ خۆت زەکات لۆ خودا
مێوە کەبیبڕێ چاکتر بەردەدا

سەری گای دەکاتە قوونی کەرێ

سەریان پێکەوە نایە

سەگ دەستی دەشکێ. کلکی هەڵدەبەستن

سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە

---

سەگ لە پشیلە بەوەفاترە

کەچی پشیلە قەدری زیاترە

---

سەگ لە قەسابخانە نەمرێ، عومری بەزایەعێ چووە.

---

سەگ وگورگ ئامۆزان، بەڵام دوژمنی یەکن

---

سەگ وەڕی، بووک دەرپەڕی

---

سەگی وەفادار بەخاوەنی ناوەڕێ

دووپشکە سکی دایکی خۆی دەدڕێ

---

سواری کەرێیە، لەکەریش دەگەڕێ

---

سوند بەسەری یەکتر دەخۆن

---

سێر (سێڵ-ساج)هەر هەمووی ڕەشە

---

سێو نابتە هەرمێ

---

سێوەکە کرایتە دووکەرتك

---

سەری جاحێرە، بنی پیرە، زەمانی نوری سەعیدی لە بیرە

(فانۆس)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٥)

---

سێ کەس دوو سێویان خوارد، هەریەکە سێوێکیان بەرکەوت (ژن ومێرد بوون ژنەکە دووگیان بوو)

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٥)

---

سێ تاس، سێ بنە تاس، سێ بەربووك، سێ ڕەقاس

(کاتژمێر)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٤٦)

---

سەری پیسە، قوونی پاکە

(گەسك، گێسك)ە

---

سەری سوورە، نەفەسی بەرەو ژوورە

(جگەرە، جغارە)یە

---

سەری تیژە، بنی کونە گێژە، بزانە، سوژنە.

(سووژن)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٤٦)

---

سەیری خەڵکی دەکات، درۆ لەگەڵ کەس ناکات

(ئاوێنە)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٤٦)

---

سۆردەکرێتەوە، ناخورێ

(ئاسن)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٤٦)

---

سەری سەوزە، لەش رەشە، ناوی سپی وخۆشی گەشە

(باینجان)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٤٧)

---

سمێر قیتی لۆتیانە

(پشیلە)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٤٧)

---

سێ نوختە وشەش پیتە، بێ دیوار وساپیتە، خوانەکی جوان وقیتە

(رەشماڵ)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٤٩)

---

سپییە سێپایە

(خوان)ە

---

سێ یە نابێ بەچوار

(تەڵاق)ە

---

سێ لینگ لە عەردی، چوار لینگ لەحەوای

(مەشکە وسێپێکەیە)

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەک ل٥١)

---

سەری بە چەقۆ دەبڕی، کە دەمری بۆی دەگری (پیاز)ە

---

سلەمینەوە: ردع

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧١)

---

سەرپێچیکار: مخالف

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧١)

---

سرەوت: امان

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧١)

---

سەرا: مرکز حکومی

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧١)

---

سیگۆرتە: تأمین

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٢)

---

سەر ڕۆ: مجازف

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٢)

---

سەر ڕۆیی: مجازفە

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٢)

---

سندانی گەیشتیتێ: مردووە، نەماوە، یان کەڵکی بڕاوە

---

سەرێگان: سەری سەرەوەی دانیشتن

---

سپی کێل: هەر کێلدراوێك بارانی لێ درابێت سپی هەڵدەگەڕێ وخۆی وا پیشان دەدات

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٣٤)

---

سێبەرۆکە: سێبەر دروست کردن بەگونیە وقوماش وجاجم لەکاتی درونەی گەنم لەسەر خەرمان.

---

سەربڕانەی شوانکارە:

مەردار پەرێزی بەکار دەهێنا دەبوو مەڕێك بداتە سەپانەکان بۆ سەربڕانە.

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٣٥)

---

سەندەلورسی: جۆرە دارێکە تەزبیحی لێ دروست دەکرێ، لەناوچەی خۆشناوەتی زۆرە.

(فەرهەنگی گەنجینەی کەلەپوور-هۆشیار نووری لەك ل٣٦)

سەڵتەزەلام: زەلام بەتەنیا

سۆتکە: گیایەکە لەدەم ئاو ولماوی شین دەبێ بۆنی خۆشە

سنگ: مێخ

سوورفل: مرۆڤی موورزەردی ناحەز. سوورێی چاوشین

ساکەگۆڕ: مەیدان، جێگەیەکی تەختایی کە هیچی لێ نەبێ.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەبی: منداڵ، واتە هێشتا بالق نەبووبێ، لە وشەی (صبی)ی عەرەبییەوە هاتووە.ئەو سەبیە بەقەد چوار کەس کار دەکا.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەراسۆ: سەرانسوێ، هامشۆ

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەربردە: سەرگوزشتە

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەرەدیقانێ: سەرەتاتکێ، باوباوانێ

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەرە قوتکانێ: سەرەتاتکێ، ئاو بەناو سەر هەڵکیشانی لەماڵێ، لە شتێ، لە یەکێ.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەروعوزرشۆر: بە کچێ دەگوترێ کە سوڕی مانگانە ببینێ و بالق بووبێ.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سەگشیر: جوێنە، واتە شیری سەگی خواردبێ و بەدعەمەل بێ.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

سۆ: کەناری ئاسمان

لەنێوان ئاسمان وزەوی

سۆی هەناسەی

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل١٦٩)

سەنگی سەرکردە بەکارە، نەك بەزارە

(د.کەمال مەعروف)

---

سەنگەلا: تایەکی سووك وتایەکی قورس

---

سوور: بەواتای شادی، خۆشییەوە هاتووە نەك ڕەنگی سوور، حاجی قادری کۆیی فەرموویەتی:

تەماحی سووری نەبی کەس لەژێرچادری شین

چادری شین (ئاسمان)ە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٣٧)

سوور: ئەو بوقەی لە ڕۆژی قیامەت لیٚ دەدریٚ وچیاکان وەکو لۆکە پەرە دەکرێن:

ئاهی من سوورە چیا وەك لۆکە هەللاجی دەکا

عوقدەیی زولفی گرێی موویینە با ئایکاتەوە

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل١١٨)

---

سنووی هاتووەتەوە: سەگ کەتەمەنی دەبێتە ساڵێك دەڵێن (سنووی هاتووەتەوە)ئەگەر وشەکە لە (سن)ی عەرەبیشەوە هاتبیٚ دەوری هەریارە کە تەمەن لەپەراوێزی ساڵێکدا دەچەمێنیٚ.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٤٩)

---

سۆزناك: سۆزبەخش

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٦٠)

---

سپیان: بۆ مەڕ بەکاردێت

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٧٢)

---

سەیرکردنی دوێنیٚ بەدووربینی ئەمڕۆ هەموو حیسابان سەرەوبن دەکات

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٥)

---

سیاسەت پیشەیەکی گڵاوە، چی لەمنەوە بیرورا دەربارەی سیاسەت بیستراییٚ وخوێندرابێتەوە لەگۆشەی (فیکر)ەوە بووە

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٦٣)

---

سروشت وەك ئاوی جۆگەلە وایە هەموو ناوەڕۆكەكانی بەیەكەوە لەپەیدابوون وبزوتنەوە وتێپەڕبوون وبەسەرچووندان

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەكانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەكردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٠)

---

ساڵی ١٩٣٨ز میر محەمەد (پاشای كوێرەی ڕەواندن) خۆی ڕادەستی (عەلی پاشای) والی بەغدا دەكات، حاجی بەكراغای حەویزی پەیامێكی بۆ دەنێرێ دەڵێ خۆی ڕۆیی ئێمە ڕادەستی كێ دەكا میر محەمەد پاشا كوێرە زۆر تووڕەدەبێ ئەگەر بێمەوە نەمرم لەبۆ وی نامرم، حاجی بەكراغای حەویزی دەڵێ (بابڕوا دەوری كەروگایان نەما)

(مێژووی كۆیە-تایەر ئەحمەد حەویزی-بەرگی یەكەم-چاپی دووەم ل١٠٠)

---

سۆنە: مراوی

سۆنەیە تەڕنابی

---

ساموتە: كاتێ كەنێچیر دەكوژن بەپاشكۆوە دەكرێ

(هەندێ لە هەڵبەست وبەیتەكانی عەلی بەردەشانی-محەمەد تۆفیق ووردی ل١٢٠)

---

سەری تیژە، بنی كونە، گەرنازانی كەرە سوژنە.

---

سەرێكی ڕاستە وسەرێكی خوارە، خۆی ئاسنە وسەرەكەی دارە، گەرنازانی ئەوە مشارە

---

سێ پیتە بەژمارە، سەرێكی كەوانەیی وخوارە، دەبڕێ گیا وتەبارە، ئەوە ڕەمزی جوتیارە (داس)ە

---

سەری بەنە، بنی پەڕۆیە

(كەلاش)ە

---

سۆشیالیزم قەت بەلای چاكەی كوردا نەچووە وفسلێكی لێ خەرج نەكردووە، ستالینی مەهابادی فرۆشت بە ڕێكەوتن لەسەر نەوتی شیمالی ئێران لەگەڵ (قوام السلگنە)

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ئاكادەكردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ٢٤)

---

سالمی ساحێبقران لە پاش تێکچوونی ئیمارەتی بابان کەتە سەرشێوەن کردن بۆکارەساتەکە بەڵام نەیگەیاندە جفزی شیوەن بۆ کوردستان. کەرەوانەدزیش زەدەبوو بەر لەچەند ساڵێك هیچی تێدا نەگووت.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ئاکادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ٣٥)

---

سۆشیالیزم وکۆمیونیزم (نمو)فراژی بوونە نەك کەیف ومحێنرە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ئاکادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ٧٧)

---

سیاسەت وفکر بە مەفهوومی وشەی (پێکەڵپێك)دەبنە هاوتای دووسەنگی لەنگەر بەستووی تەرازوژیەك

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ئاکادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ٢٠١)

---

ساڵێك لە ساڵان دوو کەسی کۆیی، یەکیان زۆر خوێندووی مەیلەو تەقەڵ هەڵوەشاو، ئەوی دیکەیان خۆبەزل زان وبەتاڵ، یەك لەدوای یەك مردن!

هێمنی شاعیر گوتی: بەخودای دیارە کۆیی بەختی کەوتە توژتە وەگەڕان

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی مەسعوود محەمەد/ئاکادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل ٢٣٢)

---

سالووس: دووروو

---

سەرترینجانێ: شەترەنج

---

سەری بشکێ: دڵی نەشکێ

(د.کەمال مەعرووف)

---

سەری قیرتاوکردییە

واتا سەری ڕەش کردۆتەوە وبۆیاخی کردووە.

---

سەر بدە، نهێنی مەدە

---

سەری دا دەپۆشێ قوونی دەفرۆشێ.

---

سەری ڕەشەمە وکانوونێ، مێشکی پیسترە لە قوونێ.

---

سەی لە سەی بەردە، خۆت تەماشاکە.

---

سەیدی سەر سەوز کۆنە ڕافزی، عاسا هەڵدەگرێ دەچی بۆ دزی.

---

سڕ بێ، بڕبێ

---

سك تاوان دەکا وسەر تاوانبارە!

---

سێ شت نیشانەی نیفاقی عەبدە. درۆ، خیانەت، خیلافی وەعد.

---

سیاسەت باوك ودایکی نییە.

---

سینگ شێری پشت مل ماکەر.

---

سەری دنیای بە پووش گرتووە

---

سەر کەوتن بەختە، کەوتن سەختە .

---

سە کلك و گێی نەکەیت، باش پاست لۆ ناکات.

---

سێبەڕۆ: ئەو نەخۆشیە سێ ڕۆژ جارێك نەخۆشەکە تای دەگرێ جاران داب وابوو بۆ چارەسەری نەخۆشیەکە کەسە نەخۆشەکە دەچووە سەر سێ ڕێیانێك ودادەنیشت وسێ بەردی هەڵدەگرت وهەر بەردەی بۆ ڕێگایەك فڕێ دەدا ودەیگوت (وەی بابەڕۆ، لێم ناگەڕێ سێبەڕۆ)پێیان وابووە بەو کارە نەخۆشیەکەیان لەکۆڵ دەبێتەوە.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٣٨)

---

سۆجەڕ: تفەنگی سۆجەڕ جۆرێك بوو لەباشترین چەکی ئینگلیزی ویازدە فیشەکی دەخوارد.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چناراني-چاپی دووەم ل٧١)

---

سەیری شارە مێروو دەکەیت نەك شاری ئادەمیزاد، چونکە هەر خەریکی بەرهەم و هۆی بەرهەم و مەفاهیمی جەکوچ و داس و ئەوە کۆنە فکرانەن کە دەکاتەوە سیاسەتێکی ئاینیی غەیبیی رووت . دەبێ زانست و سیاسەت لێکتر جودا بن وەك کە تەئریخ و کیمیا جودان . زانست، بەتێکڕایی و زانستی سەر بە کۆمەڵایەتی بە تایبەتی .

---

سارتەر بە هەموو مەزنایەتیی خۆیەوە دەستی دایە فرۆشتنی ڕۆژنامەی پارتی شیووعی چینی. لەو دەمانەدا کە شۆڕشی سەقافی مرۆڤایەتی و مەردایەتی دەشێلا. کەس لەمن باوەڕهێناوتر نییە بەو ڕۆژەی شیووعییەت دەبێتە پرۆژەی ژیان و ژیار، بەلام نەک لە ڕێی شەڕی چینایەتییەوە بەڵکو لەو ڕێگایەوە کە سوێد و دانمارک تێیڕا دەڕۆن

---

سەرنجێکی مەیلەو بە پەلەش تێمان دەگەیەنێ بۆچی دینی عیسا لە ئەورووپا بلاو بۆوە، کەچی لە مەڵبەندی خۆی و نزیک لە خۆی ئەو برەوەی نەبوو .

---

سەنعەتکار دەوڵەمەند نابێ،ولەبرسیشانا نامرێ.

---

سواری کەریی بووە ولەکەرێی دەگەڕێ.

---

سەرت هەڵبڕە، شیرت دەربڕە.

---

سەگ بەوەڕین ماندوو نابێ.

---

سەگ گوێی ببڕێ وریا ئەبێ، کلکی ببڕی خێرا ئەبێ.

---

سەیرە ئەو دنیا پان وبەرینە، هەرکەس کاری خۆی لەلا شیرینە.

---

ساتێك بژیی و شێر بی، نەك سەد ساڵ لەژێر بی.

---

سامان تاسەر هاوڕێ نییە، بەلام هاوڕێی باش تاسەر سامانە.

---

سەد شەم ڕوون دەبێ بەیەك فتیلە، یەك سووکی بەسە بۆیەك قەبیلە.

---

سەری لە گێی قەبر. دەلەرزی.

---

سەریان کاسە، نازانن چ باسە.

---

سەفەر وسەودا دوو بەڵگەی چاکن تاقی کەروەی پاك وناپاکن.

---

سواری سوارکەی. لەبۆ نۆکەری.

---

ساڵێ جارێك، جوان دەبێتەوە.

(نەوڕۆز).

---

سایەقەی ساماڵ. هەوری فەڕەنگی، دوو ئاو لەیەك جام، هەر یەك لە ڕەنگی.

(هێلکە).

---

سەرقاپی قوونێ قاپی بروێشێ، هەر کەس نەیزانی چاوی بیەشێ.

(دوونگی مەڕ)

سەری بتاشی زمانی ببڕە، ئەم جار دێتە کار دونیای پێ بگرە.

(پێنووس).

سەماکەرێ سەما دەکا، دیاری حاکم پەیدا دەکا.

(هەنگ)

سپیە پەنیر نییە، کلکی هەیە ومشك نییە.

(توور).

سپیە وەك کەشك، قوتە وەك مشك، بەهاران تەڕە، پایزان وشك.

(شەیتانۆکە).

سوخمەی ئاڵ، تێدایە دوو پرتەقاڵ، دەستی بۆ یەکیان برد، هاواری کرد: دایە گیان، باوکی بۆم هات بە گۆچان.

(مەمك)

سمرکە: گیایە لووسکە.

(سە)لە بۆ وەڕین وپاسکردنە

(سە: سەگ)

سەسەی دەناسی

(سە: سەگ)

سەری بەلاس بێ

بابەختی خاس بێ

(لاس: تەپاڵە)

سەرەو ژێری کەیتەوە

هێندە سوێرە ناتەوێ (خێ-خوێ)

سەفەرداش: واتە چەند کەسێك لەسەربازی وپارتیزانی وزیندانی پێکەوە یەك خوان ویەك خواردن بێ هاوکاری یەکتر بکەن لە خواردن وشووشتن

سەرو ماری ئەوەندەیە

سەری بە فەرزی خودای دانەگرتیی.

سەری بچی، نوێژی ناچی.

---

سەری گۆتە زمانی. هەتا ئەتووم لە جیرانی، ئۆخەی ناکەم لە گیانی.

---

سوندی ئەوەی ناخۆم

---

سەوەشـەیر (جەرخەمـە): گـەورەترین سـەبەتە بـوو، بەشـی هـەرە زۆری ماڵـەکان هەیانبوو، لەجیاتی سەلاحەی ئێستا خواردەمەنی زیادە وسپیاتییان لەبنی دادەنا بۆ پاراستنی لە پیسبوون.

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل١٣٣)

---

سبیل: جاران سبیل لەدار ولە قوڕیش دروستدەکرا.

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل١٣٩)

---

ستراش: جۆرە چەقۆیەکی گەورە وتیژە.

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل١٦٥)

---

سۆرەقانگ: ئەو باڵندەیە تەیری ئاوییە ولەکەناری ئاوەکان وگۆمەکان دەژی، شێوەی وەك مراوییە.

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل٢٥١)

---

سمـت وکەفەڵ: قـوون ولاقـوون یـان پاشـەڵ. سمتیش زۆر نـاوی دیکـەی هـەن: وەك قوونخڕ، قوونپان، قوون پووچ، قوون گەورە، قوون ئەستوور.

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل٢٨٧)

---

سـەنگرانەوە: ڕاوەسـتانێکی بەمەبەسـت وهەسـتیار ولـەکاتی ڕۆشـتن، یـان لـەکاتی کارکردن وخوێندنەوە

(هەگبـەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمیـد ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاح سەعدی ل٣٠٥)

---

سندم: زنجیرێکی نیو مەتر درێژە. هەردوو سەری بە قورفەی بازنەییە.لەهەردوو پێی ئەسپ دەکرێ وکلیل دەدرێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٦٧)

---

سێپێك: واتا سێ شتی بەیەکەوە بەستراو لەسەر شێوەی سێگۆشە، خۆی سێ داری درێژە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٧)

---

سەردۆك: واتا خڵتوخاری کاتی ڕۆن گەرمکردن دەکەوێتە سەرەوەی ڕۆن، یان مەنجەڵەکە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٩)

---

سووڕسووڕ (گەدومە): ئەڵقەی قەڕاسەی وڵاغییە ودەکەوێتە ژێر چەنەگەی وڵاغ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨)

---

سەرمژانکە: دارێك بوو لەبستێك درێژتربوو، سەرێکی خڕ وئەستوور بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨)

---

سەرسەدە: واتا شوێن یان شوێنی دیاریکراو وگەیشتن بە شوێنی مەبەست.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٢)

---

سوارە: ئەو چەپکانەی لەکاتی دروێنەکردن دەێنە نێودەستی سەپانەوە، تا دەستی پڕدەبێت ودایدەنێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤١)

---

سەری کەرێ لەبەر بەرێ: ئەو ئیدیۆمە بەتەوسەوە بە سەپانی خراپ دەگوترا، یان دەیانگوت ئەوەندەی کەرێکی باشیش نالەوەڕێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤٤)

سیچکە: بەری داری مازییە، مەشکە ودۆدانی پێخۆش دەکرێ. (لەمازییانی زەرەرکردییە، بەتەمایە لە سیچکان تێبێنێتەوە).

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٥)

سوڕناتك (زوڕناتك): جۆرە پنچکێکی سوور بوو گوڵی زەردی وردیلەی دەگرت. ئەم گیایە بۆ ماڵات زۆر بەزیان بوو، زووش ئاگاری دەگرت.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨٦)

ساردەپاوان: ئەو بەشە پاوانەیە کە ماڵاتی تیادا لەوەڕایە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٦)

ساردەهەوێن: کابان بۆ مەشکە هەژاندن شیری زۆر نەدەکوڵاند وهەوێنی تێدەکرد ودەبووە ماست.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٦)

ساپڕ: بڕینەوەی مەڕ وبزن وداماڵینی خوری یا موومەکەی بە تەواوی

سابونۆکە: گیایەکە سەرەکەی کەف دەکات.

سابوونە: کراوەی چۆکی.

سادانی: جۆرە سماقێکی ڕەنگ مەیلەو زەردە، دەنکەکانی لە سماقی سۆر کەورەتر وبەنرختره.

ساری بەفر سۆری: ساڵی ١٨٨٠ بوو کە بەفرێکی ڕەنگ سۆر باری.

ساری کلۆ: ساڵی ١٩٤٢ لەم ساڵە کلۆ زۆربەی دەخل ودانی ناوچەکەی خوارد.

ساڵی بەفری گچکە: لە ساڵی ١٩٢٠ لە پایزێ بەفرێك لەم دەشتە باری، بۆ ماوەی (١٥)ڕۆژ

سامتیم: جۆرە داوێك یا بەنێکی بە بریقەیە، زیاتر لە نەخشی جل وبەرگ بەکاردێت، بۆ سەڵتەی ژنان بەکاردەهات.

سام گرتی: واقی وڕما، سەرسام بوو. تاسا

سەرەناز: جۆرە مافورێکە

سەردەینی ودەبا: زۆر بیر دەکاتەوە، چەند بیر دەکاتەوە.

سەرشین: سەر بەهەش، ژنی بێبەخت.

سەقار: گاسن کە سۆر دەکرێتەوە، دواتر دەخرێتە ناو ئاوەوە.

سەگەبەڕەڵا: سەگێکە بەهۆی کەم تەرخەمی لە پاسەوانی، خاوەن ماڵ تووڕە دەکا وبەرەڵای دەکات.

سەگ تۆپ: مردن وەك سەگ.

سێوەرۆك: ڕوەکێکە لە دەشت دەروێت.

سەگسار: جوێنێکە واتە شێوە ودەم وچاوی وەك سەگ وایە.

سورکردنی خەرمان: پاککردنەوەی خەرمان دوای کوتین

سورمۆکە: ئەو رەزەی کە خزمەت نەکرێت ترێیەکەی سۆرو ورد دەبێت.

سۆدرە: تەنگ وچەڵەمە، کێشە وگیروگرفت

سێرۆك: تاوەیەکی کلك درێژە تایبەتە بە قاوە سۆرکردنەوە

سێتا: بەنی ئەستور وکشتەکە، چەند داوێکە

سفرە مەدرێنە، ناهەقی مەقرێنە

سفرەی خەلیلە، سوپاس لۆ جەلیلە

سمۆرە، لە ئاوی پایز ناخواتەوە

سواری کیسەڵ، لە پیادە باشترە

سواری کەری شەیتان بووە

سواری گای هار بووە.

سواڵی داروو پردوو+ دەیکاتە سەدەقەی مردوو.

سووریٚ لەخوا دوریٚ+ قورئان دەفرۆشیٚ بە تووریٚ.

سڕ بدۆڕێنی    سەر دەدۆڕێنی.

سۆرە + یەکێکیش زۆرە.

سۆز + لەیاسادا نیە.

سۆزیٚ+ بەسە لۆ هۆزیٚ.

سۆق حەرام خۆر وەکو کەرەباب وایە، هەموو شتێك دەخوات وبانگیش دەدا

سەبرت بیٚ لەکار - دەگەیتە هەوار.

سەد ئەستێرە جێی مانگ ناگرن.

سوارکەریش سوارکەری هەیە.

سوارکەر: سوالکەر

سواری بەدەمار  بەفوویەك دەکەوتە خوار.

سەد پیاو بەبیٚ ژن، لە یەك ناهەژن.

سەد فاتیحا لۆ مردی+ نابیٚ بە نانیٚ لۆ زیندی.

سەر بڕین خەتای چەقۆ نیە.

سەرت هەڵبڕە+دەنگت دەربڕە.

سەرخۆش و مەستە+ بیٚ حەیاو پەستە.

سەرکردە، سێویٚ ببا + ژێردەستە کێویٚ، دەبا.

سەرکردەی یان دابە میر باشی+ لە پێشاسەری دایکی خۆی تاشی)).

سەرکوڵی لۆتۆ بنکوڵی لۆخۆم +بەشیشم نەدەی لەگەڵتا دەخۆم)).

ساخی و ژیری و دارایی + سیٚ نیعمەتی خودایی

سامان بجۆشی    عەیب دادەپۆشیٚ

سامان بوو پوولەکە + مێرد دەبێتە جوولەکە

سامان و ماڵ - لۆ بەهەشت بکە بە باڵ

سامانی کەمە    دڵی بێخەمە

سالْ، سالی مەیموونە، ئەمە هەوەڵیە ئاخیری چۆنە؟

سالێ بخۆ نان وتەرە+ سەد سالْ بخۆ نان و کەرە

سالی جارێك بزن و مەڕ دەبڕنەوە+ فەقیر و هەژار سەد جار دەبڕنەوە .

سالێ لافاوە + سالێ ڕسقی لێشاوە.

سایەی سەران + لەمێزەران.

سوپاس، کرێی خێرۆمەندە.

ستەم بکرێ لە بێتاوان+ ویژدان دەنالێ لە تاوان.

ستەمگەر زالە؟+دز خاوەن مالە.

سرکەی خۆرای شیرینە

سروشت. وەکو کەیبانوو لێزانە.

سەرکەوتن بە باوەڕە.

سەرگوری لۆ من.بنکرێ لۆ تۆ.

سەرگور: سەرگوڵ

سەرم پێوە نیە (حەزی لێدەکەم).

سەرۆکێ لۆ گەل+شوانە لۆ مێگەل.

سەری بوو بە ئاش+بەری بوو بە ماش.

سەری بێ ئاوەز.تۆپی فوتبۆلە.

سەری بێ ئەوین.کولەکەی چێشتە.

سەری بێ سەودا تۆپی یارییە.

سەری بێ کلاو زۆرە.

سەری زمانت بپرە+دوری لە قرەو مرە.

سەری قاقۆنە، لاشەی ئالتوونە.

سەری کرد بە پەتەووە

سەفەر مامۆستایە.

سه به تەماشا فێری قەسابی نابێ.

سه به شووشتنی گڵاوی دەرناچێ.

سه دەوەڕێ، ماڵات دەلەوەڕێ.

سه لەسەر نان ناوەڕێت.

سه لەماڵیا دەمی چەور نابێ.

سه ناچێتە دووکانی ئاسنگەر.

سه وەڕی + بووك دەرپەڕی.

سه هەیە مانای چخە نازانێ.

سه، لۆ جگەر عەودالە+پێی نادەن دەڵێ تاڵە.

سه تا ددانی بێ قەپ دەگرێ.

سەی بەسفەت لەدەرە+پشیلەی سپڵە لەسەرە.

سەی دڕی هاوشاری+دەگرن لادێی و لەشاری.

سەی دەرکراو. کلك و گوێ شۆڕە.

سەهۆڵ لۆ گەرما - ئاگر لۆ سەرما.

سیر بە پیاز دەڵێ. بۆنت دێ.

سێ ژن لە لۆ دەنگە دەنگ+لەشکرە یا کوورە هنەگ.

سێبەری گوز، ئازارە+سێبەری (بی)لەبارە.

سێو، لۆ برسیەتی بەهێ، لۆ تێری.

سەری گەورە بە عەلامەت نییە.

سەری لێ ئەستوور بووە.

سەری لێ شێوایە

سەری لێ دەرناکەم

سەرتان لێ شێواندم خوا سەرتان لێ بشێوێنێ.

سەرخۆش، پاریشی پێوە نەنێت، لۆ خۆی دەکەوێ.

سەرکردە شێران بزن بێت، شێر دەبنە بزن.

سەیەکی دی قوونی ئەوی دەلستەوە.

سەی بێ سفەت باشترە پشیلەی بەسفەت

سەگ بە هێسکی گۆت: لۆ درەنگ هاتی؟ گۆتی: بەدەم سەگێکی دیکەوە بووم لەتۆ سەگتر.

سە بە بەلاش ناوەڕێ.

سە وەڕی وکاروان تێپەڕی.

سە کۆڵە وشوان ڕۆڵە.

سە کە نەوەڕێ، لۆ کوشتن باشە.

سەی دەورەمەند پاس کەرە. سەی فەقیر دزهێنەرە.

سەی زیندی چاکترە لە شێری مردی.

سە، بیکوژە، مەیترسێنە.

سەگەکەم لە تۆ پیاوترە.

سەگەکەم وەك تۆ بێ گوێی دەبرم.

سەگەکەی لە خۆی پیاوترە

سێ کەس نەزانن لە دونێ: دەچێتە سەر ماری بابی ژنێ، لە هەورازێ دەکێشێ تووتنێ، دەچێتە ڕێگای بەتەنێ.

سێبەری بەردی، بەقای مێردی.

سە لە سەر بەردە، خۆت تەماشا کە.

سەلامی کورد بێ تەماع نییە

سووری دیوە، سەپانی لەبیر چۆتەوە.

سووژنێك لۆ کەری ڕاوەستاو زۆرە.

سەی ڕەش چوو، سەی سپی لەجێی.
(سە: سەگ)

سەی لێ گراو دەبێ.

سەتم بمرێ زاوا، کارم نابێ ساوا.

سەتی کردووە بە قوونەوە، تازە گوارەی خواستوونەوە.

سەد بەرتیل، قەرزێك نابژێرێ.

سابوونێکی لە بنی پێی دا، تەوقی سەری لە عەرزی دا.

سار سییە، سیوەیل برسییە.

سەد جار بکڕ، یەك بار بڕ.

سەد جار پیرە، هەر کۆنە تەگبیرە.

سەد چەکوش ویەك سندان.

سەد قەل وبەردێك.

سەد ڕۆژ چەك، یەك ڕۆژ گەرەك.

سەد کاوڕە مێ دێنێ

سەد گورە جۆ، بە قوربانی یەك گورە گەنم بێ.

سەد هاوار بە پوولێك.

سەر لۆ سەربڕین مار لۆ جەریمە، ئەگەر تۆش نەبی خودا کەریمە.

سەرچۆپی بدەی بە گامێشێ، لۆ کن کادانێ دەیکێشێ.

سەر بە فەڕزی خوادا نادات.

ساحێبی حەفت مردیە پێی پێدەکەنێ.

سەیری لەکنە.

سامانی دنیا یا لۆ غەرەزە، یا لۆ مەڕەزە.

سەر زیندی، پاشەر مردی.

سەری گا بە قوونی کەرەوە کەی، کەس ناپرسێ.

سەرما بەقەد بەرگە.

سەرم لە ئاشی سپی نەکردیە.

سەرم لە ڕێتدایە.

سەرم پردەبازی ڕێتە.

سەری بکەی، بەزێڕ، قوونی هەر مەفرەقە.

سەری زمانی خۆی سووتاندیە.

سەری کردیە کۆمە، لە خۆی گرتیە لۆمە.

سەری حیزیی داخستیە.

سەری گوریسێکی پێ ڕاست نابێتەوە.

سەری بەنێکی پێ دوو لا ناکرێ.

سەرکردەیان دا بە ئونباشی، لە پێشدا سەری دایکی خۆی تاشی.

سەری گەورەمان بە تۆوە نایە.

سەری زمانی خۆی گەزت.

سەری بووە بە ئاش، قوونی بووە بە تەراش.

سەرێکە هیناومە ونایبەمەوە.

سەری چاك کردەوە.

سەگ نابێ تاژی، تاژیش نابێ بە توولە.

سەگی نووستووی بەخەبەر هێنا

سەیرە، قالۆچەش تەیرە!.

سەر گۆتی بە زمانی، هەتا ئەتۆم جیرانی، خۆشی نابینم لە گیانی.

سۆزان ئەو سۆزان هەردووك لا سۆزان، نەك یەکێ سۆزان، یەکێك پێ نەزان.

سارد وگەرمی ڕۆژگاری زۆر چێشتووە.

سەری کردووە کۆمە، لەخۆی گرتووە لۆمە.

سەگ کلکی لێدا، دەکەوی.

سەرتاشین، بێ تیف تیفە نابێ

سەری هەموو کێوانی لێ هاتەوە یەك.

سنگی دەرێ چیای هەورێیە.

(دەرێ‌ی: دەڵێ‌ی)

سێو لە کن کچان بە قیمەتە.

سندان کوشتییەکە

سندم کرایە.

سەی گرووو خۆی لێ لادەدا.

سبەینان نووستی، هێواران بەخۆرستی.

سبەینانی نیسانێ، ساردترە لە زستانێ.

سەگەکە دەستی ئاغای بۆنکردو چوو دەرپێی کارەکەرەکەی هینا.

سەگ تۆپ بوو.

سەگ وەفادارە بەخێو ناوەڕێ، دووپشکە زگی داکی خۆی دەدڕێ.

(زگ: سك، داك: دایك)

سەری سەی بەدیاری هینایە.

سەری گای دەکاتە قوونی کەرێ.

سەری لۆ ئەو حارەی دەخورێ.

(حار: ماڵ)

سەرشۆڕکردن جارەکە ئیدی لێی ڕادێی.

سەرگەورەمان مام وسوە، ئەویش قوونی بەگوە.

سەرم هەربڕی وهاتمە دونیاوە، تووشی گێژە ولێژە بوو ونەبڕاوە.

سەرمایەت لۆ خۆت وزەکات لۆ خودا، میوە، کەبیبڕی چاکتر بەر دەدا.

سەرمای زستان لە ئەوەڵەوە دیارە.

سەر لەبن بەڕێ، قوون دەکا شەو لەوەڕێ.

سەرە داوەکەی بزر کردییە.

سەر بەقوربانی زگ.

سایەق (شۆفێر) پێیەکی لە قەبرستانییە وپێیەکی لە زیندانییە.

سە دەمی بگاتە برینێ خۆ نامرێ.

سە، بە، لە قەومێ خۆبە.

ساحێبی حەفت مردیان بی پێدەکەنی.

ساحێب مەڕان، دەچوونە کن ساحێب کەران، لۆ قیچەك ڕوونی سەران.

سۆفی قوون تەڕ، مەلای زۆر وەڕ.

سەد دۆست کەمە، دژمنێك زۆرە.

سەد دۆست ویەك دوژمن.

سەد داری لێ دەی تۆزی لێ هەرناسێ.

سەگ بفسێ، دەرێ بدە بەشم.

سەگ دڵی خۆشە بەداری گورەوە بەسترایتە.

سار سییە، کەچەر برسییە.

ســــــــــــەر ببــــــــــــێ، کـــــــــــــــــــراو زۆرە.

(کراو: کڵاو)

سەری کەچەر، با لەبن کلاوی بێت.

ســــــــــە بیـــــــــــت ســـــــــــرا گچـــــــــــکە نـــــــــــەبیت.

(سە: سەگ)

سواری سوارکەرێ، لەبۆ نۆکەرێ.

سامانی دانا بە عەشق وهوەسر

نـــــــە لـــــــــۆ خـــــــۆی خـــــــواردی، نەداشـــــــــی بەکـــــــــەس.

(لۆ: بۆ)

سەد سار چەك، ڕۆژێ گەرەك.

سەری هەموو کێوانی لێ تاریك بوو.

سەری قسە وبنی قسە.

سەد بەردی بە قەپرغەی ئەویدا دایە.

سێ ودووی لەگەر مەکە.

(لەگەر: لەگەڵ)

سەد بەردی بە قەبرغەی ئەو، دادایە.

سار بەمێش، قەلبی بە ئێش

سە بە پارچە نانەکی لە کۆرت بێتەوە

سەت دەرکەو سەلام و عەلێك

سەخی نانەکی دەخورێ، ڕەزیل دوو

سەرت بچیقسەت ناچی

سەر دیوار و بن دیوار، ئەو سار چۆنی لەگەر پار؟

سەری لە بەردی ئەلحەدی دا

سەلام لە گزگلان، لەبەرت دەکەن ڕێزەکی قشپلان، حەیران چەند خۆشە نووستن بە کەچە جلان

سە گۆشتی سەی ناخوا

سە لە سەی پەیدا دەبی

سەو زەنگوریان نەکۆتیە

سە هەر چەندە قەرەو بی، گۆشتی ناخورێ

سەیەك بەسحێبی خۆی بوەرێ، بۆ خۆری کردن باشە

سەی خۆری، مار خۆی ناسییەوە

سبەینەی سالحان، دوعای پیرێژنان

سووژنی لێ دەی خێنی لێ نایێ

سیبەری مێردی، کەرەکی بەردی

سەری چاوە بنی پەرۆ،ئەگەر نازانێ لێرە برۆ: (کەلاش)

سەری تەسك، بنی بلاوە،گەر نەتزانی بلێ: کلاو

سەری کەپوو: بەشی هەرە پێشەوەی لووتە و وەك نووکە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨٣)

سەگ هەیە حەپەحەپی لەقەپی بێزارکەر ترە

سەیری تۆرییە

سوند: سوێند

سێ کەس نەزانن: بچیتە سەر ماری بابی ژنێ، لەهەرازێ بکێشی تووتنێ،

بچیتە ڕێگای بەتەنێ.

(مار: ماڵ)

سەد جار بکڕ، یەك جار بڕ.

سەرێکی قەلێ، دەندووکی بە گووە.

سوارکەر، سەری بە پاشایەتی بگات، هەر سوارکەرە.

(سوارکەر: سواڵکەر)

سەپانی کردم بەپاردەرم،

خەمی چار و کەندوو کەوتە بەرم.

(پاردەر: پاڵدەر، چار: چاڵ)

ساوارە، کابان هارە.

# ش

شەقڵی وپەقڵی: ڕێك و پێك، خەتی ناخۆش بێ، شەڕەپشیلە، بێ سەروبەر لە کۆیە دیانەکان کە قسە بە زمانی خۆیان (سریانی)دەکەن پێیان دەڵێن ئەوە شەقڵی وپەقڵی چیتانە، نەخوێندەوار

---

شەمولەی شەوی: ئاوی بێ داری دەوێ ئاوی بن دارانی دەوێ

---

شەحتۆ: یەکێك کەم ژیربێ

---

شرینقە: دەرزی سرنج

---

شێلمان: جۆرە سەوونێکی ئاسنە، بەمانای (درۆ)ش دێت، بەدرۆزن دەڵێن شێلمانی دەبڕی، واتا درۆی گەورە دەکاتن.

---

شووراق: مەترەق دار، تێلا

(ڕۆستەم حەویزی ل ٢٥٦)

بەعسی دوژمنە دەگ جاش ئەتۆ چی

لەولاوە بۆم دێی وەك کەر دەقەوچی

بە خۆت دەگەینم شوراق و قامچی

بۆ کوێ ڕادەکەی ئەمرۆ بەسەرچی

---

شەم شەمووله: هەوڵ-بۆشتی ناشرین بەکاردێت وەك: شەم شەمولەی وا چییە

جودا دەبێتەوە لەدی مردی و زندوو بە جوولە

لەسەر کارێکی بزێ مەبە نۆکەر وتوولە

دەستی زۆرداری دەلکن بێتەدەر لە قوڵ قوڵە

بروایی ببتە عاقڵ دەنوشتە و شەم شەمووله

(ڕۆستەم حەویزی)

دەچمە سەری سەر دانی شەمولەی دەگرمەوە

بەختی خۆم وچاو حوانی پێ تاقی دەکەمەوە شەمووله: بەختی شەو دەگرێتەوە

---

کەری لا بارانە

کوڕ ئازابی،چاوی بابی دەربینی

کورد گۆشتی قەلە

کەربی و بەربی و جۆ لەبەربی

کەتە کاروانی کرد

کەس لە کەس رازی نییە،خواشی لە عالەم

کابرای کردە ماست و لەبەر سەی رووی کرد

کتکی کۆر نمەکی ناکت

کەر هەتا مساعدەی بکەی،لاریّ دەڕوا

کەچەڵ لەچی حاڵی،لەچی فاڵی؟

کەشکمان لیّ فەریك بوو

کرمانجەتی بی حاجەتی

کۆیە بەبای،بەغدا بە ئاویّ،بصرا بەئاگری خراپ دەبی

کوڕی ئەو پیاوەی نەمری،ئەوکچەش چارەی خۆی دەکا

کە ئاو بڕژی،روناکیە

کونی ماری دەکوڵتەوە

کورو کچی عەنبەری،لەبەر چووتە دەری

کێشکە خۆی چییە و چەلاوی چییە

کەدەروا بەسەر نۆ قشپلان باز دەدا

کەلەبانی چەرخەیە نابەزی

کەنگری بە یاری بو ژنی عەیاری

کەچە شیری پشت کەندوویّ

کەرەکت بوو، غەمەکت بوو

کەری شەل، سەرباری نابی

**کەری کێ لەگارانی نەهاتیتەوە؟!**

---

**کەری مەلای لەناو کەران بە هێستر حیسابە**

---

**کەمتیار بێتە گوندی، سە دەوەڕی**

---

**کەمتیار گوجیلەی سەی دەخوا، گۆشتیشی دەخورێ**

---

**کەنگری وەردێ، لۆگەردەن زەردێ**

---

**کچم بە زستانێ منداری ببێ، بووکم بە هاوینێ**

---

**کراوی عەلۆی لە سەری جەلۆی، کراوی جەلۆی لەسەر عەلۆی دەنێ**

---

**کلکیان کردیتە یەك**

---

**کلکی تێدا دەگێڕی**

---

**کوڕ لە مەیدانێ سەرکەوتن دێنی، کیژ لە ماڕێ سێو دەنەخشێنێ، نامەرد بەینیان دەپسێنی**

---

**کوڕ مرکە، کیژ ئاومارك**

---

**کوڕم بە مرە مرم، قیژەی کیژان دەبڕم**

---

**کۆتە، هەر لۆ خۆتە**

---

**کۆترە باریکە بن باری شینە، ماچی کیژۆران دەرێی هەنگینە**

---

**کۆڕپەی بێ باوك، گوری بێ ناوك**

---

**کیری نەبوو لەگونی دەپێچاوە**

---

**کیژی جوان بەرای سەرە. زمان شیرن قور بەسەرە**

---

**کێ کەر بێ؟ئەو کورتانە**

---

**کێ کردی بە پێوە؟کێ خواردی لەجێوە؟**

---

**(کەسێتی) هەڵوێست و کردار و رێبازی ژیانە..کار لەکۆمەل کردنە و کارلیکراوی یە لەلایـــەن کۆمەڵ..شـــێوەی دووان و جولانـــەوە لەرواڵەتەکانێتی..ســـەوداکران و هەڵوێست،دانەوەی رەفتارێتی..پیاوەتی و لێ بوردن بەخت کردن و پێچەوانەکانی لە زێوەوەکانێتی**

فوئاد تاهیر سادق

باسخوازی (باسی کۆمەلآیەتی،دەروونی،زمانەوانی و گشتی یە) (ساڵی ١٩٨٥)ل٣٩

---

کۆزەبی: کۆمەڵێ دار بەیەکەوە

---

کەنگێن ئیشەکەم لۆ دەکەی، هەنگێن لۆت دەکەم هەنگ بەدارەوە بی

---

خۆکەڵی سایە بەت نەبڕی یە

---

کەمو زۆر پەیوەندی بە تووە نییە.

---

کڤتی دری داکەوت.

---

کەبەر: جۆرە پنچکێکی دڕکاوییە و لە وەرزی هاوین شین دەبێ، بەرێکی وردیلە دەگرێ لە شێوەی شووتییە و دەخورێ. بە بەرەکەی دەگوترێ شەفەلە، ئەو کەبەرە بۆ هەراشی سەری خانووی جارانیش بەکاردەهات.

---

کڕ: واتا کات، یان کاتی هاتووە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣١)

---

کەپرەشینە: ڕشێنەبارانی پێش بارینی پەڵەیە. کەپرە شینە جۆرە جەژنێکی جوولەکەیە، بۆ کوردەواری نیشانەی پایز وسەری پەڵە کەوتن بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٢)

---

کوورك: جۆرێکە لە نەخۆشیی دەغڵ وگوڵێك، یان دانەکەی دەبێتە ڕەژوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٧)

---

کۆگا: کۆمەڵێك قرشە بوو لەسەر یەکتر دادەندرا ولەگیشە گەورەتر بوو وکوندەی ئاو ودۆدان ونانیان لەبن دادەنا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤٠)

---

کڕوفڕ: شەناباکردنی کاتی هەڵکردنی بای وڕە، یان وڕەبایە، ئەمجۆرە شەنەباکردنە لەناچارییە بۆیە پێدەڵێن کڕوفڕ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٥٤)

---

کەپوولە: پێوەرێك بوو کە کاتی خۆی ئاشەوانەکان باراشیان پێ دەپێوا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٦٣)

---

کۆتکۆکە: جۆرە کوتکێکی بچووك بوو وشیکەرەکان دەسکە دەغڵیان پێدەکوتا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٢)

---

کندر: پەتێکی درێژ بوو لە پەلە دەولك دەبەسترا و درێژاییەکەی لە قووڵایی بیرەکە زیاتر بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨١)

---

کەر ودۆراب: لەکاتی پێویستدا کندرەکەیان لەتەنگەی کەرێك یان هێسترێك دەبەست وئاویان بە ولاغەکە هەڵدەکێشا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨١)

---

کووزر: پاشماوەی گوڵە کوتراوەکانی گەنم بوو بۆ ساوار کوڵاندن وشیولێنان بەکاردەهات وئاگر خۆشکەربوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨٦)

---

کوتە: واتە کەمێك، یان هەندێك. لەنێو کوردەواریدا ولە گوندەکاندا ئەگەر کەسێك ٤٠-٥٠ سەر مەڕی هەبووایە، دەیانگوت کوتەمەڕێکی هەیە. کوتەمەڕ چواریەکی مێگەلی تەواوبوو، لەلای کەرکووك بە بەش دەڵێن کوت. دەڵێن داهاتەکەمان دەکەینە دوو کوت، یان چوار کوت.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٠)

---

کەسمە: نەخۆشییەکی ولاغی یەکسمە و ولاغ بەهۆیەوە لووتی دەگیرێت وهەناسەی بۆ نادرێ.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٨)

---

کاپێچ: ئەو ڕەشەولاغەی زۆری کا دەخوارد ولەبەری دەکەوت دەیانگوت کاپێچ بووە.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٩)

---

کاڕێژ: بە ددانی دواوەی ولساتی دەڵێن کاڕێژ.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٢)

---

کەژی: وەك گوریس وەهایە، ژنان بەپانی دەیان هۆندەوە ولەخوریی موو دەکرا و بۆ بار وبارکردن بەکاردەهات.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٧)

---

کەرکیت: شەیەکی ئاسن بوو دانەکانی گەورە بوون.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٩)

---

کەرەف: جۆرە دەزوویەکی لێفەدوورینە، قەبارەکی لوولدراوە وپێیان دەگوت کەرەفە دەزی.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٢٠)

---

کەدینە: جۆرە گۆزەیەك بوو لە شێوەی گوڵدان بوو.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٢٨)

---

کۆز: فلانە کەس بەدەستی خۆی گورگی بەردایتە نێو کۆزی خۆی.

کاکی بەکاکی: دەشتی فراوان

---

کاووکۆت: ئەو کایە وردەی لەبن پێیان ڕژایە

---





کەپرەشینە: جەژنێکی جولەکەکان بووە، لە سەرەتا پایز ساز دەکرا، کەپرێکیان دروست دەکرد، جۆرەها میوەیان پێ هەڵدەواسی، موسڵمانیش بیخواردبا ئاسایی بوو، بۆ سەری ساڵی جولەکان بەکارهاتووە.

---

کەسمان لەکەس: کەس قەدری کەس نییە.

---

کەلکی بڕی: بێخێری کرد

---

کەندۆ: چێڵێکە گۆلکی مردبێ وشیریش بدات.

---

کەورۆژ: ڕۆژ بەتەواوی لەدەرەوە نەبێت بەهۆی تەم یا هەور

---

کارتیغ: چەقۆ، بۆ تیژکردنەوەی ئامێری بڕەر بەکاردەهات.

---

کنێ: کچی بەژن کورت

---

کوتك وسنگی: بەخورتی. بەزۆری

---

کورژە: خۆ وێك هینانەوە لەسەرمان

---

کورسی: دلۆڤینگ

---

کورکن: زۆر بەموو، مراوی

---

کۆزوشەش: یەکێك باشی بۆ بێت لە کارێك یا باش قازانجی لێ بکات، دەڵێ کۆزوشەشە. ئەمەش لە یاریەکی دیانەکانی هەرمۆتە هاتووە، بەناوی یاری دوازدە سوار، کە بریتییە لە دوو تیپ (١٢به١٢)، لەسەر تەختەیەك بە دوو داری گەورەتر لە تاکەکان دەیانجوڵێنێ، ئەگەر ئەم دارە گەورانە کەوتنە سەر پشت ئەوا دەبێتە کۆز.

---

کلێنجە: ئێسکەکانی سەر سمتە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨٦)

---

کاسەجیرانە: پێشان وئێستەش نەریتی کوردان وابوو ئێواران جیران ودراوسێیەکان شێویان بۆ یەکتر دەبرد وەو نەریتەیان دەگوت کاسە جیرانە، یان کاسە دراوسێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٩٨)

---

کونەکەپوو: هەردوو کونی لای چەپ وڕاستی کەپووە ومرۆڤ بەهۆیانەوە هەناسە وەردەگرێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨٣)

---

کەروێشکە: شەپۆل وجوولانەوەی دەغڵ ودانی پێش دروێنە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣٠٨)

---

(کەبابی)هاورد+نان و دۆی لابرد.

---

کا+ناکێشم و بن خەرمانیشم ناوێ.

---

کاتێ کەڵك و کار+دەمانکەن بە یار، کاتێ چیز و بز+دەمانکەن بە دز.

---

کاتێ دنیا کەوتە گەڕ گورگ هەر گورگە و مەڕ هەر مەڕ

---

کاتێ مردم+کفنێك بردم.

---

کارکردن دەوڵەتە+تەمەڵ ژینی سەخڵەتە.

---

کاروان کە گیرا بەدیل کاروان چی دەبێ زەلیل.

---

کاروانی کرد+ کەرو باریان کرد.

---

کاری مسینە و ماڵی فسینە.

---

کارێ بدەی بە تەمەڵ ڕیز دەکا پەند و مەتەڵ.

---

کارێ سووك نیە+هی بەر بووك نیە

---

کاسەی بێسەر، پووشی تێ دەکەوێ.

---

کاسەی پڕ، تێی ناکەن

---

کاسەی چینی زۆر+سفرەی بێ پێ خۆر.

---

کاولەی وڵات+زێرو داهات.

---

کتك کەتنی کرد، ئەرخۆنەی لابرد

---

کتکە بۆر بڕواو کوڵکی خودا دەمێنێ و مووڵکی.

---

کچ دەبێ قەڵا بێ، تا بێ بەڵا بێ.

کچ دەڵێ ڕەشم وەکو موو+دەوڵەمەندی بابم دەمدا بە شوو.

کچ لە ماڵ باوان+ کۆنەی کەلاوان

کچ، وەکوو شوتی وایە.کاڵ بێ ناخورێ، زۆر پێ بگات بێتامە.

کچە تێوە گەڵاڵان+کابانی گەورە ماڵان.

کرداری چاکە+ڕێبازی چاکە.

کردت ماڵداری+نەت کرد، بێکاری

کردم بە جۆڵاو مەکۆکەی دزیم.

کرمی زگی خۆت خوێنیت دەمژێ

کورد و کەو+خۆ خۆرن.

کوردێ لە هەندەران چاکترە لە برادەران.

کون کەیتە پاپۆڕ، نوقم دەبێ.

کوڕمان ببێ، لۆ کچان، کچمان ببێ لۆ کوڕان.

کوڕی سەگێکە، گورگ چاری ناکات

کوڕی کەس جێگەی کوڕی خۆت ناگرێتەوە.

کۆسە، بە ڕیشی بلبی شانازی دەکا

کۆنەیار + ئامادەو تەیار.

کۆڵت سەنگین بێ و ماڵت ڕەنگین بێت.

کۆڵنج بە شێلاندن نەرم نابێت.

کە دژمن بوو بە دۆست+چاوەڕوانین بۆ کۆست.

کەر، ئاخوڕی خۆی لێ تێکناچی

کەر جۆ ببینێ، ئیتر کاناخوات

کەر چووە میسر، نابێتە هێستر.

کەر، باریبێ+نەك غاری بێ.

کەر، لەکەر تێدەگا.

کەر، بەلەقەی کەر زوویر نابێ.

کەروێشك لە سەحراو ماسی لە بەحرا مەفرۆشە.

کەری بێ کلك و گوێیە

کەری تۆپیو، باری لی نانێن.

کەری تینوو، فیکەی ناوێ.

کەری چالاك و ڕگەی پاك.

کەرێ بتۆپێ، شای سەگەلە.

کەرێ تێری خوارد لە جۆ+جووتە دەهاوێ لۆ تۆ.

کەس لۆ دیدەنی ئاشەوان+ناچێ لۆ ئاشێ.

کەس، قوماری لێناباتەوە.

کەسێ زمانی نیە، نانیشی نیە.

کەسێ، بەدنکی خورما نە زانێ، بە کێوێکیش نازانێ.

کەسێکت بێ لە دیوان، خەمت نابێ بەمیوان.

کەم بژی و شێر بی+ نەك زۆر بژیو لە ژێر بی.

کەم بووو کەف بوو.

کەم بڵێ لە پیس و پاك، زۆر ببە لە بەشی چاك.

کەم خۆر بە+سووك و جۆربە.

کەمی من و کورومی تۆ

کەو بکە بە کەباب، سوێسکە لۆ سەدەقەی باب.

کەوای خامەك شۆڕەی دێ+زگ لە برسا قوڕەی دێ.

کەوتە شوێن دووکەڵ، کەوتە سەر مەنجەڵ.

کەوتە قوونە قون.

کەوتە ڕقە بەری+داینا سەری.

کەوشی بن چراو+ لە قوڕدا جێماو

---

کێ لەخزمی ناپرسێ دەبێ لە خۆی بترسێ.

---

کێ ئازایکرد؟+مەلا ناوی برد.

---

کێ ماڵی لۆ خۆی دەوێ شەوێ ڕەحەت ناخەوێ.

---

کێ بەمەیلی خۆی دەمرێ؟.

---

کێ ماڵی زۆرە خەمیشی زۆرە.

---

کێچ دەتان گەزێ و ئەسپێ دەتان کوژێ.

---

کورسی لەدارە، چارەسەریش هەر بەدارە

(د.کەمال مەعروف)

---

کابرا بەقوونی خۆی، گوو ناکات

---

کێ خزمەت بکا بە فەرخە گورگی

کاتێ گەورە بوو دەدڕێنێ ورگی

---

کۆزەبی: کۆمەڵێ دار بەیەکەوە

---

کەنگێ ئیشەکەم لۆ دەکەی، هەنگێ لۆت دەکەم هەنگ بەدارەوە بێ

---

کەپری لۆ بکەی لێی تێك بدەی پێی وەك یەکە.

---

کارەساتە گەر، نەزان سەر شاربێ

دز وڕێگریش، خاوەنی کاربێ

(محەمەد داریاس: هەندێ لە وتەکانم، ۲۰۱۹)

---

کای کۆنە وئاگری گرتییە.

---

کە دۆرای، با تاجی زێڕت لەسەربێ.

---

ژێری تاجی زێڕینە، لەسەری هەمووکەس نینە.

---

کێخوا ببینە ودێی تاران کە.

---

کەری شەریکی گورگ دەیخوات

---

کۆر بە کۆری خۆی حساب باش دەکا.

---

کوڕی حەمەقەدۆی موسرێیە.

کەلاکی کەر وددانی سەگ.

کەری خەرکی بە گوریسی خۆت مەبەستەوە.

کەس بە لاباران، ناگاتە هەواران.

کـــــــــوڕ نـــــــــــەبوو، کـــــــــــراوی لـــــــــــۆ دەدورن.

(کراو: کڵاو)

کۆڵ بوو بە کۆڵەوە، دەبێ شانی بۆ شل کەی.

کەندووم بشکێنێ گۆزەت پەرت دەکەم، داخی خاوەنماڵ بە تۆ دەردەکەم.

کەرەکەی نەکڕیە، کورتانی لۆ دەدرووی.

کەردار لەگەڵ کەرداری. کوڕدار لەگەڵ کوڕداری.

کت ومت لۆیەك باشن.

کاولەئاشی خۆت، خۆشترە لە قەسری خەرکی.

کون بە بەفر ناگیرێ.

کـــــچ وەك دار گـــــووز وایـــــە، هەمووکـــــەس پـــــلاری تـــــێ دەگـــــرێ.

(گووز: گوێز)

کزە لەجەرگی هەستا.

کسپە لە جەرگیەوە هات

کۆی مەزن، هەرزن وبزن

کچـــــی دری چـــــوو لـــــە شـــــوو، ناپرســـــێ هەنگوینـــــە یـــــا گـــــوو.

(در: دڵ)

کەر وگا لێك جیا ناکاتەوە

کەمەرم گورگ بیخوا، با گورگی نیشتمان بیخوا.

کەر وعەبا، حوشتر وحەمام

کەر قەرەویش بێ، گۆشتی ناخورێ.

کوێر چرای پێویست نییە.

کەو بەزمانی کەو دەزانێ.

کاوێژی بکردایە، گۆشتی دەخورا.

کەر بارەکەی نەدەبرد، ناوباریشیان دەخست.

کوێخایەتی توی پێ ناوێ

کار لۆ کرێکار، زەوی لۆ جووتیار.

کلکیان لەکلکی یەکتری ئاراندیە.

کراسی کەتان شۆڕەی دێ. زگ لەبرسان قوڕەی دێ.

کراوبردە، لەهەموو کەس ئاشتر ڕادەکات.

کێ بیخوا وکێ تەماشای کات؟

کار کاری خاتوونێ، ئازایەتی مەیموونێ.

کێشکەی سەر سواندان. قسان دەگێڕێتەوە.

کوێرەکانی نابێ بە ڕەز. ناکەس بەچە نابێ بەکەس.

کەر تامی کفتەی نازانێ.

کەروێشك چەندە بخەوێ دەبێ ئەوەندەش ڕاکات.

کەر بچێتە حەجێ، نابێ بە حاجی.

کە ئاو بردی چی تێدا دەمێنێتەوە.

کەس گونی لۆ لەخم نانێ.

کەوتیتە ناو زاروزمانان.

کاوێژی بکردایە، گۆشتی دەخورا.

کەر ئەگەر تێری خوارد. دەزەڕێ.

کانی مردە نابێ بە ئاو. ناکەس بەچە نابێ بە پیاو.

کەونە دەفتەران دەخوێنێتەوە،

کەونە کتێبان دەگرێتەوە.

(کەون: کۆن)

---

کوڕ ڕۆژی بەقەد دەنکە گەنمێك گەورە دەبێ،

کچ بەقەد دەنکە جۆیەك.

---

کراسێ سوورتر، کەرەکێ دوورتر.

---

کردی بە پەڕۆی بێ نوێژ.

---

کالە لە پێدەکا، جزمە لە (پێ) دەیخوا.

---

کالیاری بە قوونی شلە.

---

کانیەکی ئاوی لێ دەخۆیەوە میزی تێ مەکە.

---

کاولەڕەزان مەکە بە ڕەز،

ناکەس بەچان مەکە بە کەس.

---

کاوڕێ نەخواردم، بزنێ دۆڕاندم.

---

کارەکــــــەر هـــــەر ســــــێبەری مـــــاری پــــــێ دەبــــــڕێ.

(مار: ماڵ)

---

کارەکەرت بمری، تەگبیر کەرت نەمری.

---

کـــــاری حــــــەوارە بــــــە گــــــەوارە، کردنەکــــــەی دژوارە.

(حەوارە: حەواڵە، گەوارە: گەواڵە)

---

کاری خێر بە تەعجیل، کاری شەڕ بە تەحلیل.

---

کـــــار لـــــۆ کـــــەر، خــــواردن لـــــۆ یـــــا بـــــوو.

(لۆ: بۆ)

---

کاســـــە بــــــدە بــــــە کاســـــە، لـــــۆی هەرکێشـــــە هەناســـــە.

(لۆ: بۆ، هەرکێشە: هەڵکێشە)

---

کاسە بە هیوای دراوسێ ووشکە.

---

کێشکەیەکی ناو دەست، باشترە لە سەدی سەر درەخت.

---

کابان خەجە، ئیشی قنجە.

---

کابانی سەر بە ڕشکێ،
نە دۆت دەخۆم نە کەشکێ

---

کابرا ئەوەندەی نە گۆت، زمانیان بڕی.

---

کابرا ئەوەندەی نە گۆت شار بەدەریان کرد.

---

کابرا بێکار بوو، سووژنی دەکرد بە گوونی خۆیدا.

---

کابرا گووتەنی.

---

کابرا ڕێی ناو گوندیان نەدەدا،
لـــــــە مـــــــــاری کێخـــــــــــوای دەپرســـــــــی!
(مار: ماڵ، کێخواکوێخا، لۆ: بۆ)

---

کلکی کەرێ، نە کورت دەبی، نە درێژ.

---

کەچەر بەی پشت کەندووی، ڕۆژێك هەر بەکار دێت.

---

کلکی بە پەڕۆیەکی پیس بگرە و فڕێی دە.

---

کەس سفرەی لەسەر ڕێگا ڕانەخستییە.

---

کافرستانییە.

---

کورتە باڵا بە قەیسەری دا بڕوا خۆی نەوی دەکات

---

کە دۆستت بوو، دەستیشت دەبی.

---

کوولەکەی ڕۆح

---

کەباب خواردن نیە، کەر داغ کردنە.

---

کون بە کون، بە دوویدا دەگەڕێ.

---

کووی تێ دەگەی؟ وای تێ دەگەم گووی تێ دەکەم.

---

کـــەری چەرچـــییانە، ســـەی هـــیچ گونـــدەکی پـــێ نـــاوەڕی.
(سە: سەگ)

---

کەری چی و باری چی

---

کەری خۆت لەگەر ئەسپی خەڵکی تاو مەدە.

(لەگەر: لەگەڵ)

---

کەری کێ تۆپییە؟

---

کەری پێ دەگێ و شادەشی پێ دەینی.

---

کەرێکم دا بە کەرێ، سندان لە بنا گێی دەرێ.

(گێ: گوێ)

---

کەرێکە، بە دوو پێ دەڕوا.

---

کەس بۆن گووی خۆی پێ پیس نیە.

---

کە شێرت وەشاند، دەبێ قەڵغانت پێبێ.

---

کەس بە تەماشا، نابێتە پاشا.

کەس بە خۆڕایی فاتیحە لۆ باوکی کەس ناخوونی.

(ناخوونی: ناخوێنێ)

---

کەس بێ سەلا، نابێتە مەلا.

---

کەس بە دۆی دەرکان تێر ناخوات.

(دەرکە: دەرگا)

---

کێ دەیکا؟ کێ دەیبا؟ کێ دەیخوا؟

---

کێ ڕەمەزانی گرت؟ کێ کردی بە جەژن؟

---

کێ کەری بردیتە سەر بانی، هەر ئەو دەیهێنێتە خوارێ.

---

کەندووم بشکێنی پەمۆت پەرت دەکەم.

---

کەنگر دانەی بەڕەحمەت،

نەك برنج دانەی بە زەحمەت.

---

کەوگیر بە دەستە.

---

کەم چێکەڵدانەیە.

---

کەفارەتی گوناحان بێ.

داندۆکە، کابان کۆکە.

کەر تری، ماریفەتی نواند.

کەر و گا لێک ناکاتەوە.

کـــوڕی ئـــازا مـــاری لـــۆ چـــییە؟کوڕی حیـــزیش مـــاری نـــاوێ.
(ماری: ماڵی)

کە ژن بینی دەبی دەرکی کیسە پارەت پەکەوەر، ببەستی.

کەڵبەی گورگ نەشکێنی بەدار. دەست هەڵناگرێ لە مەڕی هەژار.

کاری شەوێ، شتێکی پێ دەوێ

کـــــەس بــــــە خــــــەیار، نابــــــێ بــــــە مـــــار.
(خەیار: خەیاڵ، مار: ماڵ)

کەرم وابە بارەوە، دۆینەم وا بە دارەوە، زوو کە مەلا کوڕم فێری خوێندن کە.

کردەی گایە وبردەی کەر.

کەس لە کەس.

کوولەکەی ڕۆحیەتی.

کردوکۆش: هەول، هیمەتکردن
بەراستی منیش بە شانازییەوە کەوتمە کردوکۆش وکۆکردنەوەی هەرشتێك پەیوەندی بە شاعیرەوە هەبێت.
(عەبدول خالق عەلائەدین لە پێشەکی کتێبی دڵدار بیرمەند شاعیری شۆڕشگێری کورد ل١٠)

کوڕ بە مەلەی باب ناپەڕێتەوە.

کەس بوو بە ناکەس، ناکەس بوو بە کەس، قەدیم وەجاخان دەرچوون ڕەنج عەبەس.

کون بە کون لێی دەگەڕێ.

کەسێ بەزۆر بیگێن، وسڵی ناوێ.

کەر لە چاوی ئەو فەیلەسووفە.

کورت وموختەسەر.

کەم دەستی خۆشە. کێشەکانی ناخۆشە.

کارەکی کۆیانی: ئەو جۆرە کارەکە بن ودەروەکانی لە قایشی ئەستوور بوو، سەرەکەی بە بەنی رەنگاوڕەنگ نەخشابوو، زۆر بەرگەی دەگرت، ئەو جۆرە پێڵاوە بۆ جووتیارەکان باش بوو.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید رەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥٥)

کەلاکوژ: ئەو کەسە بوو گەمەی دەکرد، بەلام کەلای نەبوو، چاوەڕوان بوو کەسەك کوژرابایە بە کەلایەکەی ئەو گەمەی دەکرد.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید رەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٨٠)

کەرەتەپۆ: کەری خەساو بوو، کەرێکی زۆر تەنبەڵ بوو بەزەبری دار ڕێی دەگرت.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید رەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٦٤)

کەمەرە: قایشێکی زبر بوو پانیش بوو، سێ گۆی پێوە بوو، گۆی نێوەڕاستی بەرزتر وگەورەتر بوو، لەپشت دەبەسترا.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید رەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٤)

کوڕەمەکە: جۆرە خەناوکەیەك بوو لە ڕستە قەنەفڵ وسۆتکە ومەرحەم بە ڕستە لە ملدەکرا، قاشێکی بەپلپڵەی پێوە بوو لە دوورەوە بۆنی دەهات.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید رەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٦)

کاتێك سەگ دەچووە بەر سێبەر: جاران ئەگەر لەسەرەتای بەهارێ سەگ چووبایە بەر سێبەرێ، جووتیارەکان دەیانگوت: حیساب نەماوە وبەهارە، سەگ چوویتە بەر سێبەرێ.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان-حەمید رەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٢)

کاروان ئاشی: چێشتی کاروانی وبەپەلە، لەکەرکوك بە شێویان دەگوت (ئاش)کاروان ئاشی شلەیەکی بەپەلەیە ونانی تێدەکوشرێ.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٧)

---

کلك تەقێنە: باڵندەیەکە وبەقەدەر چۆلەکەیە وکلی درێژە وڕەنگی شینە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٥٦)

---

کشتەك: ناوی جۆرە نزایەك بوو مەلایەکان بە داوەدەزی دەیانکرد ولەگەڵ هەر نزایەك گرێیەکیان لە داوە دەرزییەکە دەدا. پاشان داوە دەرزییەکەی لە زەندی دەستی نەخۆشەکە دەکرد.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٥٨)

---

کارك وکوتەر: پاشماوەی بێستانە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٦٠)

---

کۆراو: ئاوێکی نا بەردەوامە وبۆ کردار دەست نادات، پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ:
(نە کۆراوان بکە نەڕەز، نە ناکەسان بکە نەکەس).
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٥)

---

کۆرەڕێ: ئەو ڕێگەیەی هاتووچووی لەسەر زۆر کەمە ولەهەندێك شوێندا نامێنێ.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٧)

---

کرووژە: بریتییەلە گواستنەوەی توولەی مێوی درێژ بەژێر زەویدا لەکاتی چاندنی ڕەزی مێو، ئەو توولە مێوە دەبێتە بنەمێو.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٢٢)

---

کەپرەشینەی جوولەکان: ئەمجۆرە بارانە تایبەتە بە بۆنەی جولەکەکان، بەڵام خەریکە لەیاد دەچێتەوە. لەوەرزی پایزاندا لەکاتی سەرپەریٚ دەبێتە هەورە تریشقە وباوباران. لەهەندێك شوێندا زۆر دەبارێت ولەهەندێکیش کەم دەکات وهەموو جۆرە میوەیەکی بەو کەپرەوە دەکەن و دەیخۆن. پێشتر هەموو ساڵێك ئەو بارانە دەباری.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان–حەمید رەشاش–رێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٣١)

---

کاوانکوژە: ئەستێرەیەکی زۆر گەشە، پێش ئەستێرەی بەیانی هەڵدێت، هەندێکجار خەڵك وایدەزانی ئەستێرەی بەیانییە.

(هەگبەی زاراوە رەسەنەکان–حەمید رەشاش–رێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٣٧)

کەر تۆقێنە.

---

کورد نەیبوو پیازی.

کەحی دوان دوان دەیخوازیٚ.

---

کەر و مزگەوتیان نەگوتییە.

---



# گ

گەلاوێژ کەوتە بەر شەوێ

دەست کە باخەڵی مێوێ

واتە (ترێ پێ گەییووە)

---

گەورە لێمان ناپرسێ، گدکە پێمان دادەفسێ، گەورە ئاوێ دەڕژێنێ، گچکە پێی لێ دەخشێنێ

---

گوجیلەی فسکەن، لە دێری ترکەن دەبێ (دێر- دێڵەسەگ) گوجیلە: تووتکەسەگ

---

گەورە کیژ لە شەرمی رووی، ماچی دەدا لەبن کەندوان

---

گای بەگوون، وچێر بە گوانی دەناسی (چێر-مانگا)

---

گۆی هاتیتە سەر قاشوێ بەختی هەستاوە

---

گۆ: تۆپەکە لە تۆپی تەنس بچووکترە لە پەڕۆ دروست دەکرا

قاشو ئەودارە پێی لە تۆپەکە دەدرا لە دار دروست دەکرا

---

گۆلەمێژ: شیر پێدانی گوڵك بێری دەیکا بۆ ئەوەی مانگاکە بدۆشێ، دەڵێن مانگاکە سەردەدا، منداڵیش بە گەورەیی شیری دایکی بخوات وای پێدەڵێن

---

گۆیە- گۆیا: گوایە

مەلا عەبدولرەحمانی دەلی / ئیفترایان پێ کردیە گۆیا شیعەیە حەتتا قەسدی کوشتنیان کردیە ل ٧٥

---

گەمبۆڵ-گەمبۆر: جنێوە، تەمبەڵ، پیاوێکی کەتەو زەلام وبێکەڵك، گەبرێل هێمن عومەر خۆشناو لە بیرەوەرییەکانی مەلا گەورە ل ٥١٨ دەڵێت (مێردەکانیان وەکی گەمبۆل لەسەر لەب لێی ئەکەون)

---

گفت: وەعد، بەڵێن پەیمان

گازەرای پشت: تیرەقەی پشت

---

گری دوور دەرمانە گلی دوور)

---

گەلۆر: بێ کەڵك هیچ لەبارانەبوو: ئیشنەکەر، حەپەتان

---

گەلحۆ: بێ کەڵك هیچ لەبارانەبوو

---

گوژارك: گوژاڵك، حنچل-ڕووەکێکی خشۆکە وەکو شەمامە تامی زۆر تاڵە وخۆڕسکە

---

گا گوورایە، کلکی مایە (ماوە)

---

گێش یا مێش، گێی فەقیران ڕامەکێش (گێ-گوێ)

---

گەر پێت هەرناگیرێ لۆ هەرت دەگرت

---

گچکە لێم ناترسی، گەورە لێم ناپرسی

---

گۆڕیـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــەی: گـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــۆڕەوی

چـــــــاوەکەم تـــــــۆش پیرەبـــــــی ریشـــــــت دەبێتـــــــە گـــــــۆڕەوی

وەك بفەرمووی من فلانم پێت دەڵێن توخوا ئەوی (حاجی قادری کۆیی)

---

گێز بەلە: سێوی بن عاردی، وەك پیفۆك، خۆرسکە

جێگای گیزبەلە وگردی پیفۆکان (شەوچەرە ل٥٩)

---

گێگری چاکە: باش گوێ دەگری

---

گول: گەڕ، موی برۆ وبرژانگ وسمێلی هەڵوەری دەلێن گول یا گەڕ بووە

---

گووفك: سەرانگوێلك

---

گۆلك: گوێرەکە، گۆلە. فلان کەس دەڵێی گۆلکە

---

گەنجوور: خاوەن خەزنە، خەزنەدار

---

گنخن: لەڕولاواز، بۆن گرتوو

---

گاشە بەرد: بەردی گەورە

بە گاشە بەردان وەرگەڕابووە سەری

---

گاگۆرە: ڕۆیینی بە دەستان، مناڵ پێش ئەوەی بەسەر پێ بکەوێ

---

گەڕ پێ کردن: تەشقەلە پێ دروست کردن، گێچەڵ پێ کردن

کێ گەڕی پێ کردبووی تووشی بەڵای خۆتم بکەی

ئەو دەمە باسی عەزاب و دۆزەخ و کەوسەر نەبوو

(حاجی قادری کۆیی ل ١٠٤)

---

گاجل: پارچە پەڕۆی ڕەنگاو ڕەنگ لێك دەدرێ و دەدورێتەوە، زیاتر ساواری پێ وشك دەكەنەوە

---

گورگ مەڕێ دەبا

ڕێوی دەڕێ هیناما‌ن

---

گوێی شێری دەردێنێ: ئازایە

---

گەمی: كەشتی زۆر گەورە

---

گەندەڵ: دەری سۆبە كە لە ناوەڕاستی وبۆش بوو لە سووتاندا زوو خەلاس دەبو خۆی نەدەگرت سووك وتەپی بوو دەیانگوت: ئەو كۆلكە دارە گەندەڵە وهیچ نییە، زوو دادەمركێتەوە

---

گریانم دێ بە نەقر

لۆ ئینسانی بێ ئەقر

---

گریانم بەو سەردولكە نایە

---

گن: بە كەپوو قسە دەكات. منگن

---

گای بنە: خەتابار، فیتنە چی، لەپشت پەردەوە كێشە دروست بكات ئەو كینایەتەیە بۆ گای بنەی لە گێرەدا، لەبنەوە نزیك چەقی خەرمانەكەیە

زوڵمیان عامە لەسەری عاممە، رەعیەت فەوتا

تۆ مەكە مەتحی عەوامیل كە خەتای گای بنەیە

حاجی قادری كۆیی ل ١٤٠

---

گەرە سیسە: بە سیسی دەگەڕێ، بە سووكی دەگەڕێ

---

گڕنە: عینادی، عەكس. گڕنەی داگرت: رقەی گرتووە، دڕنەی داگرت

---

گنخاندن: خۆ تەئخیر كردن. خۆ دواخستن

نەهات و خۆی گنخاند

---

گندووش: سوژن

ناوی نهێنی (فاتح رەسول) بوو لە سەرەتای خەباتی كۆمەنیستی

---

گورگەلۆقە: شەقاوی گەورە وخێرا

---

گووگرە: گەندە موو، تازە مووی لێ هاتووە، سمێڵی گووگرە بووە

---

گردی قەمبەر گاوانی: خۆی هەردا لە سەربانی (مندالان هاواریان دەکرد)
بە سەیارە وعەرەبانە تا ئەوێ دەچوون ودەهاتنەوە، قەمبەر گاوان گردێکە نزیک هەرمۆتە

---

گوند گوندی خۆمە لەترسی سەیان ناوێرم بچمەوە

---

گاڕان: گاگەل، گایەل
گاڕانیان بە خڕی دەبرد پیرێژن لە گۆلکە سوڕێ دەپێچێتەوە

---

گندۆرە: کالەک، گندۆرە بەرەنگی نییە گندۆرە بە گوندەکی (واتا بەش ناکا)

---

گۆش و جۆش : بە حۆش و حەماسەت و هۆشەوە
بە گۆش و جۆش بە سەرگەرمییەکی تەواو کەوتە ناو کارکردنی پارتایەتی (لە کاروانێکی دوورو درێژدا. فاتح رەسول /ل ٩)

---

گرووکەگاگرۆ، هاوینیان هێنا بە درۆ، واتە بەهار ماوە

---

گڕە: لێو کورتی دداز بە دەرەوە، بەمانای (وڕە)ش دێ بای زۆر گەرم

---

گەڕەلاوژە: هەرکەس لە جێی خۆیەوە دەستکا بە گۆرانی گوتن دەنگی ناخۆش وبێزارکەر و وشەی نابەجێ. دەلێن بوو بە گەڕەلاوژە. (تێکەڵ وپێکەڵ)

---

گردبوونەوە: کۆبونەوە. خڕبوونەوە

---

گرد: خڕ
لەفزی کوردی بلاونەبوو گردبوو
وا لە مابەینی ئێمەدا تێچوو
(حاجی قادری کۆیی شارەزاو میران / ل ٢٤)

---

گوزەر: شوێنێک، جێیەک وەک گوزەری نەجاران، گوزەری کورتان دروان

---

گۆلک پەڕۆی قوت دایە: واتە شەرواڵەکەی جویتیەوە

---

گەرمەگۆر: ئەو خواردنەیە بۆ مردوو دەکرێ وەک ئەستووک و حەلوا، ئەوانەی لە پرسەو سەر قەبرانی بەریان دەکەوێ، بە زمانی دیانی پێی دەڵێن (وەلیتە)

---

گێرکە : مێرووولەی ورد. (گێلکە)

---

گا بەگونت لە جێیەکی بێ ئاو

---

گیای برژای: تێکەڵەی چەند جۆرە گیایەکە بە برژاوی دەخورێ

گونی خۆی و گێزەری لێك ناکاتەوە: (بۆ گێل و کەم ژیران دەگۆترێ)

گرمت: پارچە، گرمتە خوێ. گرمتە شەکر

گەزۆی زەیتوونی: شۆکە

گلێنەی چاوم دەوەرە

خەمی دنیام لەبیر بەرە (داریاس)

گژمرکە: جۆرە گیایەکی قژنە. لەکاتێ توورەبون بە کچێکی گچکەی سەر قژن دەڵێن، دانیشە دەرێی گژمرکەی

گۆزەرە شفتی: خڕە شووتی. شووتی خڕو بچوك

گوجیلەی یەك کۆریتێن، توخمی یەك سەگێن

گەرمگ: ئەو کانیانەی بەزستان گەرم وبەهاوین ساردن، چەند شوێن وگوندێك هەن لەکۆیە، گەرمکی ساتوقەڵا

گڕاو: گەڕ، ئاوێکی کبریتی هەیە لە گوندی جەلی بەناوی گەڕاوان

گۆڕین: ئاڵوگۆڕ

گلمنجان: جێیەك گڵی لێ هەڵ بخەی

گلیخە: گیایەکە بەسەلکە وەك پیازە بەراز حەز لێ دەکا

گۆنگرە: کێشە، تەشقەڵە

گۆسکە: گۆزە

گوللەی غەزەبێت لۆ نازل بێ

گولە: گۆلك، گۆرەتە، گولەی مێردان ئەو پیرە پیاوانەی ژنی گەنج دێنن

گوجیلە: بێچووە سەگ. توورتکە سەگ

گاشە: بەردی گەورە، خڕکە

گورە پرووزە: قەرە خەرمان

گەراکوتك: ئەو پارچە دارەیە کە بۆ کوتانی جل بەکاردەهات لە کۆرکردندا (جل شۆردندا)

کوتك: بۆ ساوەر کوتانەوە بەکاردەهات

گۆنگەر: قەرەبالغ وپڕ بەزم ڕەزم وهەراوهۆریا (گۆبەند)

گوڵخاتر: ئەو گوڵەیە کە زاوا دەیدا بە بووك: ناوی ژنانە

گورینگ: ڕازاوە بە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ

گورزە: گوندێك هەیە لە دەڤەری کۆیە گورزەرییان، (دەستەیەك)

گوش: گونیە، داو

گوللەت بەسەری دری کەوێ

گرانپەڕ: هەمیشە دوادەکەوێ، لەکاتی خۆی ناگا

گووی گەمان نییە

گیای دەداتە گورگێ، گۆشتی دەداتە بزنێ

گیا لەجێی عاسێ دەمێنێتەوە

گێی ڕاکێشی بنا گێی لەگەر دێ (گێ-گوێ)

گیسکە نێری بەهار لە دایکی خوێ ڕادەکا، سواری دایکی خۆی دەبێ

گیا قەت نابێتە (ڕاف)با هەر ڕۆژیشی لە پشت بێ

گورگ ددانەکانی لەدەست بدات، ناتوانی خوو ڕەوشت تەرك بکات

گورگ کە پیر بوو دەبتە مەخسەرەی سەیان (سەگان)

گەورەیی بە گەورە وگچکایەتی نییە

گورگانەشەوێ: دەستەواژەیەکە منداڵی ناو لانکێیان پێ دەترساند تا بنوی

گیزە گیز لە پێوەدان ناخۆشترە

گەر بە درۆزن ناوبانگت ڕۆیی، بێ نرخی لەکن بێگانە وخۆیی

گەیشتنە کێ، نەگەیشتنە کێ؟: (کێ: کوێ)

گوللەی بەفلسەوە دەنێ. تەقەی لە فلس دەکات

گونت دەخۆم

گۆد بووە–لە ئەنجامی زۆر دانیشتن لاق سڕ دەبێ وناتوانێ هەستێ دەڵێ گۆد بویم، نازناوێکە لە کۆیە

---

گێ ناداتێ (گێ–گوێ) واتە باکی نییە

---

گەر هیچ نازانی، گۆپار هەرگرە لۆ شوانی

گۆپار: گۆچان، گالۆك

هەرگرە: هەڵی گرە

لۆ: بۆ

---

گزیر: کاربەدەستی بچووك

بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر

نەك خۆیان یەکێکی بێتە ئەمیر

گوندەرەفسە: خۆی بەشت دەزانی، هیچی لەبارانییە، گچکە ونابوت وناتەواو

---

گردی خڕ بەمێ: جنێوە

---

گەوادی کارخانچی: جنێوە

---

گەجەر وکوجەر: دەستوپێوەند–ماستاو چی

ئەو گەجەر وکوجەرانەی لە کێ هێنایە

لە کێ: لەکوێ

هێنایە: هێناوە

---

گورگی باران دیتە: تاقی کراوەتەوە، بە ئەزموونە

---

گاگرۆ: گوڵێکە چەند جۆر رەنگی هەیە گەر بەفر نەبێ ساڵ خۆش بێ سەر دەردەهێنێت گاگرۆ: گاگرۆ، بەهاری هێنا بە درۆ

---

گروون: گرووانِدنی ماڵات، کەوڵ ناکرێ پێستەکەی جیادەکەنەوە وگۆشتەکەی بە ساغی دەردەهێنن دەیکوورن بۆ کوندە ومەشکە بە کاری دەهێنن.

---

گوڵە قایمقام: گوڵێکە دیارە بەس لەماڵی قایمقام هەبووە، بۆیە ناویان لێناوە گوڵە قایمقام

---

گۆتیان مەلا قوونە

گۆتی شەرتی چوونە

---

گەپرۆكەی بەخێ (خێ: خوێ)

خۆشترە لە گۆشتی بەرخێ

گەپرۆكە گیایەكی بەهارییە زۆر خۆشە خواردنی

گابدە بە گامردە. ژن بدە ب ژنمردە

گاگووڕاوە، كلكی ماوە!

گا لە گارانێ بەجێ بمێنێ، قۆچی خۆی دەشكێنێ

گاران: گایەل

گا بە تەنیا گێرە ناكات

گشت شتێ فەرزە. شایی وشیوەن قەرزە

گەوهەر لەناوقوڕدا بزرنابێ.

گومبەتۆكانێ: یارییەكی مندالآنە بوو بەخۆڵ وقوڕ دەكرا

گورگانە گورگانە شەوێ

لە ماڵەكەی مە دوور دەكەوێ

ڕۆڵەی مە والە شیرین خەوێ

برۆ كوڕی فلآن بێعارە ناخەوێ

كە منداڵیان دەنواند ئەو قسانەیان بۆ دەكرد تا دەخەوت

(مێژووی شاری كۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل١١١)

گوڵەك بام لە گوڵی هێرۆیە، شێ بام لەسەر ڕێ سەرایە بەرامبەر قشڵەی كۆیە حەیرانە (مێژووی شاری كۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل١٣١)

گوم گومانێ: گەمەیەكی مندالآنەیە لە كۆیە.

گوڵومە: كونی دەستاڕ

دەستارەكەی پێ با دەدا گەڵومەشی هەویری مەیلەو توند لە دەوری دەدەن

(مێژووی شاری كۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٦٤)

گەنم گەنمانێ: گەمەیەكی كۆمەڵێ كوڕوكاڵ وكچانە بەشەوانی زستانان دەكرا.

گەرمە، نەرمە، چەرمە، ئەتوو بینە بەرمە، ئەگەر نەمخوارد، بیدە بەتەوقی سەرمە (گیپە)یە

**گووی وشك به قوونی كەسەوە نانووسێ**

---

**گیانەكی بەوییە**

---

**گێی هەر ناداتێ**

---

**گرتنەخۆ: تبنی**

**(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٥)**

---

**گاڵدان: تحریج**

**(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٧)**

---

**گۆشم كە، جل پۆشم كە**

---

**گرانی خوێ تا قاپی كەڵە بابێیە-گرانی خێ تا قاپی كەرەبابێ یە- گرانی خوێ تا قاپی كەڵەشێرێ یە. لە وتەكانی شێخ مستەفای قازبەگیان**

---

**گۆڵم: دەست، چەنگ**

**دەبوایە تفەنگت لەناو گۆڵمت با**

**نەت دەزانی كەینێ لێت دەقەومێ**

**(مێژووی كۆیە- تایەر ئەحمەد حەوێزی ل١١٩)**

---

**گوونی كەرێ نابتە باینجان**

---

**گوو تا داری تێوەر دەی، بۆنی پیستر دێ**

---

**گەرام دنیا سەد وسی دەرە**

**نەمدی بینا دەمی دوو سەرە**

---

**گورگ بەخێوكەی، خوای مەڕ دەتگرێ**

---

**گەوزی: واتە خۆی تێوەردا**

---

**گۆردی مس: بزنی گوێ مەیلەوپان**

**(گوندی قازبەگیان-شێخ ئازاد قازبەگیان ل٦١)**

---

**گورگەمێش: ئەو سەگەیە لەگەڵ گورگ تێكەڵاوی دەكا**

**لەناو ئەو هەموو سیخوڕ وگورگەمێش وكەمتیارەدا بەیەك پێناس چۆن دەردەچێ دەی خێراكەن**

**(حاجیلەكانی دەشتی هاموون-ئازاد دلزار ل٢٤١)**

گای کێ لەگارانێ نەهاتیتەوە

گۆزە کەشکا وەکو جارانی لێ نایەتەوە

گۆلکی بێگانە پەت دەپسێنێ

گای بەکلکەوە دەخوات

گەوادی لەجاسووسی چاکترە

گەورەیی بەهەموو کەس ناکرێ

گورگیان کردۆتە شوانی مەڕان

گوریس بەیەك لایی نەدەهاتەوە، ئەوجا نۆبەتی دوو لایی یە

گووی تێ کرد

گوو ناکا تا برسی نەبێ

گووز بە ددان شکاندن وئاسن چەمانەوە بەترپیان نەگووتووە.

گیا قەت نابتە درەخت باتیشکی هەتاو وخاکی باشیشی لە پشت بێ.

گوندی زۆر کوێخوا ناحەسێتەوە، بزن هەرجارێ دەبڕدرێتەوە.

گای ناو گۆلکان: بەکەسێك دەگوترێ لەناو منالآن یاری بکا وگەورەش بێت

گڕدار: دیتنەوە لەیاری قەرەقەرایەنێ بەکاردەهات

گۆشتی کەروێشك ناخۆم، منەتم بە تاژی نییە

گیپە: سەروپێ

گەوادی پیاو بەچاوی دیار نییە بەمل پانیەکەی دیارە

گێ: گوێچکە

گۆیندە: گۆرانی بێژ

گەف: هەڕەشە

قائمقامەکەی عەباسی خەڵف هەر گەیشتە جێ دەستیکردە گەف

(ڕۆستەم حەویزی-بەسەرهاتی کۆیە ل١٤٩)

گەرەك: نیاز، مەبەست

گیف:  خۆ توڕەکردن

---

گیانلەبەرێکە بەدەم ئارەقە دەکات

(سەگ-سە)یە

---

گۆشتە بێ هێسکە، کرم وەمەکە

---

گیز گیزێتی، خەسل بەتەمای خۆشەی میزیتی

(چای سەماوەر)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٥٩)

---

گێ درێژی مێشك پووچ

دەنگ ناخۆش یاپراخ پێچ

هەورازی بڕی پێچاوپێچ

(کەر)ە

---

گوندی بێ سەیە

(گۆڕستان)ە

---

گورمۆکـــــــە ونەرمۆکـــــــە، پیســـــــتۆکە وچـــــــەرمۆکە

(پێستەی ژاژی وپەنیر)ە

---

گوڵێك لە باخان دەردەکەوێ

موسلمانی ٣٠ی بەردەکەوێ

(مانگی ڕەمەزان)ە

---

گارەدا: دانیست، دەرگاکەی گارەدا

---

گرمت:  تۆپەڵە.

---

گۆتنێ: پێم گووتن

---

گیرنەبی:  دواناکەوی

---

گروازە:  لوول

قژی گروازە گروازە بوو

---

گەر خوا بیکات:  ان شاء الله

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٧)

---

گۆرك: بداله ( (هێڵ گۆرگ)شی پێ دەڵێن

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٧)

گۆلکی عوزێر پێغەمبەری

---

گژنێژە: وشك بوو وەك مێوژی لێ دێ بەبەری مێوەوە.

---

گوڵ وگوڵزاوەند، لەو قەسەیی بێ بەرژەوەند

---

گورگ دەفن دەبێ وجەقەڵ لێمان پەیدا دەبێ

(د.کەمال مەعروف)

---

گورز: تۆپە گوریسێکی ئەستوور ودڕ سەرەکەی وەك تۆپ بوو، گورزی کاریگەر، بە گورزان لێیان دەدا.

---

گەلناغاج وگەلناغاج. هەزار ئاغاو یەك کرمانج

---

گەسکەوان: کەناس

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٥٨)

---

گەوەك: بورغی

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل١٨٥)

---

گەچگرەوە، گێچگرەوە: کەسێکی گەچ وئاو تێکەڵ بکات بۆ بەردەستی وەستای بەنا گەچگرەوەی پێی دەڵێن (گێچگرەوە).

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٠٧)

---

گیرەوە: جبلە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعوود محەمەد ل٢٠٧)

---

گەمەوگەپ گەر درێژەی کێشا بەزۆری ڕوو لەناکۆکی دەکات هێندێجاریش کارەساتی لەعادەت بەدەری لێ بەیدا دەبێت

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٢٧)

---

گەر نووسەر بمرێ دەمرێ، ئەگەر لە نووسین کەوت دەمرێ، ئەگەر دووڕوویی کرد دەمرێ، ئەگەر جنێوفرۆش بێ دەمرێ، خۆ ئەگەر لەیەکێ لەمانەدا، جگە لەحاڵەتی یەکەم نەمرد دەبێ خوێنەران بیمرێنن

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٩)

گوری بۆندار وشکیش ببتەوە بۆنی دەمێنێ

(گور: گوڵ)

گور نییە پەپوولە لەسەری نەنیشت بێ

(گور: گوڵ)

گەر موو، بەبەخت دەبوو، بزن شای سەرتەخت بوو

گەر کەرین سەربەسەرین، گەر هێسترین بەرامبەرین

گەر جەسوورین، دەبا ببوورین

گەر درۆناکەی لۆ سوندان دەخۆی

(سوند: سوێند)

(لۆ: بۆ)

گەر بتەوێت خەڵکی بشکێنیت، ئەتووش لە حورمەتی خۆت نامێنیت

گۆرین: ناوبراو

گۆرایی: تەختایی

گەلاوێژ دەرکەتن لەسەری گوندی (سارتکە)ی دەم زێی دەکات زووتر دەبیندرێت دەڵێت گەلاوێژ بزووتووە

گورجوو: ئەو جێیەی گورچیلەی تێدایە، خاڵێکە گوریس گەیشتە رەفیسکان واتای تەنگاو بوو، تەنگەیان گرتووە.

گوو گێژی کردیە

گەورەترین ئاواتی رزگاربوونی (مرۆ)لەستەم کەکورد یەکێکە لەنەتەوە ستەمدیدەکانی هەرەزەق وزۆپی رۆژگار

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٣٤)

گا پاڵەوانە، بزن دارەوانە، مەر مەلەوانە.

گەرۆگول بووە، ڕوحی زل بووە.

گوڑارك (گوڑالك) نابێته شفتی.

---

گورگ چووزانێ جووتێ شەك چەند دەكات، بۆیە دەستی تێ دەچێ بیخوات.

---

گوڵ دەستە برای پیسە، كە دەبن بەهاوكیسە.

---

گورگان خواردی كرد

---

گونی گونداری دەردەهێنا.

---

گرەو لە شیتان دەباتەوە

---

گرێی بەختی كرایەوە

---

گوونی خۆیی و گێزەر لێك جودا ناكاتەوە

---

گونی بۆ دەدات لە خم

---

گوریسێكی داخستووە، دنیای هەموو، تێخستوە

---

گوو ناكات، نەوەكو برسی بێت

---

گەری بارە تریێ یە

---

گەز، گەز باڵ دەكات

---

گۆتی بێنە مەلا، گۆتی ئەستەغفیرەڵا، گۆتی هانێ مەلا .. گۆتی بارەكەڵا

---

گیابرژە: گیابرژۆكە. گیابرژاو

ئەم گیایە لەسەرەتای وەرزی بەهاردا پەیدا دەبێ ئافرەتان بەچەقۆ لەسەر زەویەوە دەیبڕن وپاكی دەكەنەوە ودەیكوڵێنن لەگەڵپیواز وهێلكە وخوێ لەڕۆندا سوور دەكرێتەوە ئەوجا دەخورێ وزۆریش بەتامە

(كەلەپوری كودەواری-كۆكردنەوە وئامادەكردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٤٥)

---

گێژەڵووكە: گێژەڵووكە لەپێش بای شەماڵ پەیدادەبێ ودەسووڕێ ودەبێتە هۆی تەپوتۆز ونیشانەی هەڵكردنی بای شەماڵە.

(كەلەپوری كودەواری-كۆكردنەوە وئامادەكردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٤٦)

---

گلێرە: وەکو کرێوە وایە، بەڵام هێندە ڕەق نییە ولەپێش بەفر بارین دەبارێ وجێ بۆ کەوتنی بەفر خۆش دەکات.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٤٧)

---

گڕەبا: بای گەرمی چلەی هاوینە وبایەکی زۆر گەرم وسووتێنەرە وزۆرار گەڵای دارودرەخت وبەرووبوومی کشتوکاڵی دەسووتێنێ وزیانیان پێدەگەیەنێ
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٤٦)

---

گاگۆز: گاگۆز لەپایزدا دەچێندرێ ولەسەرەتای هاویندا پێ دەگات ئەویش بۆ ئالیکی ڕەشەوڵاخ زۆر باشە.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٨)

---

گڵەسۆ: ئەو کارە جوانەگاو ڕەشەوڵاخ دەیکەن بۆ هەڕەشەو شەڕ یان کاتێك کە یاخی دەبن بەهۆی تێری وقەڵەویەوە بەتایبەت بەهاران کە لەوەڕ زۆرە گڵەسۆ دەکەن وقۆچ لەزەوی گیر دەکەن ودەهوولێنن
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٣)

---

گابۆڕ: کاتێك گاوو مانگا چاویان بەخوێنی گیانلەبەرێکی سەربڕدراو دەکەێ لەسەر خوێنەکەی کۆدەبنەوەو تێکڕا دەهۆڕێنن وەکو شین بکەن وایە.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٣)

---

گوڵەبەیبوون: گوڵێکی سپی وبۆن خۆش وزۆر جوانە بەهاران پەیدا دەبێ
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٦٤)

---

گوڵووك: شاگوڵ
ئەو گوڵەش بەهاران پەیدا دەبێ وگوڵێکی گەورە وگەشە وبەشای گوڵان ناسراوە
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٦٥)

---

گدی: بۆ بانگ کردنی بزنە

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٩٥)

---

گریس: بۆ بانکردنی کاریلەیە

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٩٥)

---

گۆشتی ناخوا حەرامە، گۆشتاوی دەخوا بەتامە.

---

گووز بە ژمارە، مایەی خاوەنی دیارە.

(گووز: گوێز)

---

گندۆرە بەگوندەکی.

---

گۆڕییە لەپێکردن. ڕاست وچەپی ناوێ.

---

گڕوو: گڕوێ (ڕەنگی دەگۆڕێ)

---

گورگ کەڵبەی نەشکێ چاوەڕێی کەلاکە

گاگۆز گای دەکا قوز

---

گەنجی بەباوبێ.بەژەهرە ماربێ

---

گورگی کوشتوە

---

گەوەرە دادەنیشی لە بنەبانێ،پۆپنە دەداتەوە وەڵامی میوانێ

---

گیا لەعاسێ یان.بەفر لەنسێ یان دەمینی

---

گاندانیش بەبەختە

---

گۆزەچی گلەیی لەدیزەچی دەکا

---

گەنم گردو جۆ بلاو

---

گورگ گورگێنی دەکا.لەکاتی تەنگانە لە قوون تێك دەکا

---

گوزەی نوێ،ئاوی شەوی،ئاغاو رەعیە ریك ناکەوی

---

گاجووت لەمانگای خۆت بی،نال لەتەشی خۆت بی

---

گایەك نەزری فەقیران.ئاغایەکمان بێتە جیران

---

گانی بدە یە فەقیری بەگونەوە دەیباتێ

گای گێرە یە

گاوانی بەگاوانی شەرم نییە.بەنانەوە چنی ێ شەرمە

گاس لەخەز نەی دایە

گەنم هەلی جویە هەلی هەرزنەتە

گەما باریگەیتە هیچ نیە و ناشیرینە

گوڵە نیسان بووکی مەجلیسان

گورگان چەندان گۆشت دەوێ.منیش تۆم هێندە خۆشی دەوی

گووزان لەباری خۆی دەژمیری

گاگۆز خۆراکی گایە

گامێش بە شاخی ناگیرێ

گەپرۆکەی بەخێ، خۆشترە لەگۆشتی بەرخێ

گەپرۆکەی بە نانی، خۆشترە لە گۆشتی بەرانی

گەورە چوونە بنەبابێ، گچکە هاتنە مەیدانێ

گورە جۆی هیناوە!

گوری گەش، هەر سیس دەبی

گوژارك تاریشە دەرمانیشە

گورەك ئاو بدە، هیشك نەبی

گۆشتی بەرازی بە کەلبەی سەی

گێرە، بێ بنە گێرە نابی

گۆتە گۆت باش نییە، نسیبەتی بەدوو دادێ.

گوڵی سووری ژیانی بەرخودان، ڕێگای ئازادی دەگۆڕێ.

(د.کەمال مەعروف)

گیشەکەر: ئەو ژنەیە، کە بەقەلاَنگەکەیەوە سوارە، یان مەلۆ لەدوای سەپانەماندا هەلَدەگرێتەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤١)

---

گیشە: کۆمەلَە قرشەی دروێنە کراوە ولەسەر یەك دادەنرێ ودەکرێتە کۆمەلَی درێژدرێژی لاکێشەیی لەشێوەی قەبر.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٤١)

---

گەرۆمە: ئەو کونەی دەستهارە کە ژن بەگۆلمان دانی تێدەکەن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧١)

---

گروان: بەری دارمازییە و وەك هەرمێ سرۆکەیە ودورد دەکرا ومەشکە ودۆدانی پێخۆش دەکرا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٥)

---

گەورەگلە: جۆرە پنچکێکی درکاوی بوو بۆ سووتەمەنی بەکاردەهات وئاگری خۆشبوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨٦)

---

گەرمەزەن: ئەو کاتەیە کە مەڕ وبزن دەزێن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٣)

---

گەرمەبەران: ئەو کاتەیە کەوا لەنێو مێگەلدا زۆر وبەکۆمەلَ مەڕ بەبەران دێت بەران سورای مەڕ دەبێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٤)

---

گەرمەتگە: بەتە گەهاتنی ەکۆمەڵی بزنی نێومێگەلە. جاران پەندێك هەبوو، دەیگووت: ( (ئەگەر بزن نەکا هێلە هێلێ، نێرە نا کا بێلە بێلێ) واتا ئەگەر ڕەزامەندی لەلای مێینە نەبێت، نێرینە ناتوانێ دەستدرێژی بکاتەسەر مێیەکان.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٤)

---

گریێ بەران: ئەو جۆرە گرێیە لەکاتی دەستبێنگرتنەوەدا هەیە، کاتێك شوانەکە دەستبێنەکە گرێ دەدات، ئەم جۆرە گرێیە هەر شوان دەیزانن بۆ ئەوەی بەرانەکە نەخنکێ.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٥)

---

گرەبەران: گرە بەران جۆرە بەردە مردەیەکی زەردە ولەژێر زەوییە وڕەنگەکەی زەردێکی خەنەییە وشوان پشتی بەرانی پێرەنگ دەکات.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٥)

---

گەرمەپاوان: ئەو لەوەڕگەیەی شەقڵی نەشکاوە ومالاتی تیادا نەلەوەڕاوە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٦)

---

گڕکە: ناوی جۆرە نەخۆشییەکی مەڕی سپیانە وەك نەخۆشیی خورشتە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٩)

---

گۆلەمێژ: لەکاتی مانگا دۆشیندا پێشەکی هەندێك شیردەدەنە گۆلکەکەی لەهەر گوانێکی قومێك یان دوو قوم شیر دەخوات بۆ ئەوەی مانگایەکە خۆی شل بکات وشیرەکەی بێتەخوارێ.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٥)

---

گەرمە هەوێن: بۆ نان وماست خواردن کابان شیرەکەی زۆر دەکوڵاند بۆ ئەوەی ماستەکەی پەیت وتامسۆ بێت.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٠٦)

---

گورد: ناوی بەنی چبنی ڕایەڵەی پشتەوەی مافوورە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٩)

---

گۆشت پارە: زیادە گۆشت

---

گەرد ووەرد: زەوی بەیار دوای باران بارین بچێندرێت پێی دەڵێن گەردو وەرد.

---

گرەوان: کەسانێك بوون گڵەسەریان دەفرۆشت

---

گرمخا: بۆن پەیداکردن لەشتی تەڕ، خنك.

---

گرمت: کلۆ، سەلك.

---

گڕناغە: سووربوون.

---

گۆڕەشار: شەڕی ناوگۆڕ

---

گۆزەگۆز: گواستنەوەی بە بەردەوامی

---

گڕنی گڕنی: دڕ زیاتر بۆ گندۆرە (کاڵەك) بەکاردێت

---

گۆردەپۆش: بزنی گوێ وملی درێژ.

---

گندۆرە بە ڕەنگ، شفتی بە دەنگ.

---

گاخۆرە+ لەگەڵ ئیشدا ناجۆرە.

---

گاپیر توڕانی، دنیای بۆگەنکرد.

---

گاجووت چاوی لە جووتیارە.

---

گاسن، هاوەڵی گا و کەرە. بۆیە هەر قووربەسەرە.

---

گرانم ناکەی هەرزانم مەکە.

---

گسکیان دا لەماڵکەی.

---

گورگ لەتاریف لەمەڕ+سەری نایە دووگی تەڕ.

---

گورگ دەڵێ ڕۆژی هەور+لەوس و قەپۆس دەکەم چەور.

---

گورگ نەما لە بێشە بزن دەبێ بە چاوەش، مەڕبش چۆپی دەگرێ.

گورگ یاسا دانەر بێ+مەڕ دەبێ قوڕ بەسەر بێ.

گورگی پیر+ ناکەوێتە بیر.

گوریس، بێ ڕیس نابی.

گوریسی ڕاخستوو دنبای تێخستوو.

گوڵ ببەی لۆ هەر کوێ هەر گووڵە.

گوڵ بۆنی نەبێ نایکەنە گوڵاو.

گوڵچن لە دڕك ناترسی

گلۆ لەیەك بەن بادە. خۆت لە بێحەیا لادە.

گوێ بگرە+مێش مەگرە

گوێ لەمشت+داردەسە بۆ گشت.

گوێ لەمشتی ورگ بی، دەبێ تیکەی گورگ بی.

گوێڕادێرە، مێش مەژمێرە.

گوزی پووچ، سووکە

گوزی پێدام، پووچ بوو.

گۆرانی سەگ لوڕەلوڕە.

گۆشتی گا، کەمکەم- گۆشتی مەڕ، هەر ژەم.

گۆڕ بەئەندازەی مردوو هەڵکەنە.

گۆڕکەن لە مردوو ناترسێ.

گۆڕی لەکوێیە تاکفنی هەبێ.

گەر بۆنت خۆشە لە لای باوە دانیشە.

گەر خودا یار بێ+ باگشت نەیار بێ.

گەر ناترسی لەدژمن- بترسە لە داوی ژن.

گەر ڕاوێژ کەرت ژنە- دنیا لات سەرو بنە.

گەر هەموو شەو قەدر دەبوو+شەوی قەدر بێ قەدر دەبوو.

---

گەرما، سەهۆڵی ڕەق دەکا بە ئاو.

---

گەرما هاوین+ میوەی شیرین.

---

گەزۆ بباری+مێش زۆرە.

---

گەشتیتە دەریا. باسی جۆگەلە مەکە .

---

گەلاوێژ، تریێ بەتامتر دەخورێ.

---

گەوهەرت دەسکەوت مەرمەڕ فڕێ دە.

---

گەڕەکی دوورتر کراسی سوورتر.

---

گەیشتووی مەنزڵ+ حەساوە دڵ.

---

گەیشت بە خاڵ ورد+کرمی سەری مرد.

---

گیرفانی پڕە+بێ مشت و مڕە.

---

گیسك کەوتە فیشکە فیشك+ناپرسێ لە دایك خوشك.

---

گێرە بە بزن ناکرێ.

---

گەر مردن نەبێ. قیامەت هەڵدەستێ

هەر بە هیچ بارێ. مرۆڤ ناوەستێ.

(محەمەد دارياس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

---

گفتو لفتی خۆش. شادی دەهێنێ

تۆوی خۆشویستن. لەدڵ دەڕوێنێ

(محەمەد دارياس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

گوێرەکەی باری. بەمنداری دیاری.

---

گورگیان کرد بە شوانی مەڕ.

---

گۆتیان: نەخۆش چۆنی؟ وتی: هەر مەمدوێنە، گۆتیان: لۆ خواردن چۆنی؟ گۆتی: هەر لۆم بینە.

---

گەنج، هێلکەی بەبن هەنگری خۆی دەکورێنێ!.

---

گەر کێشکەیەك بوو بە دوژمنت دەبێ حسابی لۆ بکەی.

---

گەر بەتەمای سێبەری خڕنووکی بیت، هەتاو دەتسووتێنێ.

گەر دروێنەکەری، زۆر لەبنەوە مەیبڕەوە.

گەر خەو دەبوو بە مایە، کەروێشك دەبوو بە گایە.

گەرمیان دووره لۆ هەژاران.

گەنجان گەنجانە، مانگا یەکە وکەڵەگا پەنجانە.

گەر حوشتر باری ببوایە، ئەم عاڵەمە چی بکردایە؟

گورگ ئەگەر گۆشت نەخوات، ددان ئێشە دەگرێ.

گورێ مێشە، هێن نابە پێشە.

گۆتیان: بەچەند دۆستت پەیدا کرد؟ گۆتی: بە سەد لیرە، گۆتیان: بەچەند لەدەستت چوو؟ گۆتی: بەخۆڕایی.

گونی نیشان دا.

گورگ نەبی، سە دەتخوات.

گوریسی ڕاستی، باریك دەبێ، بەران نابچڕێ.

گۆشت هەرچەندە لەڕ بێ، هەر لەسەر نانە.

گاڕانیان ڕادا بە زۆری، دەپرسێ لە مانگا بۆری!.

گونی مێشان دەخەسێنێ.

گوند بێ گۆفك نابێ

گوەکی کردیە بە حەفت ئاو پاك نابیتەوە.

گورگی باران دیتەیە

گەر بدرێ بە کەر دوو شاخی گامێش، هیچکەس ناتوانێ لێی بچێتە پێش.

گیا ڕەشە بە دەمی مەڕی خۆشە.

گەورە کچ بێنە، سەر لەخۆت مەشێوێنە.

گورگ لە باران بترسایا، قەرۆکەیەکی لەبەر دەکرد.

گەر کردت نان ونمەکی

لەگەری مەکە قەت بێ ئەمەکی

(لەگەری: لەگەڵی)

گەڕەکێك دوورتر، کراسێك سوورتر.

گووی زیاد مەخۆ

گۆتیان: هاوسێکەت حیزە، گوتی: ناوگەڵی خۆم سەلامەت.

گرتی وکوشتی.

گوتن وکردن، لێك جودان.

گۆلکی خاوەن زۆر گورگ دەیخوا.

گوو بەو نانەی ئەو دەیخوات.

گای خۆم دیوە بە دۆڵەوە، چم داوە بەسەر هەمبانەبەکۆڵەوە.

گەر برا شوانە، خوشك هەر چاوەڕوانە.

گووخواردنی توی پێویست نییە.

گۆزەی سوور وئاوی شەوێ، ئاغا وکرمانج یەك ناکەوێ.

گۆتیان کەباب خۆشە. گۆتی خواردیتە، گۆتی براکەم لەشار بۆنی کردیە!.

گوتیان حوشتر کوڕێکت بوو، گۆتی: ئەو بارە لە خۆمە هەر لە خۆمە.

گا گێرە بکا، میزیشی تێ دەکا.

گورگی بەردایتە کۆزی خۆی.

گوندی زۆر کێخوا. میوان هەر ناگری.

گاوان تا لە گاڕانێ نەیەتەوە، نانی نادەنێ.

گا بەجل و جۆڕ، ژن بە سەر و پۆر.

گاوان هەتا دانیشی. گاڕانی دوورتر دەکەوێتەوە.

گۆزەی تازە، تا چل ڕۆژ ئاوی خۆشە.

گەر برا شوانە، خوشك هەر چاوەڕوانە.

گەندە لە مەندەی کەمتر نیە

گووی دەرخوارد خۆی دا.

گرەوی لە شەیتان بردیتەوە

گیسکە قوت، سەد سار لێیدەی بە مێکوت،

ئەو قسەی دەیگووت هەر دەیگووت.

گۆتیان: دوژمنت کێیە؟ گوتی: خزمم نیە.

گۆتیان: ڕێوی چەند پەند دەزانی؟

گۆتی: نەوەدونۆ، چاکتریان پێچ کردنەوەیە.

گۆتیان: سەرمایەت چەندە؟ گۆتی: قەرزادار نیم.

برادەری کێچان، بابی قالۆچان.

گا بمیزێ، لە حیزی جووتیارە.

گا جووت بخەوێ، لە بەختی جووتیارە.

گا بە دەنگی ناڕوا.

گا زمانی نیە، بەندە ئیمانی نیە.

گا گووی کرد، دنیای پیس کرد.

گا لە گا بەجێ بمینی، دەبی کلکی بڕی.

گوێرەکەی باری، بەمنداری دیاری.

(مندار: مندالْ)

گای بە پێستەوە قووت دەدات.

گای بە پێوە قووت دەدات

گای ناو گۆلکان

گاران بە هەوی هەوی شۆڕەسواران نەدەگەراوە،

نۆبەی چەق چەقی پیرە ژنییە.

گاسـنی خـۆی نـابینێ، لـە دەرزی خـەرك دەپرسـێ.

(خەرك: خەڵك)

**گاڵتەی پێ ناکرێ.**

**گران فرۆش و هەرزان کڕ، هەردووکیان مەحتەلن.**

**گرەوی لێ بردیتەوە. گرێیکۆرەی کردیتەوە.**

**گرێی بەختی کراوەیە**

**گڕی دامرکا.**

**گۆشتەکەی لۆ تۆ. ئێسکەکەی لۆ من.**

**گۆلك بە گچکە گچکە دەبیتە گا.**

**گۆلك لەسەر پەت و سنگی خۆی نەوەستێ، گورگ دەیخوا.**

**گۆلکی بێگانە، پەت دەپسێنێ.**

**گایەکی ڕیخن، سەدی گای خاوێنی پێوە ڕیخن دەبی.**

**گوری مەجلیسان.**
**(گور: گوڵ)**

**گورگ لە برسان لە هەورازی سەرنە دەکەوت،**
**دەیانگۆت: زۆری خواردیە.**

**گورگ دەرێ: هەروەخت هەورە، دەمم چەورە.**
**(دەرێ: دەڵێ)**

**گورگ دەرێ: قوربانت بم مەڕ،**
**دەخۆم دونگی تەڕ. نابێ لە لەوەڕ.**

**گورگ بنێتە ڕان. ناپرسێ لە پیر و جوان.**

**گورگ باران دیتە.**

**گونیشم قەرزدار بی. دەیبڕم.**

**گوند بێ گۆبەند نابی.**

**گون گا.**

**گێرە تێکدان، خەتای گای بنەیە.**

گیرفانم خاڵیه و پۆزم عالییه.

---

گێ مەدەیە، گیای بدەیە

(گێ: گوێ)

---

گووپە گەشەکانی چرچ و لۆچ بووە.

---

گـــووز بەرانبـــەر بـــە گـــووز، خورمـــایش بـــە نرخـــی بـــازاڕ.

(گوز: گوێز)

---

گووزەك گووزەك، دبە دیزەك.

---

گەرمەبرینە.

---

گۆڕی بەدەستی خۆی هەڵکەند.

---

گردەی منە وبردەی ڕەشەبا.

---

گووی سەرپنجی دەخۆی.یا گووی نێرە قنجی؟

---

گۆردی: ئەم وشەیە لەکاتی دەمەقاڵی بۆ سووکایەتیکردن بەیەکتری بەکاردەهات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاّح سەعدی ل٣٠٥)

---

گلێرە: بەری دارمازییە وبەقەد هەڵماتێکی شووشە دەبێت وبێسوودە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاّح سەعدی ل٢٢٢)

---

گاپەل: باڵندەیەکە ولەشێوەی کۆترە وهەندێك گەورەترە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاّح سەعدی ل٢٥٢)

---

گوارەی بەشۆڕابە: جۆرە خشڵێکی ژنان بوو، هەر گوارە بوو، بەلاّم لەلای خوارەوەی بەپلپلە بوو، جاران لەگورانی دروونەکردندا ناوی گوارەی بە شۆڕانە دەهات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاّح سەعدی ل٢٤٤)

---

گەبەر: بۆ کۆمەڵە حوشترێك بەکاردێ. واتا لەجیاتی ڕەوە بەکاردێ ودەڵێن گەبەرە حوشتر.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٧٠)

---

گەروخڕە: خڕبوون وهەڵئاوسانی گەروو بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٣)

---

گرمژە: زیپکە لەشان وملی وپشتی مرۆڤ دەهات ودەرمانەکەشی ئەوە بوو توێکەڵە شفتیان لێی هەڵدەسووی.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٦)

---

گزرە: لەناوچە شاخاوییەکاندا ولەمانگی نەورۆزدا کۆمەڵێك داری گەورەیان لە ئاقاری دەبڕییەوە وبۆ سوتاندن لە وەرزی پایز دارەکەیان دەهێنایەوە ومالێ.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٣)

---

گوێڕەپە: بەعەرەبی نوکافی پێدەڵێن. دەرمانی گوێرەپەش ئەوەبوو ئەو شوێنەی ئەستوور دەبوو ڕاست وچەپ بە تەنی ڕەشیان دەکرد وچاکدەبوویەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٣)

---

کفەکفکردن: ئەو قۆناغەیە کە منداڵ چەند دەنگێکی بێ واتای لە دەم دێتە دەرەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٣٩)

---

گەورۆنە: زۆر گەورە

---

گرێی دەستان، مەخە بەردانان.

---

گڤەی دێ.

---

گۆتی: گیا بە دەمی بزن خۆشە، گۆتیان مەجنون لەیلا ڕەشە.

---

گا دەمرێ چەرمی دەمێنێ،

مێرد دەمرێ ناوی دەمێنێ.

---

گازیشی هەیە و نازیشی هەیە

گەر بدریٚ بە کەر دوو شاخی گا ش،

هیچکەس ، ناوانیٚ لیٚی بچیٚتە پیٚش.

گورگیان کرد بە وەکیلی مەڕ

گەر ئاسمان بەشی درەوش ەم نەکا، لە زەویدا جیٚی هەنگاوەکانم دەکەم بە ئەستیٚرە.

(سروە عوسمان مستەفا خۆش و)

# ل

لاکێش: ١. ب... بـــەرە وەمـــافووریش دەگـــوترێ لەشـــێوە لاکـــێش. ٢.نەخواتەوە، نەجگ...ە بکێشێ، واتە لاکێشە بە کەسێك دەوترێ جگەرە کەم بکێشێ ولەخەڵکی وەربگرێ.

لە چاوی دا نییە.بی...سفەت: بێئمەك–بێئەمەك، سپڵە، بێوەفا

لە چاوی خۆم خۆش... دەوێ.

لە ڕووحی خۆم خۆ...شتر دەوێ.

لە ردێنی وی ناوەش...دتەوە

لە چەنگی دادە داد...ی. هاروبەتارە

لە قوونی سەی نا...ەرکۆنەی کرد

لە خوام تەڵەبە

لە خوای نەبی لەکە... ناترسم

لە خوای گەڕایەوە. خوای بەزیاد بی

لە خۆشیان پێی عە...ی نەدەگرت

لە دەست خۆتی مە...

لە دەستی دێ، دەتە...ی

لەسەر زگمان دەلەو...ی

لەقەی لە بەختی خو... مەدە

لە قسەی خۆی نایە... خوارێ

لە قسان، وادەرێن و...ەگوترێ

لەم حاڵ وڕەنگە: لەو شێوەیە، بەوشێوە وڕوخسارە نەکـــــەی

لای کەس بیدرکێنی کە مێوانێکی لەم حاڵ وڕەنگەمان هەیە (حاجیلەکانی دەشتی هاموون–ئازاد دڵزار ل١٠)

---

لە مەچێتر–جندۆکە، جنۆکە

---

لە قسان مەعلانە، شارەزاو قسەزانە، لەبلەبانە

---

لە قیسی چوو: لە کیسی چوو

---

لۆ بەرخی هەژار،چ گورگ چ سوار (لۆ: بۆ)

---

لاقوزە: کاڵەکی خوار، گندۆرەی خوار وخێچ

---

لۆ دز، بەمانگە شەو دزی خۆشە (لۆ: بۆ)

---

لۆ دری خۆش هەمیشە بەهارە

(لۆ–بۆ) (در–دڵ)

---

لۆ ژنی لامل،پیاوی بەدنمەك

لە بەهەشتەوە هاتییە کوتەك (هاتی یە: هاتووە)

---

لۆ (سێو)ی مەچووە بن دارچنار

---

لۆ هەموان داکە، لۆ من زرداکە

(داك: دایك) (زرداك: باوەژن)

---

لە قسان دەگەڕێ

---

لۆ کونەکی هەزار کونی لە خۆی کرد

---

لۆمەی عەبدی، لەعەزابی قەبری، گرانترە

---

لە من تایە، لەتووش بەرایە

(بەلا)یە

---

لە ئاوی مەند وکەسی مۆن بترسە

---

لەب لەبان: زۆرزان، زیرەك. ئەو کابرا لەب لەبانە زۆرجار دەمی دەبوو بە تەڵەی تەقیوو
(شەوچەرە ل١٦ تایەر حەوێزی)

لەسەر بانیشم دیت ولەبن بانیشم دیت

لەهەر باخچەی گوڵێك، چپکە گوڵەکەی مامە

لۆقنتە: چێشتخانەی دەرێ هی بازاڕی. مچە عەوێز لەناو بازاڕی کۆیە لۆقنتەی دادەنێ.
(شەوچەرە ل٢٠ تایەر حەوێزی)

لۆرکەی خواردیە: واتە گێژ و وێژ بووە، ئاگای لە خۆ نییە

لۆق: قاچ، پێ، لۆق درێژ. لە کۆیە لۆقە فەندی هەبوو مامۆستا بووە (لۆقە ناوی مەسیحییانە)

لوولاقی بشکێنی گووی سەی تێدایە، واتە بەردفەڕە

لە دوروونەی پەرێزتان پاك بێ، لای گەوران زمانت چاك بێ

لە عەربەی دەنکەکی تێ ناگا

لەناو مەیتان دەگەڕا، دەیگۆت عەجەب فیتنە نەقەومێ

لامێژ: ئەو بەرخ وکارانەی دایکیان نەماوە گوانی مەڕێکی دیکەی پێ دەدەن، (مێژتە)

لوشکەی لە هەوای دەدا، لووشکەی لە ئەستێران دەدا

لەشێی، من دەکشێی
واتە لەگەڵ من ڕێك دەکەوێ
(کەوای ئەکرای (خالید دلێر)

لەندەهوور: لە بنەڕەتدا هیندییە واتا کوڕی خوێر، پاشان بۆتە نازناو بۆ زەلامی زل وبەهێز. ل١٢ لە ندە هۆری بەنی سەعدان پاڵەوان بووە

لەداکت کەوی، جارێکی کە وا هەر ناکەوی

لەدیار دێگەرەی بەتەمای تەقرەی

لەچاو شلان پەیتە

لەکەری تۆپی دەگەڕێ ناری (نالی)لێکاتەوە

لە گوینە: لەوانەیە، دەبێ

لە هارژیندا: هاواری کرد، زرمەی هات، تەقیەوە

لۆ: بۆ

لەکەرێ نادا لەکورتانی رەپەرەپە، (بەکەرێ ناوێرێ دەچتە زگ کورتانی)

لیژە: قۆریەپووش+گەڵاوگیای هەڵگیراو بۆمەڕومالأت بەکاردێت لەکاتی پێویستی زستان.

لە خۆی دەخەفتی: بایەخ بەخۆدان

لووشەلووش: مشەمشی ولآخ

لە دوورەوە بۆمن دێ ودەست دەکا بە لووشە لووش.

(شەوچەرە ل ٩١ تایەر حەوێزی)

لینگ: قاچ، ران، لۆق

لەبەر ماندوویەتی دێ پارەی لینگی لێ رادەکێشی.

(شەوچەرە ل١١٠ تایەر حەوێزی)

لینگ تیرۆك: لاق باریك، قاچ باریك

لەبن کەپری سەپانان دەباوات لێ بێ خەپلێ.

لەبن کەپری سەپانان

ترشی بەباینجانان

لێخەبەلێخە: قەیدی مالێخە (مستەقۆرتیلێ) خەتەری لێ، شەڕ دەقەو میلێ

لە هەموو مەنجەران ئەسکووە لەهەموو بوکان خەسووە

لۆ نەوسنم نی یە لۆ خەو

لینگەوگۆر: چەپ وڕاست بەهەڵە لەپێ بکرێ بۆ پێڵاو بەکاردێت

لاترقەوچ: نارێك، قیناچ یان دەڵێن لاتەرقەوچەل پێنچ

لەگەن: قاپێکی گەورە ومەیلەو قووڵ بوو لە مس دروست دەکرا وەکو ئاسنجاوی دیکە سپی دەکرایەوە

لغ لغەت بەسەری زمانی بکەویّ لغ لغەت لەسەری زمانی بێ

لەبەر خاتری چاوی تو نەبی ئەو ئیشە ناکەم.

لەبەر خاتری خاتران دەچمە سەر دینی کافران

لەرێی خوا: واتە لە راهی خوا

لەقورێت نێم، درۆ دەکەی

لەهەشێت نیم، درۆ دەکەی

لۆمەی عالەمێت لەسەر بێت

لەبەر زگی داکت هەرگیرێی واتە بمری

لەناو جێی بمری چینگزان بدەی

لە قوون دەرکان بکەویّ واتە (سواڵ بکەی وبێ جێ وڕێ بی)

لە قەبریش نەحەسێتەوە

لارەشەت لێ بدا، لا ڕەشەت لێ بێ

لووڕك: ژاڵە

لە خوێنی خۆتدا بگەوزێ

لێکدالێکدا: پەیتا پەیتا. بەردەوام

لەنگەری: سینییەکی دوو بەلەمی مس بەکاسە چوکلێت وشیرینی بۆ خۆشی وەك بووك و منداڵ بوون وخانوو کڕین دەبردرێتەوە

لاهۆزە: هەریەکە چەند سەر مەڕێك و بزنێکی هەبێ

لاس: تەپاڵە، سەرگین

لامل: سەرەڕۆ، عیناد، عەکس

لاجانگ: نێوان گوێ وچەنەگە

لاکەو: لاچۆ، بڕۆ ئەولاوە

لوا: خوری بەرگنی ساڵی مەڕ دەکرێتە لباد

لاق: قاچ

لە گچکان بپرسە، لەگەوران بترسە

لە کەرێ دابەزی، سواری گایان کرد، گا لەکەرێ کەرترە

لەنامەرد وابی شەڕ دوجار دەقەومێ

لۆ نەفسێم نییە، لۆ قەدرێمە

لۆی خوارمەکەوە

لێش، لەبەر مێش، ناچتە پێش

لێو لە ددانان لەپێشترە

لێی توند کردیە

لێی توورەیە

لێی تێکچووە

لەتامی بردیتە دەرێ

لەباتی ئەو بام

لەبنی دنیایێ کەس نابینیەوە

لەبەردی نەرمتر دەخوات، بەهەمووشتێك شوکرە

لەبەر قرچەی گەرمایە یە

لەوی دەقەومێ

لە هەراران لەبەیبوونان

سەرە هاتەوە سەر گورە روونان

هەژە: هەڵاڵە

سەرە: نۆرە

گوڕ: گوڵ

لە کنە خۆی پیاوە

له چاوی وی دەڵێی فڕووجە

لەهەر لایەك بابێ، ئەو شەنەی خۆی دەكا

له هیچ ناپوونگێتەوە. لەهیچ ناگەڕێتەوە

لەهیچیان کەم نەبوو

له یەخەی بۆوە: لەکۆڵی بۆوە، ڕزگاری بوو

لوسکەی ڕوباران: به گوێدرێژی خراپ دەڵێن

لوقمەکی چەورە

لووس وپووس: واتە مووی پێوە نییە وناسکە

لۆ چ قەومایە (بۆ (چی)قەوماوە)

لۆ چی بەدەست خۆتە

لۆم نەبی لەدنیایێ، چیت لێ بکەم له قیامەتێ

له گونیش بوو له گورچیلەش بوو

لەشۆپی وابی لای شاپێمە. لەشاپێ وابێ لای شۆپێمە، نازانن لەچرپوچوپپێمە.

له هەمو هەوران باران نابارێ

له دوژمنی خراپتر، نەزانیی خۆتە

لفار: لەلف لەفەوە رەنگە هاتبێ، قەپاڵ لفاری گەورەیە نەوسن چاوچنۆك

لەو گۆڕەی: له ختوخۆرایی

لەو گۆرەی تەشقەڵەی پێکردم

لا لووت: زویر، تورە. نیگەران

لێمشت: پڕاوپڕ—لێوان لێو

لەتەراق وتەسکەرەی بەم جنێوە مەگەر هەر کۆییەکان بزانن چ مانایەکی هەیە.

لەك وكورد ونۆرمزیار

بەنەعلەت بن هەزار جار

لەگەر دەلوی خەتاكار

پەندی کوردی: چیرۆکەکەی عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی

---

لە زستاندا لەکاتی بەفر بارین دا هەور بگرمێنێ دەڵێن

ئەو گرمەیە هەور دەڕووخێنێ. ئەو ساڵە بەفر زۆر دەبارێ

---

لەمە چێتر: جندۆکە

---

لەغەم: کونێك بەدرێژی وەك كارێز تونێلی بچووك قشلە قایم كرا بەناو ئەو لەغەمانە هامۆشۆیان کردییە ئەسباب لۆ قشڵەی چووە

ئەسباب: کەرەستە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل٢٢)

---

لە قوونی بێ موو دەگەرێ

---

لە داکمان دەپرسی، لەبابمان ناپرسی

---

لە پاش ترکردن، قون قوچاندن کەڵکی نییە

---

لە گایەك، چ بدەمە برایەك. لە مەلێك، هەر یەکە پەلێك

---

لەگەڵ مەڕ شین دەکات، لەگەڵ گورگ گۆشت دەخوات

---

لە حوشتر بڵندترە: لەشەکری شیرینترە: لە کونجی وردترە

(هەنجیر)ە و (توو)ە

---

لەنێو رەزی، هەر دەبەزی

(تەرزە)یە

---

لە دوور دێ، بە نور دێ. قەڵچەم کاڵم زلی سوور دێ

-تیشکی هەتاو-ە

---

لە حاکمی کوڕ، لە ژنی دەم شڕ، لەسەی دڕ لە تۆمەتی ژنان، لە هەرای مندارە ورتکان بترسە.

---

لـــــە هێلانـــــەی ســـــینەی گـــــەرم: تـــــەیری دڵـــــم هـــــەترە دەکـــــا

بژاردەیەك لە شیعرەکانی دلزار ئەحمەد دلزار.

---

لەتەقەلۆ هاتیتە دەرێ

واتە زۆر کولاو وگەیووە

لەبن ڕەگەوە دەری هێنا

لەبن جێی لێی کەوتییە

لەبیری خۆتی ببەوە

لەتامی بردیتە دەرێ

لەجیاتی ئەوبام

لەپەل وپۆ کەوتییە

لەبنی دنیایێ

لەترسان گووی بەخۆی دا کرد.

لافاو لەتنۆکی باران پەیدا دەبی

لای قازی، زۆران بازی

لە ئاوی خوڕ مەترسە. لەئاوی مەند بترسە

لەبێ خەبەران، کەشکەك سەڵاوات

لەسەرەوە زەوقە، لەخوارەوە تەوقە

لەتاو ئاگر، خۆی خستە ناو ئاو

لەتەڕ دەخوات ولەوشکی دەتڕێ

لەگەر (لەگەڵ) کۆر (کوێر)نان بخۆی خۆت وخوای خۆت

لەپڕێ، بووە کوڕێ

لەجێ گور (گوڵ) گور دەژێتەوە، لەجێی تودڕك، تودڕك

لەجێ یەك تف ڕۆکە. کەس بێزی نەبتەوە

لەو هەمووە ئاوەی داوە. قونپانی تەڕنەبووە

لە خۆت ڕازی بیت. زوو دەشکێی

لەخۆشیان هەر وردە تری لێ بەردەبوو

لەدەورەی ئەسحابان

کوڕگەورەترە لە بابان

لەدوای مردن رەحمەت باشە

لەژیان بترسە، لەمردن مەترسە

لەبن لێفەی بابی دەخەوی

لەسێ شت خۆت بپارێزە

١- دیواری رووخای (ڕووخاو)

٢- سەگی دڕ

٣- ژنی تەنیا

لەچاوی ژن دوو فرمێسک دێتە خوار، یەکیان خەمە یەکیان هەرخەرەتاندنە

لە ڕوباری وشك، ماسی دەگرێ

لە گەورەیی خوا، لەگەوجی ئەو

لەشێر ترسان عەیب نییە

لەکاتێکدا هەڵپەڕی، تڕ لەقوونیا دەرپەڕی

لەماری خەرکی مەردە

لەماری خۆی نامەردە

(مار: ماڵ)

(خەرك: خەڵك)

لەناعیلاجی سەر بەماری دوژمن دا دەکا

لەکاتی شەڕ، بیر لەئاشتی بکەوە

لەناو (کا) لەدەرزی دەگەڕێ

لەهەرچی ئاشە، کەچەر فەراشە

لەگەر نا ئەسلان، لەهیچ فەسلان، لەگەر ئەسلان هەموو فەسلان.

لێفەم بەسەر هەتیمان لانەبردییە

لوولەی تفەنگە ڕەش، مارمانی کردە چەند بەش

(مارمان: ماڵمان)

لەکن: لەلای

له دەورت گەڕێم: بەساقەت بم

لێم دەرپەڕی ولۆم هەڵپەڕی

لەبنی هەمبانەکەی د

لەخەڵکی عادەتە، لەمە عیبرەتە

له گایەکە کلکی، لۆ مەیە

لۆ مەیە: واتە بۆ ئێمەیە

لە زۆر زۆر ولەکەم کەم

لەو قوڕە هەر ئەوەندە تۆز هەردەستی

لۆی تێکەو چاوی لێکە

لەواشە: کەرێك بێ عار بێ شەویلاکیان دەبەستەوە بەوە یان دەگوت لەواشە

لاتریزە: ئەو شوێنەیە دەمانچەکەی پێوە شۆڕ دەبێتەوە لە لەشی مرۆڤ

(زاراوەسازی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٠٩)

دەشڵێن دەمانچەیەکی بەلاتریزەی قوونێوە بوو.

لە ئاخری پیری، جۆیان پێکرد بەتیری

لەدارستانان، داری خوار هەر دەبێ

لەدوای بۆرە، وەچاغ کوێرە

لە قوونی سەی سوار دەکا

سە: سەگ

سوار: سواڵ، دەرۆزە

لەبەر کچم، لۆ کێ بچم. لەبەر کوڕم هەڵدەپەڕم، کێو دەبڕم

لە هەردو ئاخوڕ دەلەوەڕێ

لە ئێخەی نۆرە گاڕانێ ببمەوە

لەماڵی نییە نانی شەوێ. کەچی سەیرانی دەوێ

لانك: بێشکە

لێدانی ئاسنی سارد بێ سوودە

لێره له چاکه ونەزاکەت گەڕێ. کوتەك له بەهەشت هاتۆته دەرێ

لەوه بترسه له خوا ناترسێ، له حەقی دۆست و ویژدان ناپرسێ

لەشی ساغ پاشایەتییه

لەگەڵ تری خۆی بەشەڕ دێت

لەگەڵ خۆ هەڵکێش خۆش باوەڕ مەبە

ئاڵتوون بەمەحەك پیاو بەتەجرەبە

لەگەڵ کلکی خۆی شەڕ دەکات

لەم دونیایەدا کەس بێ غەم نییە

ئەگەر بێ غەم بی بنیادەم نییه

لەنێرەکەر وایه ماکەر خاتوونه

لەهەر جێیەك ئاش هەبێت

پشیله فەراش دەبێت

لەبۆی خۆی نێرەکەرێکه

لەبزمار ونار (ناڵ)دەدات

لەناو لێفەی بابی نەترییه

لەمەیدانی شەڕ کەس دەنگی دەرنایه

کەدوژمن شکا زۆرکەس ئازایه

لەکانی ئاویان پرسی تور چیت وتی بابی روبارم

لەکۆتر وقەل بوو

لەسەرەوه ماشاڵڵا، لەبنەوه ناوەڵڵا

له هەولێر کۆنتره

لەکەری تۆپیو دەگەرێ (نار)ی ناڵ لێ بکاتەوه

لەحەفت ئاوی دایه قوونی تەڕ نەبووه

لەبنی کوودی دا

لەپیاوی بێ سفەت مەبووره. چونکه بێ نەمەکە لەوەفا دووره

**له ئاسمان لێت دەگەڕام، له عەردیم دەستم کەوتی**

---

**لەلە: خزمەتکار**

**چەند هەزار ماڵی کورد له بەغدایه لەساڵێ دەرکران**

**چەند هەزار منداڵ وئافرەت بوونه فاحیشه ولەلە**

**(ڕۆستەم حەوێزی-نەورۆزی ساڵی ۱۹۷۳)**

---

**لو: گرێ**

---

**لار: لاڵ**

---

**لۆچ: چرچ**

---

**لەدووردان: نازپێدانی لەڕادەبەر**

---

**لۆمە: گلەیی**

---

**لچ: بەشی خوارەوەی دەم، واته سەروی چەنگه**

---

**لێ ڕسکا: لێ پەیدابوو**

---

**له خودای گچکەترە، لەپێغەمبەر گەورەترە**

**(قورئان)ە**

---

**لەهەمووشت رەقترە، لەهەموو شت نەرمترە**

**(زمان)ە**

**(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٠)**

---

**له دەرێ ڕەشە، دوایی سورە، فرێی دەدەی سپی یه**

**(ڕەژوو-خەڵووز)ە**

---

**لەناو ئاوێ دەپەڕێتەوە لاقی تەڕنابێ**

**(منداڵ لەناو سکی دایکی)**

---

**له ئاسمان نەرمۆکە، دەبارێ (بەفر)ۆکە**

**(ئارد وهێلەگ)ە**

**(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٣)**

---

**له هەنگوین خۆشترە، لەشاخی قورسترە**

---

(خەو)ە

لەهەموو کەس بێ کەسترە، لەهەموو کەسیش بەتوانا ترە

(خوا)یە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٢)

لەناو دروست دەبێ بەناویش دەڕوا

(خێ-خوێ)یە

لێو دارۆکەی ناوچەرمۆکە

تیتل وپیتل وزرزۆکە

(دەف)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٣)

لەدایك دەبێ زەردە، کەپیر بوو زەردە

(گەنم)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٣)

لەبەر دەستە وقەت ناگیرێ

(سێبەر)ە

لەئاگری دەبێ ناسووتێ، لەئاوێ دەبێ تەڕنابێ

(سێبەر)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٣)

لەنێوان ئەرد وئاسمان چی هەیە

(پیتی واو)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٤)

لەسەر ڕینگ دەڕوا

لە دەرکەی خەڵکی بدەی لە دەرکەت دەدەنەوە

لالە: چرایە

گوڵە نیانە

لەیەك شەو داسە، بەدوو شەو ئەڵماسە، بەسێ شەوی خڕ باشە (مانگ)ە

لۆ خۆی مردییە، هەموو دونیای لەبەر دەستە

(خامە-قەڵەم)ە

---

لوورە: ئەو زەوییەیە کە چەند ساڵێك نەکێڵدراوە پاش باران پەڵە دەکێڵدرێت دەکرێتە گەنم وجۆ زەوییەکەی بەپیت.

(گوندی قازبەگیان-ئازاد قازبەگیان ل١٢)

---

لێمان بۆتە ردێن بەگوو

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل١٥٤)

---

لە هەموو دیزان ئەسکوە، لەهەموو بووکان خەسووە

---

لەسواری هەوێك، لەزستان شەوێك

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٤٤)

---

لە خواردیان بوو، لەکردیان نەبوو

---

لەجێی شاباران، کۆرکۆرە وازان

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٤١)

---

لۆ توو خاتوونە، لۆ من مەیموونە

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٣٧)

---

لە قوونی خۆی نا: شاردییەوە، هەڵی گرت، لەکن خۆی دانا

---

لۆق: لاق، هەنگاو

هەند لۆقی درێژە نایگەمێ

---

لێکوپێکی کردەوە: لەبەریەکدی هەڵوەشاند

---

لەسەری دانا: خستیە سەر ئاگر، لێی نا

---

لەچەر: حسود

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٨)

---

لەخۆید: چمناً، بحد ژاتە

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٩)

---

لاری: میلان

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٩)

---

لپرلپر: ژنێکی دەموچاو لپرلپری بەخۆوە بوو، پەڵەپەڵە

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

لگەن: لەگەن بە قاپی گەورەی مس و فافۆن دەگوترێ. (ئەوەی بێتە ناو لگەنێ، ناچتەوە ناو مەنجەڕێ)

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

لەتەقەلۆ دەرهاتن: کە یەکێ ئاوی گەرمی پێدا بڕژێ وبسوتێ وپێستەکەی لەسەر دابماڵدرێ، دەڵێن لە تەقەلۆ دەرهاتیە

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

لوا: بەرگن، کە بۆ یەکەمجار بەرخ دەبڕێتەوە پێی دەگوترێ (لوا)، ساڵی دواتر کە بپڕدرێتەوە پێی دەگوترێ (رونگ). پاش دوو ساڵان دەبێتە خوری.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

لۆلکە: لە ئاردو رۆن دروستدەکرا (چییە هەر ساتمەی دەکەی و بەردەبیەوە، دەڵێی لۆلکەت خوالادییە پێموایە جاران لۆ ئەو ژنانە دروستدەکرا کە تازە منداڵیان دەبوو).

پەند: پیرێژنێ سەر بانی، لۆلکەی دەخوا بە نانی.

(فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە-هەژار موکریانی)

---

لاق تیتر واسك

---

لە کۆیە مەلا فەتاحی جەلیزادە هەبووە بەڕێوبەری کارەبای کۆیە، پیاوێکی دڵسۆز و بەپەرۆش بووە بۆ کارەبایەکەی جا هەر کارەبا بکوژاباوە، خەڵکی کۆیە جنێویان بە مەلا فەتاح دەدا، کارەبا لە موسڵ وبەغداد بەندیخانەی موسەیب کوژاوەتەوە کۆیی لێ بووە ڕاست جنێوێکی بە مەلا فاتح داوە.

---

لە چەم دار ڕاستیش هەست، دار جەقیش هەست

(سێگردکان وسێبەر ونشینەکانی-ئاراس ئینجاخی ل٢٤)

---

لە گۆمەڵگایەك بێ ڕێزی بەرامبەر مرۆڤ بکرێ، ئەستەمە ڕێگری لە کوشتنی سەگ بگرێ

(د.کەمال مەعروف)

---

لەکاتبەدەر تاکاتبەدەر: ئەزەل وئەبەد

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٤٥)

---

لێتۆژ: محقق

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٠٤)

---

لیوەن: ارج رسوبیە

زەوییەکی بەرۆخی رووباری گەورە وزێ لەلیوەدا پەیدابووبێ ڕاستانێکە پێی دەڵێن (ڕەن)

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٢٩)

---

لایەنچی: متحیز

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٥٩)

---

لێڕەوان: خەبیری غابات

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٦٠)

---

لە توتنەوانێکم پرسی بۆچی ئەو هەموو شێن وردەی بەردەم توتنەوە چاندووە، پێی گوتمەوە: چی ئەوتۆ نین، دووقلە ماشیلکەیە، لاتێك ترۆزیلکەیە وسێ چوار خەتە تەماتیلکە ونەختێکیش شووتیلکەیە بۆ منداڵەکان.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٦٦)

---

لەباوەڕدا سەختۆلە. لەکردەوەدا نەرمۆلە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٦٧)

---

لێکدڕ: المقاد

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٤٨)

---

لە تەشکیلی حکومەتی عێراق-لەمەجلیس تەئسیسی لەم جەلیسەیە غەیرە ڕەسمی بەیارانم وت: عەحابیە ئەقوامی دی، شەڕ لەسەر موڵکیانە، ئێمە کە کوردین شەڕ لەسەر ماڵ وموڵك ونەسەبمانە

(بیرەوەری وروانینەکانی (مەلای گەورە) کۆکردنەوە ورێکخستن وپەراوێزی هێمن عومەر خۆشناو ل٤١)

---

لەم ڕۆژگارەدا نوسین پەیدابوون ئەوەندە بێ باکن لە ئاست ڕاستی دا بەجۆرێك تەنگ بەئینساف ومێژووی هەقیقەت هەڵدەچنن

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٢٨)

---

لەوانەیە موریدێك خۆی بە قوربانی شێخێك بکا، بەڵام گیسکێك بەقوربانی وڵاتەکەی ناکات

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٢٩)

---

لەتاو سوێی دوا کەوتوویی وتێکشانی (٢٧٠٠) ساڵەی کورد، لەناو دۆزینەوەی ئەو هەموو جادووبازانەی، وا لەنەتەوەیەك دەکەن، مەرگ بەسەر ژیندا زاڵبێ، بەدەستی خۆی، بەردی بناغەی خانوەکەی دەربێنێ وبۆشەڕی براکوژیی، پێشمەرگەکەی لەجاشەکەی چالاکتربێ، مێشکۆڵەی نیو ئێسقان دەسووتێ، مرۆ گێژ دەبێ، گرێی پەنجە لەکاردەکەوێ، چرای مێشك دەکوژێتەوە، دڵ کوێر دەبێ وئەندێشە خاو دەبێتەوە

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٩)

---

لەمرۆڤ ڕادەبینم بگاتە زانینی ئەوەی پێی دەگوترێت جیهانی مادده وماددەگەرایی

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٣)

---

لەوەتی خۆم ناسیوە بەکەسم نەگوتووە فلانە ڕێگە بگرەبەر، ئەوپەڕی ڕێنمایی لە منەوە دەرکەوتبێ ئەوەبووە گوتوومە من لە جیاتی تۆ بومایە وەها و وەهام دەکرد، خۆشت خاوەن بڕیاریت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٤٨)

---

لەگەڵێك حاڵ وباردا نەفس وزاتی وەها هەیە بەهیچ جۆرە ئیقناع کردنێك واز لەباوەڕەکەی ناهێنێت

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٩)

---

لەئاسمان هەیە، لەزەویدا نییە

(پیتی (س))ە

---

لەقرنێکدا یەکجار دەبیندرێ، لەدەقیقەیەکدا دووجار دەبیندرێ (پیتی (ق))ە

---

لەگوند وشارە، ددان دارە، وەك مشارە، هەردوو دیوی بەکارە، دەفرۆشرێ بەپارە

(شانە)یە (شە)یە

---

لەبەرد دروست دەکرێ، بە بەردیش دەشکێ

(شووشە)یە

---

لەچاوی وی بەحەوت ئاوان شوورایتەوە

(وی: ئەو)

---

لە ئاشی، ئارداوی دەبی

---

لەپاش مردیان درۆ دەکرێ

---

لچ ولێوی لێ هەڵدێنێ

---

لەگەڵ خۆم دەڵێمەوە: ئەگەر دین ئەمری کرد بایەبە دامەزراندنی حکومەت وەکو فەرزێکی حەج ونوێژ کوردەکە لەوانەبوو دەرفەتی بۆ بدۆزیبایەوە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٩٥)

---

لەنرخاندنی دەنگ، چ قورئان چ گۆرانی چ مۆزیقا هەستیارییەکەم لەحەد بەدەرە، بەو پێیە گوێگرێکی دەنگناسم.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٢٨)

لۆ خۆت مەشکەی خۆت نەژەنی، ناژەنێ

(لۆ: بۆ)

---

لۆ خۆی ئیشی خۆی زیاد دەکات

(لۆ: بۆ)

---

لەمانگی ئاداریێ، سەری داریێ وبنی داریێ، تێر دەخواتن داکی کاریێ.

---

لەچاوی منت کەوی

---

لەگۆشـەی حەقیقـەتی ڕووتـەوە. گوتوومـە هـەتا گـەلێك گیـانی سیاسـی (واتـە حکومەت)ی نەبێ جاریێ لەپزدانی. مێژوو وأیە ونەبۆتە منداڵی تازە مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٣٧)

---

لە ئەمریکادا، نەبوو دۆستانە تێکەڵ بەکێشەی بەرنامەی مەسەلەی کورد بێت

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٧٨)

---

لۆ سەلاحێ ناکەی، ئەمە بۆ تەشقەلە وسەروتای شەڕ بەکار دەهێندرا.

---

لەبن پەڕی هەور وساماران بێ، دەیبینمەوە.

(سامار: سامان)

---

لێخوڕە دەشتە

---

لێدەن لە حەوشی گەورە، یاپراخە و دوونگی چەورە

---

لێم چۆتە داری لەعنەتی

---

لێم چۆتە داریێ، نایەتە خواریێ

---

لێی بووە بە کوردە ناموسی

---

لە ئاووهەوای خۆیایەتی

---

لە ڕقی دراوسیێ قونی مندارەکەی خۆی دەدڕێنێ

---

لە شەڕا شەریکم، لە خێرا تەریکم

---

لە شەڕا هەر ناوبژیکەر تیا چووە

---

لە شیری بەری دایکی حەڵا ڵترە

---

لەگەڵ بەرخ بنوو، لەگەڵ چۆلەکە هەستە

---

لینگەگا: لەسەردەمی کۆندا جووت کردن وزەوی کێڵان بەگاجووت دەکرا جوتیار هەبوو یەك گای هەبوو وە تواناشی نەبوو گایەکی تر بکڕێ ئینجا لەگەڵ کەسێکی تر کە ئەویش یەك گای هەبوایە ڕێك دەکەوتن وهەردووك گایەکانیان دەهاویشتە سەر یەك وجووتەگا دروست دەبوو ئینجا هەر ڕۆژەی یەکێکیان جووتی بەگایەکان دەکرد هەتاکو هەردوکیان جووتی خۆیانیان پێ جێبەجێ دەکرد کە دیارە ئەك کارە کارێکی تەبایی وباش بووە.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل۲۹)

---

لابار: ئەگەر یەکێك لەگوندێك گوێدرێژی نەبایە بۆ دارهێنان وتوانای کرینیشی نەبا ئەوە لەگەڵ کەسێکی خاوەن گوێدرێژ ڕێك دەکەوت وگوێدرێژەکەی لێ وەردەگرت بۆ دارهێنان بەو پڕیارە ڕۆژێك بارە دارەکە بۆ خاوەنی گوێ درێژەکەو ڕۆژێکیش بۆ کابرای دارکێش بێ بەو شێوەیە کاری هەردووکیان ڕەها دەبوو.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل۲۹)

---

لاوك: لاوك وەکو چیرۆك وایە لەسەر شەڕو بەسەرهاتێك دەگوترێ

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل۱۱٦)

---

لووشمە: لووشماندن

کاتێك کە گووێ درێژ وئێستر برسیان دەبێ کە هەستی کەسێکیان کرد دەست دەکەن بە لووشمە لووشم واتا داوای ئالیك دەکەن، بەلاّم ولاّخەبەرزە نالووشمێنێ بەڵکو دەست دەکات بەحیلەحیل بەنەرمی.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل۱۰٤)

---

لەنوختەنەزەری هەلأیسانی شەڕەوە، لە کۆنەوە بۆ نوێ . گۆڕانی زۆر و بنەڕەتییان بەسەردا هاتووە: (۱ ـەیەکتر بەسترانەوەی پێوە ندییەکانی نێوان دەوڵەتان و (۲) وشاری ئابووری بۆ سەر سیاسەتی دەوڵەت و (۳) دەنگی میللەتە پێشکەوتووەکان لە سەروبەری کاری دەوڵەت و (٤) هەستیاریی بیروڕای جیهانی لە ئاست هێرشی ناڕەوا و (٥) تەجرەبەی تێشکانی بە شێك لەو هێرشانەی دوای سەرکەوتن ڕوویان دا

(ژیان وجیهانبینی-مەسعود محمەد-ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی)

لۆ خۆمان نابێتە نان، لۆ خەڵقی دەبێتە ناسکە نان.

لەبێ کەسی، ئەتۆم بەسی.

لەپێشەوە دەڵێ: جانەجانە، لەپشتەوە کونان دەکا لەمەرجانە.

لەگەڵ عاقڵان هەروە سەربانێ. لەگەڵ بێ عەقڵان هەروە ناوخانێ.

لەگەڵ ناکەسدا مەچۆرە جەواڵ. بانەڕوا عومرت حەتاڵ وبەتاڵ.

لۆ فەقیری یا دارستان یا شارستان.

(لۆ: بۆ)

لە زۆر ژیاوان مەپرسە، لەزۆر گەڕاوان بپرسە.

لەسوار چاکی نییە، ئەسپ هەری گرتیە.

لە شەیتانیش، شەیتانترە.

لەگەر خەرکیدا، سەلام وعەلەیکی نییە

لەگەر دۆستان، دۆستایەتی، لەگەر دوژمن، دوژمنایەتی.

لە کیسەی پاشا دەبەخشێ.

لە هەڵبژاردنی برادەر لەسەر خۆ بە، لۆ گۆڕینەوەشی لەسەر خۆ بە.

لەقەی مانگا ئێشی نییە.

لێدەدا وهاواریش دەکا.

لەبەر چاومە خەریکی تیرین، سەرەکەی ڕەشە وناویان شیرین.

(ئافرەتێك ناو شیرین)

لەخۆشیدا وێنەی نییە، کەس ناشی خوات، دەسا چییە؟

(ماچ)

لەدەستان خۆشە داماوە، پێمی بڵێ کە چی ناوە.

(تەزبیح)

لەزەمانی حەزرەتی عەکاشە. پاژنەی پەنجەی لە پاشە.

(کوللە: کلۆ).

لەفیل گەورەترە، لەسێو گچکەترە، لەڕۆنی چەورترە.

(گوز: گوێز)

---

لێفە شڕێک بەحەواوە. بەملیۆن پینەی پێدا دراوە.

(پرد)

---

لۆکەی لەناو گێی نایە.

(گێ: گوێ)

---

لەپێش لەدایکبوونی شەیتان لەدایکبووە.

---

لەترسی جۆتی، بۆتە حوشتر

---

لە خوام داوایە.

---

لە ناوچەوانی ڕا دیارە.

---

لەوی لۆیان مایتەوە.

---

لۆی پان دەکاتەوە.

---

لینگە دەستاڕەکی لەسەردانێ.

---

لەکن خوای بزر نابی

---

لەکن: لەلای

---

لە فۆلکلۆری کوردی جەنابی شێخ محەمەدی خاڵ لە ڕاپۆرتەکەیدا نوسیبووی (کوردییەکەی ڕەکیکە)یەعنی بە زمانی (سلێمانی)نییە...نازانم فۆلکلۆریش ڕەکیکە، ئەگەر بە (وانێ)و (بی بەرمێ)نەبێت؟ ئەوە خۆت بۆمی ساغ بکەرەوانێ!!

(محەمەد تۆفیق ووردی)

گۆڤاری رامان ژمارە (٢٦٩) سالی ٢٠١٩ نامەیەکی م.محەمەد تۆفیق ووردی بۆ م.تاهیر ئەحمەد حەوێزی

---

لات لێدان: واتا خەت لێدان ودیاریکردنی عەرد بۆ تۆودان وکێلان.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٣١)

---

لێراو: ئاو لە قۆناغی پێش بەستن، ئەو ئاوەی پڕ لە وردە بەفرە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٨)

---

لچکردن: واتا چلێسکردن، یان دەستەمۆکردنی مەڕوبزن بەهۆی پێدانی پەلکەنان بەهەندێك ئاژەڵی بەرچاو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٦)

---

لاباسك: واتا تێکەڵکردنی پەزی دوو ماڵ وکوڕی یەکێك لە ماڵەکان دەبێتە شوانی هەردوو ماڵان.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٨٩)

لاباسك: تێکەڵکردنی دوو مێگەلە بەرخ، لەگەڵ پێچەوانەی دایکی خۆیان هەتا نەیانمژن.

---

لاپرەسەنگ: ناهاوسەنگ

---

لاتەریك: دوورەپەرێز

---

لاڕەشە: شێرپەنجە، تیراوە، نەخۆشیەکە

---

لاکە: ماندوو، بەلاکەلاك دەڕۆیی

---

لاکەی لێوەدێ: زۆر ماندوو بووە، بەلادادێ

---

لاکێل: لاکێل ئەو زەویەیە کە جووتیار دەیکێلێ وبەجێی دەێلی

---

لاوژە: ڕەنگی ئاوزەنگۆلە.

---

لاوونیو: بەخواری لەلایەکی ڕا، تەماشاکردن بە توڕەیی

---

لەبای غارێ: لەبەردەوامی هەڵاتن

---

لەخمێت نێم: واتا درۆیە یان لەدرۆت نێم.

---

لەکنەخۆی وابی: بەناو

---

لەلای هێروە: لەسەرەتاوە

---

لێکرا: لەناکاو، کتوپڕ.

---

لرفی کرد: هەرچی هەبوو زۆر بەخێرایی خواردی ونەیدەجوو

---

لولاق: گۆزینگ تا چۆك

---

لۆچاندن: وشك بوونی توێکڵە سەوزەکەی گوێز

---

لیس: شوێنی حەوانەوەی کۆتر

---

لەزەواتی نابوو: واتا گوشاری زۆری لێ کردووە.

---

لە رێگەی ڕاست لامەدەن ڕێ یەکە نابێ بە دوو.

مەلای گەورەی کۆیە دەڵێ:

بەقسەی جاهیلی نەفاد بەمەکرێ شێخی جادوو

لە رێگەی ڕاست لامەدەن ڕێ یەکە نابێ بە دوو

---

لاس: ناوی دارێکی بەردارە و بەرەکەی لە شێوەی قەسپی وشکە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٨)

---

لابیان: خانووی بەلابیان، ئەو جۆرە خانووە بوو کە بەلابیان دروستدەکرا واتا هۆدەیەکی گەورە وهۆدەیەکی بچووك لێکدەدران ودەرگەیان لەنێو یەکتری بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٥)

---

لەواشە: ئەو ئامێرەیە لە کاتی کەر نانکردندا، کەری پێ بەرزەفت دەکرێ. جۆرە نانێکیشە بە فارسی پێیدەڵێن (نان لواشی).

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٦٤)

---

لوورەی سەگ: ئەگەر سەگان شەوان بیانلووراندبابە، دەیانگوت عزرائیل لەنێو ناوەیە وداخوا ڕووحی کێ دەکێشێ بۆیە لنگە پێلاوێکیان دەخوون دەکردەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٠٠)

---

لەکوێ بێ بۆنی جزە لەوێش مێشان گزەگزە.

شمشێرە: شەپکەدارێکی قۆرت قۆرت بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٦)

---

لاسەرە: جۆرە خشڵێکی بەپلپلە بوو بەلاسەری ڕاستیانەوە دەکرد.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٤)

---

لوولە: سێ لوولەی پێوە بوو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٤٦)

لۆ ئارەزوو وحەز+دنیا دەکەین گەز.

---

لۆ ئیمام حوسەین ناگری+لۆ چێشتەکەی خۆی دەگری.

---

لۆ تیکەیە نان بمری+پێت نادات وبۆت دەگری.

---

لۆ خواردن هارە+لۆ کار بیمارە.

---

لۆ دارا ژنی چاوکاڵ+ لۆ هەژار کۆشێ مناڵ.

---

لۆ دزی خۆماڵ+درگا کراوە وبەتاڵ.

---

لۆ دژمن یەك بین+نەك دژی یەك بین.

---

لۆ سەگی دڕ+ڕاوەستە وەك کوڕ.

---

لۆ شتی بەنرخ+خۆشی دەکەین مرخ

---

لۆ فەقیر، ڕۆژ دەبێ بە ساڵ+سکیش دەبێ بەجەواڵ.

---

بۆرە نەبوو بازە بێ، یەکێ تەڕو تازە بێ.

---

لۆ شیوەن پوورە+لۆ شایی دوورە.

---

لۆ کچ، یامردن+یا شووکردن.

---

لابدەی لە ڕێ دڕکت پیا دەچێ.

لاف لە غەریبی و تڕ لە بیاوان.

---

لافاو خوشکەزای دەبرد+خاڵۆ کێو ماڵی دەکرد.

---

لاکی کەرو دیانی سەگ+نە ئێزگ دەمێنێ و نە ڕەنگ.

---

لانه و خانه، بۆ ڕووخانه.

لاوان بدەن ڕەنج ڕۆژێ دەیبەن گەنج.

لای خوا ڕوو ڕەش+ لای خەڵك بێ بەش.

لای خەڵکی پەسە+لای من ئەتڵەسە.

لای دووپشك و مار+ دەچێژێ ئازار.

لای دز وەهایە هەموو کەس دزە.

لای قەسابخانە، سەیرانگای سەگانە.

لقی مێوە دار، سەر لەسەر زەویە.

لیگی جووت کردووە

لۆتی بەزەبری داری+ مەیموون دەخاتە یاری.

لۆمەی خزم لە شەقی دژمن خراپ ترە.

لەسەر خۆش بگەڕێ+ لۆ خۆی دەکەوێ.

لە باران ڕایکرد، تووشی تەرزە بوو.

لەبازاڕا ئیعتیبار+باشە وەك زێڕ و دینار.

لەبرسا بمرە+ منەت هەڵمە گرە.

لەبری قەرز+ کەری کاروان گل دەداتەوە.

لە بێخەبەران کەشکێك سڵاوات.

لەبەر بادا ئارد مە بێژە

لە بەر دووکەڵی کەس دامەنێشە.

لە بەر قسەی داخ، گوێچکە نابێ چاخ.

لەبەر کونی مارا مەخەوە.

لەبەر نان و ئاو، دەکەوینە داو.

لەبەرد و دار+ شت دەکا سوار.

لەبەردی سەرکێو، نابێ سەرە مێو.

له بەرزای کێو نه ترسی دەگەیته لووتکە.

لە بەرۆ شێخە + لەدواوە تێخە.

لە بەهارا ئاشی وا لەکارا.

لە بەهاری نە هاتوو+لە کەوی نەگرتوو.

لەپاش هاتوو چوو+چووە جێی پێشوو.

لەپاش، ملە لۆمەی خەڵکت کرد، حەیای خۆتت برد.

لە تۆ حەرەکەت+ لە خوا بەرەکەت.

لە تەنگانە خزم و یار+ دەبن بە دووپشك و مار.

لە جوانیدا هەژارە +لە پیری دا سالارە.

لە جێگە ی باگر، چرا ناگرێ.

لە جێگەی پڵاو+ ترش دەکاتە ئاو.

لە چیای مەزن +تا بزن و هەرزن.

لە حەوت ئاسمانا ئەستێرەیەکی نیە

لە خوارەوە دانانیشم و لە سەرەوەش جێم ناکەنەوە.

لە خوازبێنی دا، پێیاندای مەنازە. پیان نەدای بسازە.

لە خوری تیزگیك+ لە ڕۆنیش نیزگیك.

لە خۆشی چێشت+ باوکی جێهێشت.

لە دڵی خاوێنەوە+ڕاشتی دەلاوێنەوە.

لە دێدا شەڕەو داپیرە کەڕە.

لە زۆر پیاوی ئازاو دلێر+ جێ دەمێنێ کوڕی بێ خێر.

لە سەگی نهێنگر بترسە.

لە مەنجەڵیکدا بیان کوڵێنە، پێکەوە ناکوڵێن.

لە قەلەقی فەقیر+ مار دەخاتە گیر

لە قوونی کەرێ+هاتوویتە دەرێ

له قوڕگیدا، دەری دەهێنێتەوە.

له قیامەتا، له ڕیش ناپرسن.

له قەند تاڵتر و له گوڵ کاڵتری پێ ناڵێ.

لەکاتی تەنگانەدا، قەوم و قەرزی کۆن دێنەوە یادت.

لەکاتی سواری بیری پیادە دەکات.

لەکاتی شیر و پەنیر، بیرێ بکە له فەقیر

لەکار ترسای ناکرێ، لەبار ترسای نابرێ.

له کوورە دا، بەرد دەکەن بە شووشە.

له کڵ دەرهاتووە.

له کەف و کوڵ نیشتەوە.

له گاڕان، گای قەش دیارە.

له گووکەر وایە ئەم عالەمە سەیری دەکا.

له گڕی جوان، خەڵوورو خۆڵکەوە جێ دەمێنێ.

له مارگاز، له مشک باز

له ماڵی تووڕە، له دەرێ تووڕە.

له نەتاشراو، دەتاشی

له ڕقا شت بشکێنی، هەقی له خۆت دەسێنی.

له ڕۆژی ڕەش (تەنگانە)، دەردەکەوێ خزم و بێگانە.

له ڕەنجی دەست، کۆڵی هەڵبەست.

له هەر باخێکا گوڵ پەروەردە دەبێ.

له هەر جێگایەك نان و نەمەکت خوارد، نەمەك دان مەشکێنە.

لەهەر جێیەك پشیلە بمیاوێنێ، مشك ناجیکێنێ.

لەهەر شوێنێ مریشك هەبێ، ڕێویش هەیە.

لەهەر کوێوە بڕوات، شوێنی خۆی دیاری دەکات.

لە هەراو قرە، خۆت دابرە.

لە هەر کوێ قڕی، خۆشی تیا فڕی.

لە هەموو گیانیا گوێی ساخە، ئەویش دوو کونی تیایە.

لە یاسای شێواودا هەق وندەبێ.

لە بەر بێ کەسی تۆم کردەوە بەکەس.

لەبەردڵانی؟+لەسەر دڵان.

لەبەر نەوست، دەبڕن لەوست.

لە بەرزایی دەلەرزی؟+سەر بکەوی بەد تەرزی.

لە ترکەن وایە دنیا دەی بیسێ.

لە دز مایەوە هەرچی+خێرا بیدەن بە فاڵچی.

لەدوای گژەبا، باران دەبارێ.

لەدەر، شەردەکا+لەماڵ گەڕ دەکا

لەرزانە خۆی ناگرێ+چۆن سەر رادەگرێ.

لەزستانا تانیوەڕۆ+ڕێگا ببڕەو ئیتر مەڕۆ.

لەسەر مناڵان+گەورە تێک ئاڵان.

لەش بە ئازارە+لێوی بە بارە.

لەش و ئەقڵ ودڵ، ساخە+خاوەنی بەدەماخە.

لەشێت هەڵهاتن، شێتیە.

لەگەڵ پیشۆکە+دەردێ عەمرۆکە

لەگەڵ تەڵادێ+بەڵادێ.

لەگەڵ سەگا شەڕ دەکا و لەگەڵ گوورگیش گۆشتە خوا.

لەگەڵ گوڵا، گوڵ بەو، لەگەڵ دڕکیشا، دڕک.

لەگەڵ ورچیشدا دەژیی.

لەگەڵ خودا شەڕ ناکرێ.

لەگەڵ سەگا حەپەحەپ+لەگەڵ کەروێشك خەپەخەپ.

لەگەڵ کوڕان لە لەشکرە+لەگەڵ کیژانیش حازرە.

لەکەڵ کەسیٚ ببە بە شوان+هەر وەکو تۆ بێتە کەوان.

لەگەڵ نەزانا بەهەشت ناخۆشە.

لەلای ترۆ، لێدە بڕۆ

لەم دنیادا، هەر کەر. کەر نیە.

لەمن چووەتە پشت کێوی قاف.

لەو هەموو کەسە+هەر تۆمان بەسە.

لەڕۆستەم هاوار +لەدژمن فێرار.

لێرە بم یا لە شیراز+بەشم نانی وشکەو پیاز.

لێرە لۆم بکەرە تەشت -لەولا مەم بەرە بەهەشت.

لێرە دەرکرا+لەویٚ سەرخرا.

لێفێکی نیە قاچی تێکێشیٚ.

لێفە لەسەر هەتیوو لامەدە.

لێمان چووەتە سەر دارێکی بەرز.

لیٚ ی بقەومیٚ بەجەرگ+ناترسیٚ لەمەرگ.

لەگەڵ هەموو کەس. هەتا دەتوانی

کردەوەت باشبیٚ، ئەو کاتە جوانی.

(محەمەد دارپاس: هەندیٚ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

لەگەڵ هاوسێکان، هەر نەرم ونیان بە

دۆست ودڵسۆزی، بەدڵ وگیان بە.

(محەمەد دارپاس: هەندیٚ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

لەسەر ئاو ئاگر دەکاتەوە.

لەهەوای بەری، دایتی لەسەری

لە وەختی تەنگانەدا، قەرزی کۆن وخزمی دوور بەیاد دەکرێن.

لە ئاردی بەڕوو، نانی گەنم دروست ناکرێت.

لەدەما هار و لەقەلبا بیمار.

لەحەوت ئاسمانان ئەستێرەیەکی نییە

لەشێست گەز مێزەر، کراسێکی لۆ من تێدا نەبوو.

لەسەرەوە یارە، لەبنەوە مارە.

لەحەت ئاشان، دەنکە جۆیەکی نییە.

لەپەریان دەبێ وەلی، لە وەلیان دەبێ پەری.

لەوەلیان دەبێ فاسسق لە فاسقان دەبێ وەلی

لە کەرێکی دەگەڕێ، نارێکی پێوەبێ

لەدار لە پەردوو، لەعنەت لە هەردوو.

لۆخۆی ڕووتە، لۆ خەرکی پووتە.

لبادی لەبەر نەقیزەی دەرهینا.

لە پارەی خەرکی بپرسیت، چاوت تێر نابێ تا دەمری برسیت.

لە قوون ماران گەورە بووە.

لەلێفەی باوکی خۆی نەترپوە.

لەملا چیچی لەولا چیچی، دەڵێی حیزی مایەپووچی.

لە ئاسمانم دەویستی، لەزەویانم دەست کەوتی.

حەقدار لە حەقی خۆی وازی دێنێ شاهید واز ناهێنێ.

لەچەقۆ گەڕایەوە.

لەدەستی ئیزرائیل دەرچوو.

لەسەری مەڕۆ.

لێوی بەددانی نازانێ.

لە ترسان تڕی بە تڕی ڕاناگات.

لەبەر گورگ، مەڕداری. تەرك ناكرێ.

لەباری ناعیلاجی، بە ماكەر دەرێ: باجی.

لە گەورە گەورەی پشدەرێ، هۆمان كەوتە قوونی كەرێ.

لەكێرم ولەگونم سەرپشك بە، كامیان دەگری بیگرە.

نە شەرع لەگەر مەلای. نە (قسە) لەگەر ئاغای.

لەتام دەری كردیە.

لە بێ ژن وایە، ژندار نان وقوز دەخوات.

لە قوڕێت نێم.

لەسەری نەڕۆین.

لەحەیفی خەركی قوونی منداری خۆی دەدڕێنێ!.

لەبنەوە هەی دەكا، لەسەرەوە دەی دەكا.

لەگەر شاخی قسە ناكرێ.

لۆمەی عەبدی لە عەزابی قەبری گرانترە.

نە خۆی خواردی، نەقۆناغی، سەگان خواردیان بوو بە داغی.

لۆ بابیشی عاقر كرد (لۆ: بۆ)

لەماریا نییە دەنكە برویشێ، قوزی بێ دەرپێ چۆپی ئەكێشێ!.

لەدوای حەفت خوشكان بووە.

لۆ دەرمانیش دەست ناكەوێ.

لە مێژبوو دیار نەبووی

لە عەرزەكە جودا نەبویتەوە.

نە خۆخ دارە، نە نەرگز بەهارە.

لە گووی خۆیدا گێرە دەكات.

لاقی عەرزی نەدەگرت

لەپاش ئەو غەمەش، ڕۆژ دەبێتەوە.

---

لەسەرخۆش گەڕێ، لۆخۆی دەکەوێ.

---

لەزارت دەرێ، بای بەرێ.

---

لەدوای تاریکی، ڕۆشناییە.

---

لەقوونی دنیای بردیە.

---

لێوی خۆی کرۆشت.

---

لەبەختەکەی خۆم وا ڕادەبینم. بچمە سەر (زێ یە) هیچ ئاو نابینم.

---

نە سەرم بشکێنە، نە ڕیشم بە شانە کە.

---

لە عەباداران مەترسە، لەشەدەلاران بترسە.

---

لەبەر گورگ بترسێ، مەڕداری ناکات.

---

لەسەرەوە جێی نییە، بەخوارەوەش قاییل نییە.

---

لەسەگی دڕ، لە حاکمی کوڕ، لە ژنی دەم شڕ بترسە.

---

لۆجەرگ وهەناوی مەڕێك مردار دەکاتەوە.

---

لەعنەت لە بەختی شڕم، کوڕی کەس نابێ بە کوڕم.

---

دوو ژن حەمامێکە، دوو کەر گاڕانێکە.

---

لە کانی و ئاویان پرسی تۆ جیت؟ وتی: من

باوکی ڕووبارم.

---

لە کفری فیرعەون مەشهوورترە

لە کوێستان، بێستان ناکرێ

---

لە کەر وایە، کەس بیر ناکاتەوە.

---

لە کەری جل و جۆر، لە بووکی سەر و پۆڕ.

---

لە گرمە گرمی ئێوارێ، دیار بوو باران دەبارێ.

---

لەگەر شیرەی شەبەقدا.

(لەگەر: لەگەل)

---

له ماشایدا، قەشە لە خۆی ترپت.

لە مردن گەڕاوە.

لە نەگبەتیدا، باری ناگاتە هەوار.

لە وزەیا نەما.

لە هەر شتێك بترسیت. بەسەرت دێت.

لە هەر کەندێ، پەندێ

لە هەموو گوندان گوندی مە، لە هەموو ماران ماری مە،

لە ماری مە کاکم، ئەویش چاوێکی تەواو نیە.

(مار: ماڵ)

لە شاری کۆران یەك چاو پاشایە.

(کۆر: کوێر)

لەوەتەی ئەتوو قسەم لۆ دەکەی، سی و سیێ مێشم

بە کێری کەرە شینەوە بڕارد.

لەم گێ دەبیبستێ، لەو گێ دەری دەکات.

(گێ: گوێ)

لەشکری کچان، وەك ڕەوەی کێچان.

لەفزم لە لەفزی ناگەڕێ

لەقلەق مەلێکی فەقیرە. ماریش دەخوات.

لێت بەزیاد نەبێ.

لێم چویتە سەر کلکی دارێ، نایەتە خوارێ.

لەبەر چاوی کەوتییە

لێی بێخەمە.

لافاو لە تکە تکە پەیدا دەبێ.

لەو مانگەی بەر کۆژە.

له بێ ئەقران وایە ڕۆژە.

(بێعەقر: بێعەقڵ)

---

لەسەر عەرزی ڕەق خۆی بەڕێوە دەبات.

---

لاوی بە دەرمانان، ناچنە دیوەخان.

---

لە پیران تەوێ، لە زستان شەوێ،

لە جوانان خەوێ، لە سواران هەوێ

---

لە تامی بردە دەرێ.

---

لەتاو پیرەژن دەچمە سەر دارێ،

بەردان دەهاوێ و دەم خاتە خوارێ

---

لەگـــەر گـــورگ دونگـــی دەخـــوا، لەگـــەر مـــەڕی شـــیوەن دەکـــا.

(لەگەر: لەگەڵ)

---

لە خاك هێمن ترە.

---

لە خوری تیسکێك، لە ڕۆنی نیسکێك.

---

لەحیزی وایە، هەموو کەس حیزە

---

لە دوای کەر ڕۆیشتن، تەرس بۆن کردنە.

---

لە دەستی ئیزرائیل دەرچوو.

---

لەســـــــەر لا گـــــــوننکی پـــــــاری دایتـــــــەوە.

(پاری: پاڵی)

---

لەسەر شکستە ڕۆیشتن، پەشیمانی لە دوایە.

---

لە سەری مەڕۆ.

---

لەسەر قوڕ تۆز دەکات.

---

لەسەر کلکی کەرەبابی مابوو.

---

لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆیەتی

---

لەسەری بابیشی زیادە.

---

لەسەرەوە هەی دەکا لە بنەوە دەی دەکا.

لە سبەینێ سارحانەوە.

لەشاری ڕا هاتییە، خەبەری شاری دەپرسێ.

لەگـــــــەر کـــــــەرێ بیگۆڕییـــــــــوە زەرەری ســـــــاحێبیتی.
(لەگەر: لەگەڵ)

لە شیری بەری دایك حەڵاڵ ترە.

لە قوون دەرکان گەورە بووە.

لە قەبرا هێنایە دەر.

لە کاکت کەوێ.

لاقی شکاوە، کلکی هەردەبەستنەوە.

لینگە فرتێیەتی.

لینگی جووت کرد.

لاقی درێژ کرد.

لە ئاو بدە بتبات، مەچۆرە سەر پردی نامەرد.

لە ئاوی گواوان بێ خێرترە.

لە ئاوێك نادا خوڕەی بێ.

لە مایین دابەزی، سواری کەر بوو.

لە مەڕ دۆشان، هاتە سەر کەر دۆشان.

لە هێستریان پرسی باٮت کێیە؟
گۆتی: داکم مایینە.
لە بنی کودی دا.

لە بۆزی هەوێك، لە زستان شەوێك.

لە بنی هێنا.

لە زستان شەوێك، لە پیران تەوێك.

لەبەر بای مەکێشە تووتنێ، لە هەورازێ مەڵێ ووتنێ، مەچۆرە سەر ماری بابی ژنێ.
(مار: ماڵ)

---

لەبەر چاوم کەوت.

---

لاشەی خۆم ڕاکێشم، منەت ناکەس ناکێشم.

---

لات پاڵەوانی خوایە.

---

لەبنەوە بڕە.

---

لەعەینی ڕاستیدا، لەداس خوارترە

---

لاق ودەستی بە قوونییەوە نووسایە

---

لەخۆ خەنی، بوون بۆگەنی.

---

لە قوونی کەریشدا دیار نییە.

---

لەسەر دینێك ساغ نابێتەوە.

---

لەسەر دەرپێی خۆت دانیشە.

---

لەئاغای ڕادیتیە لەگوندی ر یتیە

---

لەجی یەکی نانوی ئاوبیبا

---

لەجۆنیدا بی گوتی ئەوجا خاوێی نابێتەوە

---

لەسەد ئاشان دەکا،چتاقی نامالتەوە

---

لە هەمووچەکان هەمە حەیزوران

---

لە بۆ هاری هەر دەباری

---

لەرێی لەپشتەوە بڕۆ،لەچەمی لەپیشەوە بڕۆ

---

لەسەرانم گیرکردی لەخامانم پیرکردی

---

لەگەڵ ئەصلا هەموو مصلال،خوا شنیال گرانە،ڕاگرتینال ئاسانە

---

لەچەپەی دەدا،لەراستەی دەی قۆزتەوە

---

لەدەرێ رابیە،لەژووی ڕۆمیە

---

لەناوەندی دەخوا،لەپەڕگێ دەنوی

---

لەپشتی ناروا،لەیەریێ ی تازاو،بۆرە سوارم رۆ

لەعەرش تا قورشی کەسی بەدۆی خۆی نالێ بترش

لەناچاری بەپێلەی دەلێ ی خان باجی

لەساڵی ساڵان،لەماڵ ماڵان

لەماڵەوە تەندووری بە بووکی داخستیە

لەگەڵ عامێ دەچمە شامێ

لەدوو چوان مەچوو

لی دۆن بە کلکەتەشی.پاش و پێشمان کەوتە خۆشی

لەسەروە گولی گەنم،لەهەتاویش دیزەی رەشم

لەماڵی جووی دەخوا.لەماڵی دیاتی دەنوی

تێك رادەمینیی ئاگایان لە دەوروپشتایان نییە

لەوی دەکاتی،ئاردەکە لێرە دوکاسەرخستی

لەگوڵە جۆی گەشترە

لەحەمامی بەزپوزەنگ.نەئەمن دەنگ نە ئەتۆ دەنگ

لەبیست ئەوەم پێ دەویست

لەتەڕی دەخوا،لەئیشکی دەنوێ

لەکوڵی هاتیتەوە،کەچی هێشتا بۆن گووی لی دێ

لەسەر گووشی ئێمە لەبیرنیە

لەپاش میران سەرانشیز دەبڕن

لاوە، گای لە جۆتی هێناوە، دای بەزین و لغاوە

لاوی شێخوەسانان، بەڕۆژ لە سەر بانان، بەشەو لە قەزوانان

لەتڕی خۆی دەڕەویتەوە

لەچار پەلان، گێی ساغە

لە خوازان بدە نازان، ناز ئازیزن

لەسران بۆن سیر دێ، مشەی پیاوی پیر دێ، جوانی خۆم وەبیر دێ

لەسەر چینکان، دایە بەر قینچکان

لەکردیان بووی، لە خواردیان نە بووی

لەگەر کۆخەی، دۆخینی دەپسێ

لە گچکەی، خەتا، لەگەورەی عەتا

لە گوپی خۆت دە

لەماری نییە شێوەی شەوێ، دری تەڕەپیازی دەوێ

لەمەکران دەچیتە کەپران

لەنیسانێ لە بیستی، گاتێردەخوا بەنووستی

لەو دەراوانە، ئاوێ ناخواتەوە

لەهەزاری، هی هەژاری

لغاوی ماینی حەدوود لۆ کەرێ نەکرایە

لنگەکت سۆلە، یەك کراش، ماندی نەبی مام تەڕاماش

لەکن من هەتاکنەتۆ،بەقوونی باب و باپیری تۆ

لە سەرچنار کانی یە

لە تێنان: لە تێنووان

لۆ، ئی مە قوزی بزنێیە، ئی خەرکی قوزی مەڕێیە

لە شەیتانیان پرسی کەنگێن خودا لێت خۆش دەبیت! شەیتان گۆتی: کەنگێن بووك وخەسوو تەبابوون وبەینیان خۆش بوو!.

لە (زێف)دەرچوو: واتە بێتامی کردووە

لێفە حیز.

لێم دە بە سووژن، بانگم بکە ئاغا ژن.

لەسەر هەموو پێغەمبەران، جرجیس پێغەمبەر.

لێخوڕە هەتا مانگە شەوە.

له جێیەك دانیشە هەرت نەسێنن.

له نیسانی، گێشە بە عەردی و کلۆ لە ئاسمانی.

لانەی خۆم کۆنەکەترە، لە هەموو جێیەك خۆشترە

لەوە زیاتر لەسەری مەڕۆ.

له کانی ژنان، وەرگرە خەبەران.

لۆ پیران ناوێك بەسە، لۆ زستان شەوێك بەسە، لۆ پیاو ژنێك بەسە.

لۆ ناشتنی مردوو هەموو خاکێك موناسیبە.

لۆ هاری، هەر دەباری.

لۆی تێکە وچاوی لێکە!.

لەکانی وئاویان پرسی تۆ چیت؟ وتی من باوکی ڕووبارم.



# م

ماچە: مێیەی هێستر، ئێستری مێ

هێسترەماچە زۆربەی (ما)یەك ...تایە، واتە مێ وەك: ماكەر، مانگا، ماكەو، مالۆس، ماچە-ماچین-ماشق-مامر، مێ. گوین، مێ گەل، ماین

---

مارووكەتە: مالْتە، كوردی ڕۆژهەلاتی بەكاری دەهێنێ

دەلێن:

مارۆكەتە كوو وادەبی

---

مامەحووجی: پارووی گەورە، .اوڵە

---

مۆنجە: قەرەباڵغ، پڕاوپڕ، سیخ..خ

شوێن نەمابوو مۆنجەی لێ نەیە.. ل٤٩ فاتح رەسول لە كاروانێكی دوورودرێژدا)

---

مسك: لیمۆ، بۆنی ناو ئێسكی ..ا مامز

---

مزە: هەق دەست، پاداشت، زیاتر بۆ ئاش بەكاردێت

---

مفتە: بەلاش، خۆڕایی

نەیداوەتە من خوادا بە مفتی

بەم مەشرەبە خۆت مەكە بە قازی

تەماشام كردووە تەقشی دەراهەد سەرفی مەمنوعە

كەچی قازی ئیزافەی كرد بەمفت. هاتە بەرچەنگی

(حاجی قادری كۆیی)

---

مشەما: نایلۆن

---

مەنجەڵ گەڕا قەپاغی خۆی دیتە...

لێك دەوەشێنەوە، تەماشم كردو...

---

(ماڵ)مار بەدرۆیە، درۆش بۆن ...ویە.

---

ماميلە: بچووك كردنەوە مام

---

ماسیلە هیچ نەمام هەیە با نەی ...ڕاندبێتەوە.

(شەوچەرە ل٢٣)

مێشك ئاشەوان:  مێشكەستور، سەرەستور، سەرگەورە، ناو ئاش

مۆرە:  سواغ كردنی دیوار بە قوڕ

مەڕمان نەدیبێ لەپەرێزێ، قشپلمان دیوە لە هەوێزێ

موو شانێ:  كەلایانێ. هەڵماتێن

مل ترتڕۆك:  مل ڕەپ بوون ملباریك

مگێز:  ئارەزوو:  حەواس، حەوسەڵە

لە ڕادەبەدەر مگێزم لـە خوێنـدن وفێربوون هـەبوو  (لـەكاروانێكی دووروودرێژدا فاتح ڕەسول ل٣٢

مەشكۆرە: جەوەنە. مەشكەی بچووك

مل خینكە:  مل كورت. سەری بەقەدیەوە نووساوە

مـەلیك مـەرقۆز:  بـەفیز و بـەزلزان، مـەلیك مـەرقۆز:  بـەفیز وخـۆ بـەزلزان بـۆ ئافرەتـان دەڵێن كچی مەلیك مەرقۆزە.

مەقەست كورتانی بڕی:  ئافرەت سواری كەر یان وڵاغ ببێ

مەمك دۆدان: مەمك گەورە

منداڵی نەژی لە گووی ڕادیارە منداڵی بەدەرمانان قەت ناگاتە سەربانان

ماقۆر:  ئەو بەردە قوولەیە لە چیایدا ئاوی تێدا كۆ دەبێتەوە

مارووكە:  میمبەری كولاو هی ناو گیپە، میمبەر ماری بن یاپراغە  (قەسابەكان وایـان دەگۆ)

مارووكەكم بدەیە بیخۆم

ماڵ (مار)بەلا باران. ناگاتە هەواران

مادە:  نانی لەناو تەندوور فڕێ دروستكراوە

مزرۆ:  پەككەتە وبێ تاقەت وداماڵدراو مجرۆشی پێ دەڵێن

یا نەزیف قادر دایكی م.دڵشاد ودڵسۆز وئامانج ولەگەڵ د.فوئاد مەلا مەعسوم هاوسێ بوون ویەك تەمەن بوون دەیگوت وەلاشی یەكین ئەو وەك پیكی پۆلایە منیش مزرۆ بوویم واتە لێ كەوتووم

ماین: ماون

لەکۆیە لە هەواڵ پرسین دەڵێن: داك وبابت ماین واتە دایك وباوکت ماون، برادەرێك لە بەندیخانە لەگەڵم بوو، دەیگوت: دایکە ماینە وبابم ئەسپە.

---

مارێکی ڕەشم، خۆم لەکیف هەڵدەکێشم

داو داوی قوونت ڕادەکێشم

---

مەجلیستان دایم، ئیمانتان قایم

---

مشك دێ ودەبەزێ، گێی خەلیلی دەگەزێ

خەلیل دەرێ وەی دایە، مشکم لەگێی ئارایە

خەلیل کەوتە خەلایە، بە ئەبرەهای دەرنایە

(گێ: گوێ)

---

مینەگ: کەری خاوەن قەتارچی بەکاری دەهێنێ بۆ خۆی شتومەکی پێویستی وکەماندوو بوو سورای دەبێ (تێشوو)بەو کەرە باردەکا.

---

مەنۆرە: سەیر مەکە: تەماشای مەکە مەنۆرە سەروسەکوتم بنۆرە بەرومێ کوتم

(زاهیرە گچکەل لەشەوێ زاوایەتی وای بەژنەکەی وتووە)

بنۆرە: سەیر کە: تەماشاکە

(سامی عەوداڵ)

مەنۆرە قسەم بنۆرە کارم

بنۆرە دڵی بێ جێ وبێ کارم

مەنۆرە لانەی ڕەشم بەرهەتاو

بنۆرە شیعر وبیر وئەفکارم

---

متبەق: متبەغ، چێشتخانە، لۆقنتە

---

مالم: پێش نوێژی جوولەکان، پیاوی ئایینی

بە حاکمان وبە زاڵمان وبەماڵمان

فەقیرگانە فەقیرگانە فەقیرگان

---

مووت لەزمانی بێ

---

مەشکە لە خۆی بەشکە، ئەوەی کەتنەکی کردبێ

مستەقا: خواردنێکە لە (باینجان+قیمە+ڕۆن وپیاز+کەرەوز) دروست دەکرێ

مەیدان مشکان نەخواردیە، مەیدان دەخوازی

مێرجار: شوێنی پیاوان، ناونیشانی کتێبێکی (ئاراس ئیلنجاخی)یە

مار بۆ کەیفێیە نەك بۆ حەیفێیە

ماچی ئاغا ژنێ بەشەوێ بەر شەرتی شوانی ناکەوێ

ماری بێ ژن کاولە ئاشە

ماستی پایزان، بدە عەزیزان ماستی بەهارێ، ئاوی ڕووبارێ

ماسی و مێوان زۆرمانەوە بۆگەن دەبن

ماین وحەیوان، تفەنگ ونیشان

ماندی ومردی، ڕەنج با بردی

مەکری بێوەژنان، ڕێوی دەخاتە کونان

مەکری ژن کەوتە ناو سەت پیاو دەخاتە داو

مریشك هەتا نەچێتە سەر گوڵکی تێر ناخوا

مانگە شەوی بە پشکۆژە، لەکابانێ دابێ ڕۆژە

دونیا هێندە ڕوناك بووە وایانزانیوە ڕۆژە

مل نێرکە کاردی یەکێك کە خۆی بەدەرخا

مەلا قورتە مل نێرکە کاردی لە کێوی عەرەفات بخوێنێ

(ل٢٦٦ بیرەوەری وڕوانینەکانی مەلای گەورە)

مەنگۆز: واتە چل گەواد بەیەك مەنجەڵ کوڵاون وخولاسەکەی دەبێتە مەنگۆز، واتە پوختەی چل گەوادان

ماڵی بە خوشکێ، هێلانەی مشکێ

مەڕوانە بۆرە، لەبنەوە زۆرە

مسقالەك سەم، نەك مسقالەك خەم

مێش هەنگوین: هەنگ

مزاش: گەنم وجۆی تێکەڵاو

مەستاڕبن: ڕیزبن

مزەورە: چێشتێکی تێکەڵ (سلق وپیاز وتەماتە وکوولەکە وکەرەوز وبرنج) حەفت ترینکە

ماتە: نۆبەرەی هەنجیر ومیوە وتەماتە. ماتەی دایە بۆ مەمکی تازە هاتوو دەگوترێ

مەڕەمردی: واتە فەقیر وبێ دەسەڵات. هێڕ

مام عەلی ولی ولی-دارێکت بە تەپری گونی

منداریەنەی گەرەکێ-سەروپێچك خەرەکێ- وەرنە شەڕە گەرەکێ

مەیکە بە مێوژی سەر بووکێ: واتە وای دەبەخشیەوە بەری نەکەوێ، دەستی نەکەوێ

مانگی ئادار، مەشکە لە دار، لێرەنا لەشەنگار واتە شیر وماست زۆر دەبێ

مەلا، گوون دەسکەلا، بۆ لێت تێك چوو بانگ وسەڵا

ماکەری بارە تەماتان: جنێوە بۆ کەسێکی هیچ لەبارا نەبوو

ماکەری ئێزگان: جنێوە بۆ کەسێکی هیچ لەبارا نەبوو

مراك: کەوچك

موکەدەر: تووڕە وپەست بوون، نیگەران بوون، خەمبار، حیددەت

(حاجی قادری کۆیی)

هەر کەوای گوت وەها موکەدەر

وام دەزانی کە وا لەدین دەرچووم

مەحمود عانە: سەرتاش بووە، منداڵەکانی پێی نیگەران دەبوون بت گوتبا مەحمود عانە، ئەوانیش دەیانگوت: قوزی دایکت سێ بست پانە، زەمانێك بەیەك عانە سەری دەتاشێ

مزگەفت بشڕوخێ میحرابی دەمێنێ‌بەنگی چەری

مارەکی (ماڵەکی)ئەمن لێی بم بێ بەری، چ ڕۆمی بیبا چ بەر بەری.

من ئاغا وتۆ ئاغا کێ جێمان لۆ (بۆ) ڕاخا

مار بە مار خۆی نەچی حەرامە (مار-ماڵ)،مەبەست منداڵ بە باوك ودایكی خۆی دەچێ.

ماری كوردی، تاران بردی (ماڵی كوردە) تالآن بردە

ماری خۆت جوان تەقەت كە، خەركی بەدز دەرمەینە

مێوژی بخوا لەگەردنی ڕا دیارە، بەكەسێكی زۆر جوان وناسك دەگوترێ

مامەغەمە، غەمت نەبی، هەر لۆت دەبی

مامەغەمە خەمی نەبوو، لەبۆی دەبوو

مانگی نیسان، سەرمای ئینسان: واتە ساردە

ماری بەفێر، نایدا بەچێر

ماری بەفێر ناچی بەخێر

ماسی بێ ئاو ناژی. لەهەموو ئاوێكیشدا ناژی

ماسی گرتن بێ قوون تەڕبوون نابێ

مەقەست وقوماشی لەدەست خۆیەتی، كورتی دەبڕێ وگرانجانیشە

مرۆڤ لەدوای كەر بڕوات، دەبێ بۆنی تەرسی بكات

مردوو قسەی بكردا بایە، مێژوو درۆ دەردەچوو

مشكی قوون ئەستوور. چەندی خوارد تێر توور، ماریان باری كرد چوونە دوور

ملی لە داوە مووەكی باریكترە

من چیا وتۆ چیا، گۆلك مانەوە بێ گیا

مێرەم دەبینێ، ئۆغەن دەشكێنێ، حسابی سارد وسەرمای زستانانە

مێشوولە یەك بگرن فیل یخ دەكەن

مەعلانە: لێی دەزانی. شارەزایە، پیتۆڵە

مەگری لۆ لاوان
بگری لۆ چاوان

مەلا ترینی قازی بەزێن. لەبلەبان

مەمنوونی خوای بە

---

مەیلی لێ نییە

---

مەیگەیەنە مریشکە ڕەشەی

---

ماری خۆم چاك دەناسم

---

ماندی بوونەکی بەلاشە

---

مردن برا گەورەیە، حەقە

---

مارێ مارێ

کێشکە لەسەر دارێ

کێشکە: چۆلەکە

مار: ماڵ

---

ماری خوای سەد جار ئاوابی

---

مرخاندن: دەنگی سمۆرە دەڵێن دەمرخێنێ

---

مەگیرانی: بێزوو. ئافرەتی سك پڕ کە حەز لە خواردنێك یان شتێك دەکات

---

منجڕ: واتە تووش یان ناحاڵی وعیناد

---

منداری بەدەرمانان قەت ناگاتە سەربانان (ناڕوا لەسەربانان)

---

ماری بابم کەرە

گێم لۆ دەکاتە چەپەرە

مام گورگ خۆش خۆش وەرە

مار: ماڵ

بابم: باوکم گێ: گوێ لۆ: بۆ

دەڵێن: مەڕ وکەر کە گورگی بینی بەرەوڕووی دەچێت بۆیە ئەو پەندە دەڵێن

---

مێخ: واتە سنگ: مێخ زنجیر بۆ بەستنەوەی ولاغ

---

مارانگاز لە خشەی گوریس دەترسێ

---

ماری نەخۆری لۆ چەکمە بۆری

---

مارێ بەبەی نانیان نەبوو داوای تەڕە پیازیان دەکرد

---

مام مۆتك: لەقسان دەرێی مام مۆتکە. واتە قسەزانە

---

ماری ژنان کوشتی: زۆر خراپیان لێدا، هەر وازیان لێنەدەینا

---

ماستی مەیی: هێندە هیمن وبێدەنگ ولەسەرخۆیە بوویتە ماستی مەیی

---

مەراشو: بەشی سەرەوەی ناو زار ئینجا لای قورگ

---

ماری سپی لۆ پۆژی پەش

---

مەڕ خورییەکە وگۆشتەکەی لۆ خۆی نییە

---

مەقام: چەشن

وەیا کەی نێژراو چەند نەمامەك

لەنارنج وتورنج وهەر مەقامەك

---

مێردم ئاغا بێ خۆم ئاغا ژنم (لافی ئاغایەتی لێ دەدا)

برام ئاغا بێ براژنم ئاغا ژنە

---

ملی لێنا

---

مندارەکانی سەرکەو بنکەن

---

میر محێ: بەدەسڵات

میر محێیە بۆ خۆی

---

موورە: پارچەداری بڕاو لە کۆڵکەدار

هەناسەم سەردە جەرگیشم پەڵاسە

زەعیفە قەڵبەکەم وەك موورە بێ تۆ

دیوانی عاسم ل ١٣٧

لێکۆڵینەوە وساغکردنەوەی د.کەمال مەعروف

---

مەکووك-مێکووك: ئەو بەشەی مەکینەی دورمانە کەداوی ناو مەکینەی تێدا دادەنرێت وبەبەردەوامی دەخولێتەوە

بۆ خەبات چوست ولەش سووك

کەوتە گەڕان وەك مەکووك

دیوانی دڵدار ل ٧٧

ئامادەکردن وڕێکخستن وپەراوێز دانانی ڕەمەزان حەمەد حسێن وسەنگەر نازم

---

میتکە: قیتکە

مشتوو: دەسکە خەنجەر وچەقۆ وشینەتیغ، بۆیە دەڵێن مشتوماڵ کردن

مارنج: ماڵە

مرومۆن: ڕووگرژ وتووڕە

ماهی: ١.دەسکی خەنجەری سپی لەجۆرە هێسکێك دروست دەکرێت

٢.شاخی لووس

داری دارەبەن لەماهی دەڕوێ

کەوو پلینگی کێوی دێنە سووێ -پشکۆ-

مردۆخ: جووڵە وچالاکی کەم بێ دەڵێن:

ئەو مردۆخە مەڕە مردوویە چییە

مایەکە وتۆبەکە: بۆ قومار ومعامەلە بەکاردێت

مەندەف: ئامێری شیکردنەوە وگرێ لابردنی مووە، یاریدەدەری رستنی چەرخی خەرەکە

مەعجووم: سپی بوو لە بابەتی گەزۆ

وەستای تایبەت هەبوو مەعجوومی زۆرخۆشی دروست دەکرد هەروەها شەکر وگوێز (مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل٣٥)

مێوژی بخوات لە گەردنی را دیارە هێندە سپییە

مانگا ماکەر، ماڵ ئاواکەر

مشتەی ناو هەمبانە

مەڕ لە مێگەل دابڕێ، گورگ دەیخوا

میرمیرانێ: گەمەیەك بوو زیاتر لەناو فەقێیەکان باو بوو، میر هەر فەرمانێکی بکردبا جێبەجێ دەکرا

جارەکی میر میرانێ دەکەن میر لەدوو حەماغای دەنێرێ، حەماغا دەچێت لەبەر دەمی میری ڕادەوەستێ دەڵێ فەرموو چیت دەوێ؟ دەڵێ هێزەڕۆن، کێلە برنج، چەند سەر بەرخ وگیسکە وپارە، حەماغا دەڵێ بەسەرچاو دەچێتەوە هەموویان بۆ دەنێرێ، پیاوەکانی دیوەخانی دەڵێن ئاغا کوو چووی دەڵێ: لۆ نەچم چم لێ کەم بووە.

(مێژووی شاری کۆیە- نەجیبە خانی جەلیزادەرە ل١١٠)

---

مریشکە قوندە خەسوو بوو

کیسەڵ لانکی لەدوو بوو

قرژاڵ کەوی کەی دوروو بوو

حیکایەتیان بۆ منداڵ دەکرد، منداڵ زۆر کەیفیان بە حیکایەتی (سەرکدولە)دێ

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل١١١)

---

موچانە: ڕۆژانە

موچانە وەربگرم

ل (١٣٧)

سیپارەمان هەر دەگرین

موچەکەمان وەردەگرین

(دیوانی شیعر ڕۆستەم حەوێزی ل٢١٩)

---

موغەیری: کوورەی ئاگر لەناوژوور

ئی زەمانی باپیرمە موغەیری تێدایە دەڵێن وەستا عەباس دروستی کردیە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٦٦)

---

ماین ماینانێ: دەستە کوڕوکاڵ خڕدەبنەوە قامیشی درێژ دەهێنن قرژوقاری لێ دەکەنەوە لغاوی لۆ دەکەن لەقامیشەکەی دەبەستن، سەرەکیان بەدەستەوەیە هەموو پێکەوە غار دەدەن هەتا شل وکفت دەبن (مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (١٦٢)

---

مردی بە پێوە، پەرۆی بە قونێوە (کەندووە)

---

مامۆستای قسان، کۆرەواری دەستان

---

مێرد هەندووە، ژن لەدووە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (١٧٥)

---

مار دەکوژێ، بەچکە مار بەخێو دەکات

---

مار تا ڕاست نەبێتەوە. ناچتە کونەوە

---

ماست تا نەیژەنی، کەرە نادات

---

ماسی هەر لەناو ئاوە، هەناوی ڕەشە

---

ماکەر بۆ ئەوە باشە، نێرەکەر قوونی بدڕێنێ

---

ماڵ (مار)بێ چرا، خوشك بێ برا

---

مار (ماڵ) پیاوی نەبی ژن سەرگەردانە

ژنی تێدا نەبی مار وێرانە

---

مار (ماڵ) بە پاسارە، کەر بەهەوسارە

---

مار (ماڵ) لەخۆی نەبوو، مێوانیشی لۆ بوو

---

ماری (ماڵ) قەلب سەر بەساحێبیەتی

---

مار بەمار (ماڵ) سارم بەسار

(سار: ساڵ)

---

مریشك گرتی سەرچۆپی، کەرەباب لەداخا تۆپی

---

مریشك هێلکەش دەکات جیقنەش دەکات

---

مریشکی هێلکەکەر، باشترە لەگای جووت نەکەر

---

مانگا با ڕەش بی، شیرەکەی سپییە

---

مەڕ لاقی بەرخی خۆی ناشکێنێ

---

مەرد بۆ ناو دەمری، نامەرد بۆ نان

---

مەلەم فێرکرد، دەیەوێ بم خنێکنێ

---

مەنازە بە بوون، مەگری لۆ نەبوون

قەت هەتا سەرنین بوون ونەبوون

---

مەنازە بە دەرگاو دەروازە

دایکی ببینە، کچی بخوازە

---

مەمشۆ بە گواوێ، چاکەی دوایتم ناوێ

---

من دەرێم (دەڵێم)دۆرەم (دەهۆڵ)دڕاوە ئەو دەرێ لێدە وبیکووتە

---

من ڕازی وئەتوو ڕازی، دارێك بەقوونی قازی

---

میراتی کەر، لۆ کەمتیار

مێشی لەئاو نەکردییە

مێوانی ناوەخت، هەردەم بێبەخت

مێوان نایەوێ سفرەی ڕەنگین بی
نانی جۆیین بی خوڵقی گەنمین بی

ماقوولە هەرکەس لەناو خۆ ڕۆیی
خۆی گچکۆکەیە لای خزم وخۆیی

مشك بچتە سەر دەریا، بەقەد خۆی ئاو دەخواتەوە

مەلێ بۆرە، چاوی کۆرە (شەمشەمە کوێرە)یە
مەل: تەیر

ماری کەوتەسەر، خەمی کەوتەبەر
ماری: ماڵی

میراتی کەر کورتانیەتی

مردن نامە: تحریچ
(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٧٧)

مێروولەش دوژمنت نەبێ باشە
ماکەری بارە تەماتان

مەڕ پێ لەبەرخی خۆی نانێ

مەشکە، لەخۆی بەشکە

مەعموور: لەدار بەڕوو دروست دەکرا بۆ بەرد کێشان لەسەر وڵاخ

مەسنەو دەستشۆر پێش هەموو شتێکی دەچنە بەهەشتێ چونکە موژدەی خواردنیان پێیە!

مەتەرێز: سەنگەر
مەترێز لەوێوە لوولەی تفەنگیان دەریناوە لە کونێکیا سێرەیان لێ گرتووە
(مێژووی کۆیە-بەرگی دووەم-بەشی یەکەم، تایەر ئەحمەد حەوێزی ل٥٠)

مار لاقی هەبایە، هەموو دونیای دەخوارد

مانگ قەدری نییە، تا شەو نەبێ

مریشك ببتە پاشاش، چاوی هەر لە گوفکە

گوفك: زبڵدان

مریشك یەك کشەی لێ بکەی زەرەر دەدات، دوو کشەی لێ بکەی دوو زەرەر دەدات

مێوەکە بپڕدرێ، بەری چاك دەگرێ

مێش هەنگوینە زگی هەنگوینە، کلکی چزورە

مەیگۆڕە یەك یار، بەهەزار نەیار

ماوەتگر: وارپ

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل١١١)

مسۆگەر: سەد دەرسەد لەناو دەستە

مێوان چاوەشە ئەوەی بیبینێ ئەوە دەگێڕێتەوە

مندار نەژی لەگووی رادیارە

مردی بەگریان زیندی نابتەوە

مریشك چاوی لەقاز کرد قوونی درا

من تاژی ئەتوو تاژی بەچی دەچی کەنێچیر نەبێ

من لە بێکەسی، توو لەبێ نەوسی

مامە گوونت بەچەندی دەڵێ بەسەنگ وتەرازوو

مانگا دۆشین وقەزوان قرتاندنیان نەگووتووە

مەڕ لەمێگەل دوربکەوێتەوە، گورگ دەیخوات

ماڵی پیرێ، چاکترە لە ماڵی میرێ

ماڵی نییە ڕەحمان بیبات، دینی نییە شەیتان بیبات

ماسی چەقووی لەسەر نییە

مشتوماهی: بۆ خەنجەری باش ومشتوماڵ کراو لووس وچاك بەکاردێت

خەنجەرێکە مشتوماهی دەستکاری (کۆیە)ش لەپێشدا نقوم دەکرد
(حاجیلەکانی دەشتی هاموون–ئازاد دڵزار ل١٠)

---

میزتن: میزکردن
لە خانوەکاندا دەستم بە میزتن
(حاجیلەکانی دەشتی هاموون–ئازاد دڵزار ل٣٨)

---

مترۆک: بزێو
بۆیە ئێستا بێ باکم
لەهەرەشەی ئەو سینگە
عەجوول ومێرووکانە
(حاجیلەکانی دەشتی هاموون–ئازاد دڵزار ل١٥١)

---

مەندیلان: گولێکی ناسکو جوان لەجۆری (تیولب) لەبەروتانی بەهاراندا لەرۆخ چەمەکانی کوردستان لەشوێنی سێبەردا دەبیندرێ
(حاجیلەکانی دەشتی هاموون–ئازاد دڵزار ل١٥١)
دڵێکم بوو وەك بلوور
وەك گوڵە مەندیلان

---

مەیخان

---

مەترەلۆق: داری درێژ

---

مرخی لێ خۆش کردییە: خۆی بۆ ئامادەکردووە

---

مقاری: مقەڵی

---

مارمارۆکە: جۆرە نانێکە بۆ منداڵان دەکرا لەکاتی نانکردن

---

مارمیلۆك: مارمێلکە

---

مترەلۆز: دەنگی تۆپ، دەنگی گەورە

---

مەترەق: کوتەك

---

ماشە: مقاش

---

ماندی ومردی: هیلاك

---

مۆرانە: جۆرە مێرولەیەکە لە دار دەدات وکلۆری دەکات (لەکۆیە نازناوە)

مینگەمینگ: پرتەوبۆڵە

مەزە: ئەو خواردنەی لەگەڵ مەی خواردنەوە دادەنرێ

مزروکە: ١.خواردنێکە لە برنج وتەماتە دروست دەکرێ

٢. بەتۆپی لاستیکی بچووك دەگوترێ کە زوو هەڵدەبەزێتەوە

مەڕی ماڵان، لەبەری داڵان

مردی دوو قوون

(باگردان)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٦)

مۆزە، تەڕە، لینجە، چییە

(مۆز)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٨)

میوان زۆر ڕووی بدەیتێ، خۆی دەکاتە خاوەن ماڵ وبێ تامی دەکات

مێردە بەڵام بێ کێرە

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٧٢)

مێشکی گووی سەگ وکای تێدایە. چ وەرناگرێ

موبارەك بی میری تازە، ئەحمەدی ئاغای برازا

مردییە بەشی زیندیان دەخوات

مەیدان، مشکان نەخواردییە

مەلایەتی ئاسانە، بەڵام مرۆڤایەتی زۆر گرانە

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٦٧)

مەشکە کە دڕا، دۆکە دەرژێ

مەڕی دەدزی ودەیکاتە خێر

مەترە ومەکۆخە، ماڵی مەلات لە ڕۆخە

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٦٤)

مەرۆنە سەروسکوتی، برۆننە بن ومیکووتی

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخێ ل٢٦٤)

---

ماریان هەر لەسەر پشتی کەرێیە

---

مشتومالّ: حقل. بۆ پاککردنەوەی جۆگەی ئاویش بەکاردێت

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل٨٠)

---

مشکی یەك کوتز

---

مافووری کاشنە پرنابێ

---

مرۆڤ درك بچێنێ. گولّ نادورێتەوە

(د.کەمال مەعروف)

---

مرۆڤ کە نەخوێنێتەوە لە شوێنی خۆی ناچەمێ بەرەو دواوە ڕادەکات

(د.کەمال مەعروف)

---

مرۆڤ ئەگەر ناکەس بەچە نەبێ درۆ بەخەڵك نافرۆشێ

(د.کەمال مەعروف)

---

مرۆڤ نابێ ڕێزی کەسێ بگرێ، کەڕێزی خۆی نەگرێ

(د.کەمال مەعروف)

---

مرۆڤ کە قورمیش بکرێ هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتی نابێ

(د.کەمال مەعروف)

---

مەمك مەشکە دۆ-ددان دنکەجۆ

---

مل بە دۆن

---

مانگای قسە: واتە شیری نەماوە وگۆلکی ساواشی نییە بەرهەمی نییە.

---

ماستی ئەزموو لەنەزموو چاکترە: بەواتای تاقیکرایەوە وتاقی نەکراوەیەوە، دەتوانین بەشتێك (قابل للتحربە) بێ بڵێین! بەر نەزموون، ئەوەی کە تاقی نەکرابێتەوە وئەوەی ممکین نەبێ تاقی بکرێتەوە (ئەزموون)ی بۆ دەست دەدات.

(زاراوەسازی پێوانە-مەسعود محمەد ل٣٣)

---

مردەی پارەیە، واتە زۆر ڕەزیل

---

مەڕ نە حاکمە نەوەزیرە، شەرتی مەڕێ خوری وشیرە

---

مرۆڤ چاوی برسی بێ، خاوەن فەرهەنگی درۆ دەبێ

(د.کەمال مەعروف)

---

مەگەوەر: قابل ملموت

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٥٥)

---

مردەزێ: منداڵێکی بەمردووی بەربێتەوە لەسکی دایکی پێی دەڵێن (مردەنەێ)بوو.

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٣٨)

---

مەلای گەورە لەبەهاری کۆیە فەرموویەتی:

چاویان هەیە ئەمما پێ نابینن، چونکی چاوی دڵیان نییە

(بیرەوەری وروانینەکانی (مەلای گەورە) کۆکردنەوە وڕێکخستن وپەراوێزی هێمن عومەر خۆشناو ل١٣٩)

---

من لە ئاست نەزەریەکان دەڵێم. تەنها ئەوەندە چاکەمان لەگەڵ بکەن واقیعمان لێ نەگۆڕن، نووسەریش لێی داوا دەکرێ واقیع بەقوربانی نەزەریە نەکات

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣١)

---

مرۆ بەئازادی هەڵە بکات بەشەرەفترە لەوەی بکرێتە عەبدی سوخرەکێشی هەقیقەت

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٦٤)

---

مرۆڤی بێ دەسەڵات کاتی دەسەڵاتی بوو لەخۆی دەردەچێ ورەفتاریی لەگەڵ خەلقدا دڕ دەبێ، دەیەوێ تۆڵەی سەردەمی لاتی وبێ دەسەڵاتی خۆی لە عالەم وەرگرێ

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٦)

---

من کەس لەخۆم بەگەورەتر نازانم، کەسیش لەخۆم بە بچوکتر نازانم

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٢)

---

من گەر کابرایەك ببینم کە خەریکی خۆ فڕێدانە لەبانێکی بەرزەوە، هەر هێندەی پێ دەڵێم: خۆ فڕێدانت مردنی لەدوایە، بەرپرسیاربوون لەچارەنووسی خەلق بەولای تەحەمموولەوەیە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٨)

---

مرۆڤ نابێت جڵەوی هۆشی خۆی بداتە دەست هۆش وئارەزووی غەیری خۆی

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٩)

---

مرۆڤ لە هەموو زیندەوەرێك پتر بەبەریەوە هەیە لە گومڕایی ڕووبچن چونکە زێدە لەو گیانلەبەرانە هۆشی هەیە، وێڕای غەریزە، ئەگەر لە هۆشەکەش بە هەڵەداچوو شتی ئەوتۆ دەکات هەرگیز ناکەوێتە بەر حوکمی غەریزەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥٠)

---

مێژوو بریتیە لە حەرەکەی ئینسانیەت بەکەم وکورتی وچاکە وخراپە وشەڕ وجەهالەت، خولاسە حەرەکەی من وتۆ بەشەڕ وخێر

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٥١)

---

مافی تێکرای تاکەکان دەبێتە مافی گەل، چەندێکی لە خۆشی وکەرامەتی تاك دابشکێت لە خەرمانی میللەت، گەل، نەتەوە کەم دەبێتەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٦٥)

---

مرۆڤ هەر نەختێك سەرنج ڕاگرێ دەزانێ نووسینی كتێبان وكردەوەی خەباتگێڕان لە یەكدی دوورن

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەكانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەكردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٤٥)

---

مرۆڤی ئیرادە ئازاد یەكجار زەحمەتر ودەرەنگتر دابین دەبێ لەمرۆڤی گیرخواردوو بەدەست قودسیەتی نەزەریانەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەكانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەكردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٣٩)

---

مانگا سەری لە ژووروو لەوەڕاوە، گوانەكەشی لە نەغەدە دۆشراوە

(مێژووی كۆیە-تایەر ئەحمەد حەوێزی-بەرگی یەكەم-چاپی دووەم ل٦٠)

---

مەچوونە ناو ڕووباری، نەك قرژاڵ لاقتان بگەزی، چونكە بەری نادا تا (كەر)ی بەغدا نەزەڕی

(مێژووی كۆیە-تایەر ئەحمەد حەوێزی-بەرگی یەكەم-چاپی دووەم ل٦٠)

---

مردیە گووی سپیە

(مەشكە)یە

---

مردیە گووی ڕەشە

(دار جگەرە)یە

---

مل حیزە: واتە بێ غیرەت وكەتنكەرە

---

من كە لەسەرەتاوە دەستبەرداری حیزی ودانان بووم، وێرای جۆراوجۆر، ئەوەبوو كە دێم هەرگیز نەیدەهێنا خەڵك بەرەومەترسی ومالكاولی ومەرگەوە ڕاپێچەك بدەم بێ ئەوەی دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بكەم وهیچ ئومێدێكی نیمچە تادیاریش لەئاسۆی دیارەوە ناتریكێتەوە موژدەی بەفێنەچوونی ماڵكاولی وقوربانیدانی لێوە بخوێندرێتەوە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەكانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەكردنی حەیدەر عەبدوڵلا ل٨٢)

---

منیش قوڕه چەورەی دەستی کەس نیم بۆ کەیفی ئەو بنرووم، لە نوسینشمدا ڕوونم کردۆتەوه چۆناوچۆنی بە ناچاری هاتمە بەغدا، لە بەغدا بیم ولەکۆیە ولەهەر شوێنێکی قەلەم وکاغەزی لێ بەچەنگ بکەوێت هەر ئەوە دەنووسم کە باوەڕم پێی هەیە.

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٧٥)

---

ماوەیەك گەشە، ماوەیەك رەشە

---

متەق: ورتە، دەنگ ونوزە

متەقی لەخۆی بڕی بوو

---

مۆری: مووروو گەمەیەك هەیە هی کچان بەناوی (مۆریانێ)

---

مۆمن: پیاو چاك لەفەقێ یانێ دۆڵێك هەیە بەناوی دۆڵی مۆمنێ

---

میر غەزەب: جەللاد

---

میر ئاخوڕ: گەورەی میتەران

---

مرۆڤی نەتەوەیی دەبێ وەکو ئەو مرۆڤە وشیار ودادپەست ودوورخوێن و وردبین وزانستی بێت کەهۆزی جودایە لەهۆزی نەتەوەیی دەنا بەکەڵکی کارەکەی خۆی نایەت وشارستانیەتی سەردەمیشی دەیتفێنێیەوه

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥١)

---

من کوردم قەبووڵە بە کورد هەتا ڕۆخی خیانەت، قەبووڵی دەکەم، بەکورد کەلەقۆتی خیانەت هەتادەر، لەوەشدا لەسەر هەق بوو، وەك هەژاری موفلیس کەسلکەپیازی رزیلویش بەلاوە خۆراکە

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥٤)

---

موعجیزەی ئاخرزەمان وەك مەلۆتکەی عیسا پێغەمبەری بێ باوك لەیزدانی مێژوو هەمیشە ئاوس بکەوێتە سەر لەپێی کوردی دەست بەتاڵەوە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٥٩)

---

من لە زووەوە گەیشتم بەو قەناعەتەی کەستالین تاوانبارێکە ڕۆژەك دێت شیوعییەت بەخۆیەوە ناگرێت کەئەمەم درکاند لە دەوربەری ١٩٥٠ وشتێك دواتر.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٩٠)

---

من کە یەقینم بە (موتلەق)ەوە بەستراوەتەوە کودایەتییەکەم (مەوسمی-هی کژوکات)نییە، بێ گۆڕانە.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢١٣)

---

ماینی سەر بێ ڕێشم

لەبرای خۆمن کێشم

چونکە ماین سەر بێ ڕێشم ڕەوە دەکرێتەوە کەرەسەن نییە بێ حورمەتە وبۆ هەموو ئەسپێك حەڵاڵە

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٦٠)

---

مارکسیزم لەلای خۆیەوە مرۆڤایەتی کەرتکرد بە دووبەشەوە ١-خوێنمژ. ٢-خوێنمژراو.

بەحەقیقەت ئەم کەرتکردنە دانسقەیە کە هەرگیز بەو جۆرەی وەهاگردەبڕ هەمەگیر لە هیچ مێژوویەکدا نەبووە، گەورەترین وبەرینترین کە ندری دابڕو دازڕی خستەوە سوەسەی پرۆلێبازی مارکێست

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٢٠)

---

موسەقەفەکانی تورك کە سوڵتان عەبدولحەمیدیان عەزل کرد لەنگەری کەستییەکەیان لەدەست دەرهێنا بەخۆو کەشتییەوە هەتابن دەریا ڕۆچوو. عەبدولحەمیدیش بەمێشك وشك دادەنرا

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی-مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٦٦)

---

من کەشەو بەدرەنگ کاتەوە دەکەمە سەرباری خەو لەخۆخستن، دەسا بایی تۆسکاڵێك خەفەتی سەروهاتە خواری نرخی شتانم نییە، لەوانەی ڕادیۆ باسی دەکات، چونکە هەڵکشێت، لەقوڕبنیشێت، بفڕی بۆکەشکەڵانی فەلەك، بەرەو ژێربێتەوە بۆ بنی دەریا، ناتوانی دەستە تەرازووی لێکدانەوەی ئابووریم ببزێ

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی - مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٦٨)

---

مەلای مودەریس ئەگەر جورئەتی باوکمی هەبوایە دەیتوانی (اجتهاد)ی خۆی لەگەڵێك سەروبەری ژیان چاکە وخراپەی دنیایی بەکاربهێنایە، کەم جورئەتیش هی گیرۆدەبوونی لایەنی (تقلید)ە، کەلە خۆخستنە نەزەری سەلامەتی (عقیدە)وە بێ خەتەوترە (تصوف)یش لەوەدا دەخلێکی هەیە.

مەسعوود محەمەد

(ژیان وجیهانبینی - مەسعوود محەمەد/ئامادەکردنی: هەڵۆ بەرزنجی ل٢٣١-٢٣٢)

---

مامزی نەگیراو زۆرە

---

ماری مار خۆریش هەیە

---

ماری کلك قرتاو، کلکی لە بیر ناچێتەوە

---

ماستی مەیوو هەوێنی ناوێت

---

ماسی گەورە لە تاڤگەدا ناگیرێت

---

ماڵت چووە ماڵان، چوو بە تاڵان

---

ماڵی نییە و شەڕ دەکات، ژنی نییە و گەڕ دەکات

---

ماڵمان پشتاو پشت. شیری کاکم لەپشت

---

مانگا نییە بمژێت، مێرد نییە بکوژێت

---

مردن لە مووی کەپووی نزیکترە

---

مردوو لەمە چاکتر ناشۆرێت

---

ملی لە تیغ دەسووێت

---

ملوانەکەی دراوسێ مەگەر شەو بکرێتە مل

---

من منم...توکیێیت؟

من به ئاگرێك گەش نەبمەوە؟بۆ بە دوکەڵی ڕەش ببمەوە

من بووم بە تۆ، تۆ بووی بە من، من بووم بە جن، تۆ بووی بە ژن

من لە شام و ئەو لە شیراز، مەحاڵە ببین بە هاوڕاز

من مردوو، تۆ زیندوو

منێك وا بە خننەخن، چیم داوە لە ماڵ و ژن

مۆری کوندار پەکی ناکەوێت

مۆم دەڵێ بسووتێم، نەك بتووێمەوە

مۆمێك بۆ تاریکیی زۆرە

مێش لە دەمی خۆی دەرناکات

مێش میوانی نییە

مەڕوانە ڕەنگی سوورم، تێبگە لە دڵی تەنوورم

مەکە فەخر، لەگەڵ کەس ناچیتە قەبر

مەمرە و مەژی، بۆ خۆی دەژی

مەنجەڵی مەردان بە چل ساڵ دێتە جۆش

مەیتەری: خەربەندەیی
ئەو کەسە خزمەتی ئەسپ یا ماینی کەسێکی دەوڵەمەند یان ئاغا وسەرۆك هۆزێکی دەکرد وکرێی خۆشی وەردەگرت.
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٤)

مێخەکە: مێخەکە شتێکی ڕەقە لەبنی پێ ولەدەست وقاچ پەیدا دەبێ وەکو بزمارێك وایە بۆی هەیە کەسەکە شەل بکات بۆ چارەسەر کردنی لەسەردەمی زوودا شیشەیەکیان بەئاگر سوور دەکردەوە ومێخەکەیان پێ داخ دەکرد بۆ فەوتانی یان دەرمانێك هەبوو کە (نۆشاتر)یان پێ دەگوت لە مێخەکەیان دەدا بۆ فەوتاندنی
(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٤١)

ماهێڕ: مانهێڕ: ماهێر زۆر کۆن نییە لەسالآنی حەفتاکان حکومەتی عێراق دەیدایە پۆلیسە کوردەکان چونکە چەکێك بوو.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٦٩)

---

مێشە: جۆرە مێشێك هەیە بەهاران پەیدا دەبێت جار هەیە بەڕەشەولاخەوە دەنووسێ و دەیگەزێ ئەو کاتە ڕەشە ولاخەکە لەتاوان دەردەپەڕێ ولەگاڕانەکە دەچێتە دەرەوە بەگاوانیش ناگەڕێتەوە هەتاکو مێشەکەی لێنەبێتەوە ڕاناوەستێ.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل١٠٤)

---

مار کە مردنی نزیکبووەوە دەچێتە سەر ڕێگا.

---

مار لۆ کەیفیە یا لۆ حەیفیە.

---

ماری بووکێ گەرمز. مالّی زاوا نەرمن.

(مار: مالّ)

---

مالّی مە، بەرەو بایە. هەمیشە دەرگەی پێوەدرایە.

---

ماندوو حەسانەوە سەپان، دەستکەنەی نۆکە.

---

مردن بۆ ژیانە، نەك ژیان بۆ مردن.

---

مریشك ئاو بخواتەوە. سەربەرز دەکاتەوە.

---

مریشك تەنگاوبێ، هێلکە لەسەر بەرد دەکات.

---

مشتەریی ئێواران، یا دزە یا حیزە.

---

مەیدان مشك نەخواردیە.

---

مێشکی نەزان، ئەشکەوتی شەیتانە.

---

میوانی بێ دیاریی. کافر نەبێ بەماریی.

(ماری: مالّی)

---

مانگای شەریکی. گورگ دەیخوات.

---

میرات میکرۆبی شەڕی ئەولادە، بێ ڕەنج دەستکەوتوو، دەدرێ بە بادا.

---

مێردی پاشی، وەکی جاشی

میوانی خوشکێ، ڕۆن لە ئانیشکێ

مەیموون هەرچەند ناشیرینتر بێت، گەمەی خۆشترە.

مانگی قوون هەر هەڵکرێنە.

مەلە دەکا ماسی نییە، دەخوێنێ بولبول نییە، دەشفڕێ وکۆتر نییە.

(قاز).

مێردەکەم کەپووم دەبڕی

دەربڕینێکی ژنانەیە ژن گەر کارێك ناشیتە بێیتە پێی نایەوێ بیکا بەکار دەهێنێ!

مانگەشەوە تەقری تەوە

گوران حیزەی چاو بەخەوە لێخوڕە مانگە شەوە

مرۆڤی زانا قسەی دانا دەبێ.

د.کەمال مەعروف

مرۆڤی نەزان چەنەبازە زاناش تێی دەگات.

د.کەمال مەعروف

مەعجوونی شەکری، خانە لۆ بەکری

بەکر: مەلا ڕەش/برای عەولا کەچەر

مەلەوەزی: زۆرلێکردن

مارەك بووم لەریزی ماران

وەکو بوخچۆکەی سەر هەرزاران

داکی منداران بردی بەتاران

مەڕی بێ خاوەن خۆراکی گورگە

ماشە: جۆرێکە لە راوەماسی جگەلەوەش مانای (مقاش)یش دێت.

مارە بەجاشکرایە.

ماری خۆی دەناسی

مەلای گەورەی کۆیە ساڵی ١٩٢٠ وتویەتی ئەگەر کورد ئێستا دەوڵەتی بۆ دروست نەکرێ، سەد ساڵی تر نابێتە خاوەن دەوڵەتی خۆی...ئاوا سەد ساڵەکەی تێپەڕی.

مژانە: دارێکی درێژ بوو درێژییەکەی دوو مەتر زیاتر بوو.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧)

---

ماڵیان دەڵێی ئاشی ئاو لێبرایە.
ماڵی من کاولە ئاشی خۆتە

---

ماقۆڕ: ماقۆڕیش هەر هەرکەوە وقۆرتە ئاوە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٨)

---

ماشەر: جۆرە بەنێکە بۆ کاتی ڕەنگکردن بە چۆکەکان هەڵدەکرێتەوە.
(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١١٧)

---

ماری خۆم کونە کۆترە. لەهەموو جێیە خۆشترە

---

مارز: ریخی بەرخی ساوایەکە هێشتان دەستی بەگیا خواردن نەکردووە.

---

مارزا: پیسایی ئاژەڵ، یا منداڵی تازە لەدایك بوو، چونکە زۆر شل وناسکە.

---

ماهوزەر: جۆرە تفەنگێك بووە

---

مەحچەچە: خرنووکی وشك کراو.

---

مەلەکوت: فریشتە، مەلایکەت

---

مەڕی قولە: ڕەنگی سپیە گوێ یا دەمو چاوی قاوەی یا سوورە

---

مەشقەرە: بڵێسەی ئاگر

---

مەیین: پەیت بوونی شیر وبوون بەماست

---

متو: هۆگر، گیرۆدە

---

مرومۆچ: تووڕە، پەست. زویر، نیگەران ومۆن

---

مزور: خزمەتکار، ئەوانەی هەموو کارێکی ماڵە کێخواو دەوڵەمەندەکانیان دەکرد

---

ملەوەز: ملەستور زەبەلاح

---

مۆریلە: بلقی وردی ئاوی گەرم

---

مۆغەرە: بڕبڕەی پشت

مۆلەق: کەشکەلانی فەلەك

میژۆك: بەرخێکە دایکی مردبێت.

میناك: مینەك، کەری یەدەگ، بەو کەرانە دەگوترێ دوای ئەوەی بارەکەی لێ دادەگرن وبەبێ بار بەگەر کاروانی دەکەوێ. مێنەك.

مێچك: لامێژ، بەرخێکە لە گوانی دایکی گوانی هەموو مەڕێك بمژێ

مێچکەمێژك: مەرایی، زمان لوسی. ماستاوچی

مێخەك بەند: جۆرە خەناوکەیەکە لە قەنەفر دروست دەکرێت.

مێخزنجیر: زنجیر وسینگ

مێخلەمە: جۆرە چێشتێکە لە هێلکە وتەماتە دروست دەکرێت

مێراب: لێوار

مێوژۆکە: کاتێك رەزی ترێ نەکێلدرێ بەرەکەی ورد وخراپ دەبێ

مرۆڤ هەیە نێو هەناوی هێندە رەشە
بەسیمی هەموو دونیا سپی نابێتەوە
(د.کەمال مەعروف)

مرۆڤ هەیە بۆی دەبی بەپرد دەترونجێنێ
(د.کەمال مەعروف)

مەرەدج نییە هەرکەسێ قەلەمی لەیەخەی دابێ خوێندەواربێ
(د.کەمال مەعروف)

مرۆڤ ئەگەر قسە بەهەرزان بکرێ نابێ بەگران بیفرۆشێ
(د.کەمال مەعروف)

مرۆڤی نەزان خۆی نانانسێ
(د.کەمال مەعروف)

مشە: زۆر
لەمشەیە

مار: ماڵ

**ما، بۆ ماڵ+نەما، بۆ چاڵ**

**مار لۆ لای ئاگر دەچێ بە شەودا.**

**ماچێ، چیە لۆ گەورە کچێ؟.**

**مار بیزانیایە دەیکوژن. نەدەهاتە دەر.**

**مار بەگەرما دەبوژێتەوە.**

**مار کیف فرێدەدا،خووی فرێ نادا.**

**مار هەتا وەکو مار نەخوات نابێتە ئەژدیها.**

**مار، لەکونی گچکەدا کلکی دیارە.**

**مارگر، لەماری گەورەش ناترسێ.**

**مارگر، مار دەیخوات.**

**ماری مارخۆریش هەیە**

**مارەی ژنی چاك باوەشێ گزگە.**

**ماسی فێری مەلە مەکە**

**ماسی، ماسی دەخوات. و ماسی گر، هەردووکیان.**

**مام ڕێوی لەناو داوە، مریشك سەری هەڵداوە.**

**مامۆستایی ئاسانە، عاقڵ بوون گرانە.**

**مامە، مامە+دنیا دەستەوامە.**

**مامەڵە بکە بە پوول+نەوەك تکای پیاو ماقووڵ.**

**مامەڵە بێگانەیە.**

**مامەڵە، محەکە.**

**مامەڵەی قەرزی، لاشەی تۆپیووە.**

**مامەڵەی نەزان+وەك گەڵای خەزان.**

**مامەڵەی هەوەڵ+پڕیە لە گێچەڵ.**

**مانگ بگرەو ئەستێرە بەردە.**

مانگ تا باریك نەبێ، پەنجەی بۆ ناكێشن

مانگ وخۆرمان ڕوون بن+ئەستێرە چێوو لە قوون بن.

مانگ هاتەدەر لەتەما+ئەستێرە نرخی نەما.

مانگ، بەڕۆژا قەدری نییە.

مانگا ورگی دڕابوو، پووشیان تێدەخنی

ماڵ، لۆ زەوقە+زەوق چوو، تەوقە.

ماڵکردنەوە و زەماوەند+خۆڕێکی دەخا بەند بەنێ.

ماڵ لەچاڵ، خێو لەماڵ.

ماڵ، یا لۆ غەرەز+یا لۆ مەرەز.

ماڵت مەحکەم کە+خۆت بێ خەم کە.

ماڵی بەبێ خۆر+نەخۆشینی زۆر.

ماڵی بێ ژن، بیری بێ دۆڵچەیە.

ماڵی بێ ژن+هێلانەی جن.

ماڵی بێ گەورە+مەزاد خانەیە.

ماڵی بێ میوان، گۆڕستانە.

ماڵی بێ حەوشە+قاچی بێ کەوشە

ماڵی پاش مردوو+ لۆ دۆعا کردوو.

ماڵی پڕ دۆیە+مێشی لێ کۆیە.

ماڵی پڕە لە گەنم و دنکێ جۆ ناخەنە ناو قە برەکەی.

ماڵی جوانان، شایی و یاری+ماڵی دزێو، شین و زاری.

ماڵی چاو لەدوا، خێر ناداتەوە.

ماڵی حەرام لایەقەی حەرام خۆرە.

ماڵی حەرام لە ڕێگەی حەراما خەرج دەکرێ.

ماڵی دنیا، نیوەی تەڵایەو نیوەی بەڵایە.

ماڵی سمۆره+ داری کلۆره.

ماڵی زۆر کوڕ+پڕه له قره قڕ.

ماڵی کچان خاوێنه.

ماڵی کراوه+جلی دووراوه.

ماڵی له هه‌واره، ئیشی له شاره.

ماڵی وورچ+ ترێی کاڵ و کرچ

ماڵی ڕووت، وه‌ك له‌شی ڕووته.

ماڵیشی چوو ئیمانیشی چوو.

ماڵه گه‌وره+چێشتیان چه‌وره.

ماینی ڕه‌سه‌ن، سواری خۆشه.

مرخی خۆشه لۆ ووتن- کۆڵ نادا تا خۆر که‌وتن.

مرداره‌وه بوو له گوورون ناترسێ.

مردنی عالمێك، مردنی عاله مێکه.

مرواری له ئاو، گه‌وهه‌ر له‌چیا.

مرۆڤی بێ پاره+بێ که‌سووکاره.

مرۆڤی بێ منداڵ+پاشای بێ خه‌یاڵ.

مرۆڤی دوو دڵ و دووڕوو -نه دینی هه‌یه نه ئابڕوو.

مشت به‌ی له دیوار+ده‌چێژی ئازار.

من به خوێنم ببم سوور- دنیا ببێ ژێره‌و ژوور.

من کردم به کزه کزه+ئه‌و بردی به دزه دزه.

منم کردم ڕۆژو شه‌وێ+ئه‌و بردی و دای به هه‌وێ.

من کردم واق واق+تۆ ده‌یخه‌یته تاق.

من که‌پیشه‌م هه‌ر سواڵه -ئه‌م ماڵه نه، ئه‌و ماڵه.

من له‌ئاش بووم و تۆ تۆزاوی بووی.

منارەی زۆر بەرز، لە دوور دیارە.

مەشکەی مانگا، ساڵی لە دارە و ساڵێ لە خوارە.

مەلا و حاکم یەکگرن+هەژاران دەبێ بمرن.

مەنجەڵ بوو بە مەنجە لۆکە ئاغاژن بوو بە جنۆکە.

مەڕ مەلەوانە، بزن بەردەوانە.

مەڕ، هەزار خێر و فەڕ.

مەڕوانە لۆ ڕوو، بڕوانە لۆ خوو.

مەی لە مەیخانە و کەباب لە کەباب خانە.

مەیدان لۆ دلێر، کادان لۆ نەوێر.

میری خۆش باوەڕ+مێکوتە لۆ شەڕ

میوان، ڕووی خۆشە، خانە خوێ دلی بە جۆشە.

مێخەك، ڕەشە هاوڕێی دڵکەشە

مێشکی بێ باوەڕ+جێی شەیتانی شەڕ

مێشوولە، فیل ڕاودەنێ+مێروو، لە شێر تاو دەنێ.

مەودای مان ونەمان، یەك هەناسەیە

ئەم ڕێگا کورتەش، پڕ لە تاسەیە

(محەمەد دارياس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

منەتت بە پووشێك.

منەتت بە کێرم.

منەتت بە کێری کەر.

منەتت بە گونم.

مانگ لۆ من خۆش بێ، ئەستێرە چییە!.

مانگ لە من ڕوون بێ، ئەستێرە چێو بە قوون بێ.

مەڕوانە بەژنی وردی، بڕوانە هەلوگوردی.

مەڕوانە ددانی شاشی، بڕوانە بەختی باشی.

مانگا نەزایە، پەنیر دەفرۆشێ.

مردنی میری، چاکترە لە ژینی ئەسیری.

مام سەبرۆکە، بن بڕۆکە

مێش خێر لە گووەکەی نابینێ.

منەتت بە گونی بارگینم

مندارە هەولێری کێشکەی لەدەست بەزێ دەرێ نەزری شێخئەڵڵا بێ.

میرییان دا بە ئونباشی. لەپێشدا سەری دایکی خۆی تاشی.

مارمان پشتاوپشتە، شیری کاکم لە پشتە.

مادام ئەمڕۆ ترێ هات. سبەینێ هەنجیر پێ دەگات.

مامەی ترۆزی، ئەمڕۆنا سۆزی.

میزی کەفی کردیە.

ماری زۆر خێزان، ئاوی نییە لە گۆزان.

من کردم بە کزەکز، ئەو بردی بە زەبری قوز.

مـــــردن وەك كـــــەری بـــــەقاران, دەگـــــەڕێ لـــــە هـــــەموو مـــــاران.

(بەقار: بەقاڵ، مار: ماڵ)

مردن کەری دەجالە، لەهەموو ماڵە.

مرۆڤی پیر ئەگەر شابێت. سوار ئەسپێکی وەکو با بێت، بەڕۆژێکی لاوێنی نابێت.

مێوژە ڕەشە هەرچەندە ڕەشە، تامی خۆشە.

مەڕ بێ شوان بێ، گورگ دەبێتە بێری.

مامز دەرێ: یا ئەڵڵا. ڕاوچیش دەرێ: یا ئەڵڵا.

مرۆڤی بێ ئەسڵ، بیکە بە قەسر، دەبێتە کسڵ.

مەرد، بنوو لەسەر بەرد

میرییان دا بە دۆم، لەپێشدا دایکی خۆی گا.

**میوان حەبیبی خوایە.**

---

**مزگەوتێکی خراپ دەکات دێرێکی ئاوا دەکات.**

---

**مشك لە ماریا کلکی چەور نابێ**

---

**ملی لە چەقووی، دەسووی.**

---

**مل نادات.**

---

**ملهوڕی دەکات.**

---

**من لۆ تۆ مردی، تۆ لۆ من هیچ نەکری.**

**(لۆ: بۆ)**

---

**من لۆ تۆ مردی، تۆ من بە هێند نەگرتی.**

**(لۆ: بۆ)**

---

**من چیاو ئەو چیا، گۆلك مابێ گیا.**

---

**من بێژم بز، ئەو ئێژێ دز.**

---

**من کە بە ڕەنجی شانی خۆم بژیم،**

**سەری سەردارم بە ڕیشی زەعیم.**

---

**ملی لێ نا**

---

**مایین لە ژێر خۆم نەلەنگێ.**

---

**ماینی قۆتڕ، دەسپی شێی لێ نابێ.**

---

**مرخی لێ خۆش کردییە.**

---

**مردن پیری و جوانی نازانێ.**

---

**مردن شەرمی لەکەس نیە.**

---

**مردن کەری دەجارە، لە هەموو مارە.**

**(دەجار: دەجال، مار: ماڵ)**

---

**مردن خۆشترە لە چاوەڕوانی.**

---

**مردن نەبایە، پیاو پیاوی دەخوارد.**

---

مرۆڤی بێ ورات، تەیری بێ پەڕ و باسکە.

مریشك بە گارە گار دنیا تێ دەگەیەنێ کەمێلکە دەکات.

مردنی یەکێك، لۆ خەرکی خەو لێ کەوتنە.

(لۆ: بۆ، خەرك: خەڵك)

مارەکەم و حارەکەم، گەنمە سوورەی چارەکەم.

مانگ لە پشت کۆژە، لە ترکەن وایە ڕۆژە.

ماری درۆم کاول کرد

(مار: ماڵ)

مار، کەم کەم و وردە وردە جەم.

(مار: ماڵ)

مار و دارایی نهێنی دادە پۆشێ.

(مار: ماڵ)

مارت وێران بێ شەوە، لۆ منت نەبردەوە.

(مار: ماڵ)

ماری تۆ دەخۆم بە بەلاش، هینەکەی خۆم دەخەمە پاش.

(مار: ماڵ)

ماڵ خەڵکان، تا لچ کەڵکان.

ماری دنیا لۆ ئەوەیە بیخۆی، نەك بتخوات.

ماری دنیا یا لۆ کەیفێ، یا لۆ حەیفێ.

مار بە دۆیە، دۆش لۆسۆیە.

مار کاژ فڕێ دەدا، خوو فڕێ نادا.

مار هەتا ئەستێرەی خۆی نەبینێ، نامرێ.

ماری سڕی لە باغەرێ ناوە.

(باغەر: باغەڵ، گیرفان)

ماست و موو.

**مەیموون جوانە جلی کەی،**
**تەماشای قاچ و قوولی کەی.**

---

**مەیموون کە قوونی سووتا، بەچکەی خۆی دەخاتە بنی.**

---

**مردن دێت و جارێکە، تانەی ناکەس گۆڕەو شارێکە.**

---

**مێش خێر لە گووی نابینێ.**

---

**مێش لەبەر دەمی هەرنافڕێ.**

---

**مێش لە ماکی، کچ لە داکی.**

---

**میوانی ناوەخت، هەمیشە بەد بەخت.**

---

**میوان بە دیارییەوە جوانە.**

---

**میوان خۆشەویستی خوایە،**
**خێر و بەرەکەتی لەگەر خۆیدایە**
**(لەگەر: لەگەڵ)**

---

**مێکوتە بیکوتە، سووریژە بیکوژە.**

---

**مێووژ بێ قنچك نابێ.**

---

**مەمکی دایکی خۆی گەستییە**

---

**مەنجەر بوونە مەنجەرۆکە، ئاغا ژن بوونە جندۆکە.**

---

**مەگری لۆ مندار دەم بە مەمەوە.**
**بگری لۆ گەورە دەست بە قەمەوە.**
**(لۆ: بۆ، مندار: منداڵ)**

---

**مەلای دوانزە عیلم دەرەقەتی نابە**
**(مەستی وڕاستی)**

---

**مووی سپی، قەڵغانی ڕوو ڕەشی پیریە.**

---

**میراتی کەر، لۆ کەمتیار.**
**(لۆ: بۆ)**

---

**میوان بە دیارییەوە دیارە.**

---

میوانی خوشکێ، ڕۆن تاباسکێ.

موو ناپسێنێ.

موویان هەرکڕووزاند

مەڕ دار لەگەر مەڕداری. دیندار لەگەر دینداری.

(لەگەر: لەگەڵ)

مەرحەبای بکەی، پێ لە گونت دەنێ.

مەرحەبای بکەی، سواری پشتی ملت دەبێ.

من کە بەڕەنجی شانی خۆم بژیم، سەری سەردارم بە ڕیشی زەعیم.

ماینێ قۆتر، ئەسپی شێی لێ نابێ.

مـــن کـــە بـــە ئـــاکرت گـــەش دەبمـــەوە، لـــۆ بـــە دووکـــەرت ڕەش ببمـــەوە؟

(لۆ بەدووکەرت: بۆ بەدووکەڵت)

مێشکی سەری هەموانی برد.

مامان کە زۆر بوو، سەری منداڵ گیر دەبێ.

مامزی ماندی دەگری

مێش لە ماکی، کچ لە داکی.

مەڕە بە بەرگ، بەددانی گورگ.

مریشکی قوون هەردڕاو

مرۆڤ نییە، پێستی مرۆڤی بەسەردا کێشاوە.

مەرحەبا پایزەبرا.

مردووە، بە شیوەن زیندوو نابێتەوە.

مردی خەرک، باراشی ئاشە.

مەرگ غەیب، دیدار غەیب.

مار نابێ بە یار.

مردی بەشین وشیوەن زیندی نابتەوە.

من دەیکەم و ئەو دەیخوا.

مانگا بەکەڵ دەبەسترێتەوە، کەڵەگا نابەسترێتەوە.

مافڵەت مامڵەتە،دانیش منەتە

مەشکەی مالی میران،رۆژەك لەدارو ،دوور رۆژ لەخوارە

مەکە خزمەتی لاوان،بکە خزمەتی چاوان

مەولودی کورم خانەدانە،بەلام مەنجەلیان نییە

ماینی پیَ سپیە

مانگای ملاحستەر هەرچی یەکی پی دەزانی

مردوو لە مە چاکترە ناشۆرێی

ماستی مەڕی بۆی هەلدەپەرێ

میوان تێرن ئاویان رادەدێران

مەترە و مەکۆخە ئاغا لەرۆخە

مەکە لۆمەی کو دەلال یابەسەرخۆت دی یا بەسەر جگەران

ماندی و مردی کوڕانیش لیَ بردی

ماڵی ناوماڵان کافری بەحالان

مووی بە پاشی نادا

مانگ لە شەو مووی بچتەدەر

مار کوشتنی چەندەخێرە شاردنەوەشی ئەوەندە خێرە

مردی پارهاوێنی،ئەمساڵ بوی دەکا شینی

ماسی هەروەختێیکی بی گری تەڕە

مۆری دەمم نەشکایە

مێوژ بەمست،دۆ شاو بە ئەنگوست،هەمووت هەڵ ست

منت لێرە چاند

مامە سینی نابی بید وێنی

مافووری کاشانه

مەکەل تەدبیران،دەکەونە تەقدیران

مالّت مالّ نەبی،بازارت بازاربی

مەرحەبای سەد دینداری زەرورە

میوانی سعاتەکەی جاسووسی سالەکی

مزگەوت و سەیان نەوگوتیە

ملانیك بزنی نووسی بەگیسك

مار بە کلکی دەڕوا، بەسەری پێوەدەدا

ماریّ بابم سەر بە تۆزی، ئەمنی کوشتییە قیت و قۆز

ماری بە خوشکیّ هێلانەی مشکیّ

ماری بەاتش، مەلاش دەی خوا

ماری بیّ ژن، چۆلەوانییە

ماری دەکوژی، توولەماری بەخێو دەکا

ماری نییە شیوەی دەروێشی، بەبیّ دەرپیّ سەرچۆپی دەکێشی

مام ومامۆژن، سەری مارو دووپشکی دەکرۆژن

ماندی نەبی، شەرمەزاری نا مەردی نەبی

مەبە ئاغاژنی ژێر دەست ببە شوانی سەربەست

مەردی ڕۆژی، حیزی شەویّ

مەڕ جارەك دوونگایان هەردەوا، بزن لە قاقای پێکەنینی

مەڕ لاقی بەرخی خۆی ناشکێنی

مەڕو مێش، ساحێبی زوو دەباتە پێش، داویی دەیکاتە دەروێش

مەلامیزەری سپییە، هەناوی ڕەشە

مەنگوڕم، بۆیە بە گوڕم

مەنمی کردی، مەنمی بردی

مرداری کردەوە

مردن لەپیر بوونێ خۆشترە

مردن هەر ئەوە نییە بچیە بن گری

مریشکی ئاشەوانی، کەری سەپانی. سەی کۆرە گوندان، چییان لەگەر ناکرێ

مستە خۆرەك، لەمستە زێرەکی چاترە

موو و خوری تێکەر نابن

مێرەم دەبیێنێ، ئۆغەن دەشکێنێ

مێرد کەربابە، لەسەر ژنێ بە جوابە

مۆرەدار: جۆرە دارێکە ودارەکەرەکان بە بیور دەیانبڕی.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٧٩)

مینەگ: ئەو کەر وهێسترانەن لەکاتی کاروانکردن بۆ سواری بەکاردەهاتن.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٦٤)

ماهوزەڕ: تفەنگێکی لوولە ئەستوور بوو

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٩٠)

مارەبەجاش: دیاردەیەکی کرێت وناشرین بوو، جاران هەر پیاوێك ژنەکەی خۆی تەلاق دابووایە ودواتر پەشیمان ببووایە وژنەکەی خۆی بهێنابووایەوە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٦٩)

ماکاو: ئەم زاراوەیە بۆ پارچە تووتن بەکاردەهات واتا ماکاو لە قەتارە تووتن گەورەترە. چەند قەتارە تووتنێك واتا یەك ماکاو.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢١٨)

مردنی میری، چاکترە ژینی ئەسیری.

مەگەر گوونی بگرن

مـــــــەڕدار لەگــ ـەر مــــــــەڕداری، کــــــوڕدار لەگــــــەر کـــــــوڕداری.

(لەگەڵ: لەگەر)

# ن

نیمکە تری، بەمنی سری: یەکێك دەلەیەك دەکات بەمل یەکی دیکەی دا دێنێ، دەسە
چەورەکەی بەمن سری
لەڕۆژی ژیانەوە نافرەجای مەرگ ببینی
(ل٥٦٢ دیوانی راجی. لەوتەی نەورۆز ساڵی ١٩٤٧ لە کۆیە)

---

نەخیچێ: خوارنەبێ وشۆڕنەبێتەوە ونەچەمێتەوە
(ڕۆستەم حەوێزی ل٦١)
گەرەك واچاکە هەڵ بدرێ بخیچێ
دەنا دەروا هەموو رەنجت بەهیچێ
ئەبێ هەر خواستە هێزی وای رەگەڵ خەی
ئەگەر هات پێك کەوت ئەشکی نەفچێ
بەشەڕ بکشێنەوە بۆ دواوە مەچوو چێ

---

ناوبرێشك: ئەو دارەی نانی پێ ئەودیو ئەودیو دەکەن لەسەر سێرێ (ساج) بۆ برژاندن لەسەر ساج.بێ ناو برێشك نانت یا دەستت دەسووتێ لەسەر سێرێ

---

نەدار دەبیتە ماشە، نەزان دەبێتە پاشا. نەدار واتە هەژار

---

نەرێسرایە نەپێچرایە، تەقە تەقی جۆرایە، نەژاوە، نەشڵەقاوە، شڵقەشڵقی بەحەواوە

---

نەمار کلکی لەبیر دەچی، نەباغەوان گوری (گوڵی)لەبیر دەچێ، کوڕی، چیرۆکەکە وایە

---

نان وگایەکی لەکن وەك یەکە

---

نانت گەرم بێ، قاوەت سارد بێ

---

نەکەونە (کۆنە)رەز بەباغ بکە. نەهەتیو بە چراغ بکە، نەلە دوو چوان ئاخ بکە

---

نەمردی ئاگای لێیە، نەزیندی منەتی پێیە

---

نیشانەی باران بایە، نیشانەی نەخۆشی تایە

---

نەحوکمی حاکم، نە عەسای زالم. نەمەرگی موجافات

---

نەسۆفی قوون تەڕ، نە مەلای زوروەڕ نەشێخی دڵ تەڕ

---

نەهێستر دەزێ، نەخێ شین دەبێ

نێرەکەر دەزەڕێ، ماکەر دەتڕێ

نانی بە نانی، قازانجی گیانی

نان بە کرێ بەگووکەر مەدە

ناشیرین نارەزا لەکچان دەبنە قەزا

ناکەس بەچە: کەسی بێڕێز، هیچ وپووچ

نسێ: سێبەر-سایە

نسێی ئێواران سایەی سبەینان

ناوپووك: ئەو نێوانەـە لەنێوپەلکی گەڵای توتنی لەداو دراو بۆ ئەوەی هەوا لەنێوانیاندا بێ وبچێت

نافرەجا: ڕەزاقووس، هێسك گران

نەبان: ماڵاتێك شیر بە بێچوی خۆی نەدا

نازاو: ئەو زەوییەی فێری زۆر ئاودان بووبێ

ناندێن: ژووری چێشت لێنان، تەشتی یا سەبەتەی نان

ناهۆزە: شوان مەڕی زیاتر بێ لە خاوەن مەر ناهۆزە

نانی کەرت نەکەی

نان ومەڕانە: ئەوەی دەست کورت بێ هەندێ پارەی لە ماڵی زاوا وەردەگرت، بۆ خواردن ودەعوەتی پێی دەڵێن (نان ومەرانە)

(ل٨١ مێژووی شاری کۆیە)

ناخورێ: ناکەوێ

(سامی عەودالْ!)

زانین خەزێنەیە هەرگیز نابڕێ

بەرگێکی وایە قەت قەت نادڕێ

هەندە بەنرخە، بەکەس ناکرێ

زەوق ناکرێ بەکەس ناخورێ!

ناتانی: ناتوانی، پێت ناکرێ

(سامی عەودالّ)

واچاو دەبینێ کەپو دەکا بۆن

ناتانی بڵێی وانیە درۆن

---

نۆیین: زێراب، ئاوەڕۆ

---

نوبین: پێخەف، یاتاغی خەو

---

نانی بە دۆی ڕا نەگا

---

نووزەت لێبڕێ، دەنگت نەیە

---

نینۆکت نەبێ خۆتی پێ بخورێنی

---

نانەکی بەخۆشی نەخۆی

---

نە ئەو نانە بەڕوونە، نەئەو زەبرە بە قوونە

---

نە شاییکەرم، نەشاباش دەرم، بێلایەنم

---

نانی ئیلەڵایەت نەبێ

---

نەگوورا: جێبەجێ نەبوو، ڕێك نەکەوت

ئەرێ چ بوو هەر نەگوورا

---

نەخیچا: پێك نەهات

---

نۆردی: قەدەنان، پرێسکەنان. لەپیرێژنیان پرسی چەند مێرد، کردیە. گوتی: نۆ نان ونۆ نوردی هەرنانەی کتکەك لەسەر هەر کتکەی فەرخەك لەبەر، دەستم لە هەویرە هەرئەوەندەم لەبیرە.

(شەوچەرە ل٦١ سێ چوار نانیش قەد ئەکا ودەیکاتە نوردی)

---

نکەنك: ناڵەناڵ، نووزەنووز

کابراش بەنکەنك دەڵێ...

(شەوچەرە ل١٠٩)

---

نیچەك: کەمێك، هەندێك، پیچەك. قیچەك

---

نۆنەفشە: نۆبەرەی میوە بۆ یەکەم جار

چ جۆرە خواردنێك نایاب وخۆشە

لە نۆنەفشەی لەبۆیان دێتە سەرخوان (ڕۆستەم حەوێزی-مان ل٥٣)

---



ئەژنی غەزرۆك، نەپیاوی ترسنۆك، نەمندالی چاوچنۆك

(ئەمانە پەسند نین لە کوردەواری)

---

نەقەنەی بەربایە، نە گانی ناو کایە

---

نەدیتكۆکـــــــــــــــــــە: نـــــــــــــــــــەدی وبـــــــــــــــــــدی

نەدی وبدی کوڕێکیان بوو لەجیاتی ناوکی کیریان بڕی

---

نەکوو: نەبادا

(فازیل شەورۆ دەڵێ:

بەقەد مێژووی خۆشەویستی،

خۆشم دەوێی

لەگەڵ ئەوەش قەت نامەوێ بۆ جارێکیش ماچت بکەم (نەکوو)لێو وگەردن وزولف وئەگریجەت، (نەکوو)سوخمە وسینگ ومەمك لەدەست وپەنجەت ڕەنگی ئەڤینی من بگرن وەك کچەکەی (پارکی دایك) ژنکوژەکان بێن بە گوللەیەك بتکوژن

---

نازی،لەقەدەری جیازی

---

نەکردەی کارێ

کوو دەبا بارێ

(کوو-چۆن)

---

نیکۆپەی: بەختەوەر

وەکو بیستوومە ئەی باری نیکۆپەی

لە تەئریخی جەم وئەسکەندەر و کەی

---

نەشیری حوشتر نە دیداری عارەب

---

نەهیچی توو، نەهیچی من

---

نارە نارە، گۆشتی پارە

---

ناماقوولی کردییە

---

ناوێرێ فزە بکا

---

نابتە بار

---

نمەك بەحەرام

---

نۆرەی ئەوەیە

---

نینۆك لەهاری، موو لە هەژاری

---

نەورەس: تازە پێگەیشتوە، نەونەمام

بریندارم بە غەمزەی چاوی نەورەس

گرفتارم بە زولفی خاوی نەورەس

دیوانی عاسم ل ٧٨

لێکۆڵینەوە وساغکردنەوەی د. کەمال مەعروف

---

نەبان: خەشیم وخۆ گێلکردن

---

نیوداش: بەکارهاتوو

---

نەرمیشە، گەرمیشە، چەرمیشە، بەنەخینەکەی هەڵکێشە، تێ پرووشە وهەڵیلووشە!

(گیپە)یە

---

نێرگە: بن ودووسەری کۆڵەگە

سەرەکەی نێرگەی ناو ماڵەکەی کۆڵەگە کەویە سەرەکی لەسەر دیوارییە دوو نێرگەیە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل٥٩)

---

نابێ تۆزێ گۆشتی پێوە بێ بەرگەی دوو نەخۆشی ودوو شەقان بگری.

---

نانت جۆ بێ خولقت گەنم بێ

---

نیسکە، بەروپشتی نییە

---

نێرك: بنی دەستارەکەی لە ناوەڕاستی کون دەکەن دارەکی دەهێنن دەیکەنە سینگ

پێی دەڵێن نێرك

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (٦٥)

---

نەپێی هەیە نەپانی، لۆ خۆی دەچتە سەربانی

(دوکەڵ)ە

---

نانی بێ خێ دەخوا، ترێ سوور دەکەن

خێ: خوێ

سوور: سوێر

---

نازانێ شایی بکا دەرێ (دەلێ) حەوشەکە خوارە

---

نازمان هەیە، زۆرمان نییە

ناعیلاجی حەرام، حەلال دەکات

نامەوێبکێشم باری موحتاجی
گۆشتی کەروێشك وفسی تانجی

نانی جۆ، تا نیوەڕۆ

ناوی لە کولەکەی تەڕیش دا نییە

نە ئاسمان هەرم دەلووشێ، نە عەرد قووتم دەدا

نە ئەوەندە وشك بە بشکێیت، نە ئەوەندە تەڕبی بگوشرێیت

نە تەونم هەیە نە تەشی، ساتێ نەکەتمە خۆشی

نەحیز پیر دەبی، نەشێت ژیر دەبی

نەژن لەشایی هەڵبژێرە، نە کوڕ لە بەهارا

نە شای دووکەسم. نە کەوای بێکەسم

نانێکی بخۆ، دوان بکە خێر

نوشتەی مەلا هەر فەن وفێڵە، داخوا چارەنوس لە شوون کێ وێڵە

نەمشتم هەیە نەپشت

نەبەبەرخی تێر شیر بوو، نەبەکاوڕی تێر گیا

نەخۆش مێوانی خوایە، زۆری لێ بکە لۆ خواردن

نەچووە بچێ

نەوسن کافرە، دەبی موسڵمانی کەی

نەهێندە شیرن بە بتخۆن، نەهێندە تاربە فرێت دەن

نەختێ روونەکەی بز قووتیلەکە، مەلای خواردیتی یان پشیلەکە

نەچیە کن وی: (نەچیتە لای ئەو)

نوقە: فزە، نوقەت نەیە (فزەت نەیە، قسە نەکەی)

نان هات، بوو بە نان ودۆ، نان ودۆش بەقوڵق وخۆ

ناوێرێ فزە بکا، ناوێری برێ (لەل)

برێ: بلێ

---

نەبوونی نەبینی خوایە

---

نەوازەیی زایەندی: شڕۆڕ جنسی

(هۆشیاری یاسایی-فوئاد تاهیر سادق ل٨٩)

---

نۆرە بەنۆرە، قازانجی زۆرە

---

نانی بەیانی سیحەتە، نانی نیوەڕۆ عادەتە، نانی ئێوارە قەباحەتە

---

نانی جۆ دەخوا، دەستی بەسابوون دەشوا

---

نەخێری دی نەخۆشی، هەمیشە دەسورێ وەك تەشی

---

نیشتەنی: ساکن

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٦٤)

نەگەیشتیتە بواری ئاو، دەرپێ دادەکەنێ

---

نەزان مندارە گەر پیریش بێ

---

نە تڕە دەنگی بێت، نە فسە بۆنی بێ

---

نەشێت بتگێ، نەشێتی بگێی

---

نەکار هەیە نەپیشە، هیزە ڕوونەکەی بکێشە

---

نە (کەر)مان لەگاڕانێیە، نە حسابمان لەگەڵ گاوانێ یە

---

نامەرد تێربکەی لەنان وکەرە. کەتێری خوارد پێی دەڵێ کەرە

---

نان بەتەمای چەلاوی خەڵکی بی تێ مەکووشە

---

نان بەنانی، منەتی کەس نازانی

---

نان ونمەکی دەتگرێ

---

نانی لەسەر سێرێ نەسووتایە

سێر: ساج

---

نانی بابی خۆی نەخواردییە

---

نانی خۆت بخۆ بە ئاوێ، منەتی خەڵکی ناوێ

---

نانی دڕاو پینە دەکات

نانی لێ کەوتە ناو ئاوێ. گۆتی باخێری مردیم بی

نانی هاری بەدەمەوە گرتیە

ناوبانگی چاك بۆ بنیادەم لەزێڕی چاکترە

ناتانی سەری خۆی بخورێنی

ناکەسان مەکە بەکەس

نەك ماین چەقەڵ بتگێرێ ساتێ

نخونی کردەوە: سەرەوبنی کرد

ڕماندی چادری سەرمایەداران

نخونی کردەوە بێ تەقە قازان

(ڕۆستەم حەوێزی-مان ل٥٦)

نەفیچێ: خوارنەبێتەوە

نە ئاشە، نەباراشە، دنکی دنکە خاشە، بیخۆی ونەیخۆی ماشە، بزانی باشە (ماش)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٩)

نەلەعەردی نەلەئاسمانێ

دەخوات روحی ئینسانێ

(خەم وخەفەت)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٩)

نەکەرە نە هێسترە

باری لەلەشی قوورسترە

(مێروو)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٦٩)

نەدەمی هەیە نە ددان

فیکەی لێ دەدا وەك شوان

(مازوو)ە

(هەگبەی دێرین-هۆشیار نوری لەك ل٧٠)

نەنێرە نەمێیە، ئیشیش بەجێیە (نێرەمووک)ە

---

نێنگوێن: گولك دوو ساڵی تەواوکردبێ بۆ مێ بەکاردێت

---

نان بەهیشکی، قوەتی مشکی

(هەگبەی دێرین–هۆشیار نوری لەك ل٢١٤)

---

نه دەفرۆشرێ، نەدەدۆشرێ

(مێروولە)

(هەگبەی دێرین–هۆشیار نوری لەك ل٦٥)

---

نە داکتە نەبابتە، نەخوشکتە، نەبراتە (خۆتی)

نرکە: زنیر: دەنگی شێر

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨١)

---

نۆشدەرگو: عیادە الگبیب

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨١)

---

نۆشدار: ژو صحە، ژوعافیە

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨١)

---

نۆشگە: مصح

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨١)

---

نیهاد: چمیر، ویژدان

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨١)

---

نەدیاری: غیاب

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨٢)

---

نەنگ: تچر، انگار

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨٢)

---

نیوانکار: وسیگ، نێوەندگیر

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨٢)

---

نێوانکاری: وساگە

(هۆشیاری زمانەوانی–فوئاد تاهیر سادق ل٨٢)

---

ناوەخن: حشم

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل۸۳)

---

نەخرنیکراو: ملعوز

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل۸۳)

---

نیشتەجێگە: مستوگن

(هۆشیاری زمانەوانی-فوئاد تاهیر سادق ل۸۳)

---

نانی نێو چەوانی خۆی دەخواُت

---

نوسین زمانی دەستەوبیرە

---

نێرەکەر هەتا ئێواریٚ بزەرِیٚ، هەر دەچێتەوە سەر سینگ وپەنکیٚ

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخی ل۲۸۳)

---

نیوکردی، نیونەکردی. خائینان لە قوونیٚ بردی

---

نیوەی دوینا بە بوختان دەسووتیٚ

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخی ل۲۸۳)

---

نوقرچ لە خۆت بگرە ئەوجا دەزانی چەند دێشی

---

نەساری دووبوار. نەگوری کیٚ بەگوار، نەزینی تیل خوار

---

نزیک لەشەڕ وفیتنە

---

نەمردیان ئاگای لێیە. نە زیندییان منەت پێیە

---

نەژنی مالآن گەڕ، نەمالی لاپەڕ، نەسەگی هەلوەڕ

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخی ل۲۸۰)

---

نەخۆشی کێو لەبن دێنیٚ

---

نەزۆر گۆتن، نەقسەنەکردن

---

نەزۆر هار بە، نەزۆر هەژاربە

---

نەدوومایین لەچۆمەکی، نەدوو هەویٚ لەماڵەکی

---

ناوی نەبوو لەناو ناوان، گووی دەکرد لەسەروچاوان

---

ناوبانگی چاک بۆ بنیادەم لە ئالتوون چاکترە

---

نانی سوارکەر یان تارە یان نەبرژایە

---

نانی خۆت بخۆ بەئاوێ، منەتی کەس پێ ناوێ

---

نانەکەشت دەخوات، سفرەکەشت دەدڕێنێ وزەمت دەکات.

---

نانی هەبێ لەکاسێ، بابی خۆشی ناناسێ

---

نانی لە قوزی ژنی خۆی دەخوات

(پەندی کوردی-هێمن ئیلنجاخی ل٢٧٨)

---

نانی بابی دەخوات

---

نەمناسی، ناتناسم

---

نان پارچەی بکەیت، وەك خۆی لێ نایەتەوە ویەکتر ناگرتەوە

---

ناموێ: نامەوێ

---

نانوێ: ناخەوێ

---

نەرم وحەلیم: هێواش ولەسەرخۆ وئارام وهێمن

---

ندی وتووراوە: واتە بێ کەڵك بووە

---

نەزر: نزر، نەدر، خێرلەخۆگرتن بۆ هاتنەدی مرازان

شەوانە

نەزر لەخۆی دەگرێ و

لەقاپیی خودا دەدا

(ماچەکانی ئێوارە کازیوە- فازیل شەوڕۆ ل١١٢)

---

نێم: شێ، تەڕایی

نێمەکی تەڕایی هەیە

---

نەرم ونیانی-دەرگای ئاوەدانی

(د.کەمال مەعروف)

---

نەزان هەر نەزانە ئەگەر بارەکەشی عیلم بێ

(د.کەمال مەعروف)

---

نە دەوڵەمەندی دز-نەفەقیری نۆغز، نەپیری شقە قووز

(سێگردکان وسێبەر ونشینەکانی-ئاراس ئینجاخی ل٥٤)

---

نەنە: داپیرە، نەنك، خوّی (نانا)پیرۆزترین خواداوەندی دایکە

(فەرهەنگی کوردناسین-مەلا عەبدول خالقی شوانی ل٢٨٠)

نەژنی بۆگدیان بە، نەکەری سەرمۆردیان بە

---

نۆشانگ: جێگایەکی تەرەمەنی، مرگباتی لێ بخورێتەوە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٩٠)

---

ناوشێل: خباڤە

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل٢٠٨)

---

نۆشەمەنی: مەشروب

(زاراوەسازیی پێوانە-مەسعود محەمەد ل١٨٠)

---

ناگونجێ لەخوا بەولاوە شتێك هەبێ هەموو هەرپاك وچاك بێ

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٣٤)

---

ناوەڕۆکی هەرەنرخدار بۆشەرەفی دیموکراسی ئەوەیە: خەڵك رەخنە کاری خاوەن دەسەڵات بگرێت

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٣٠)

---

نوسخەی بیروباوەڕی هیچ تاکە ئینسانێك لەمندا موتوربە نەبووە، بەچاوی هیچ کەسێك سەیری جیهانم نەکردووە

مەسعوود محەمەد

(لەوتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٦٥)

---

نووسین وگێڕانەوەی دەماودەم ئەگەر ئینسافی لەگەڵدا نەبێت خاوەن هونەری گەورە وجوانمەردی بێفێڵ وشەخسییەتی تێر وپڕ رووت دەبنەوە موفلیسیش دەبێتە خاوەن بانك

مەسعوود محەمەد

(لە وتە بەنرخەکانی مەسعوود محەمەدی فەیلەسووف-ئامادەکردنی حەیدەر عەبدوڵڵا ل٥١)

---

نایان پێتەوە، لێت نابێتەوە (ناوە)

---

نیوەی لە هەورە، نیوەی (لێر)ەیە (هەولێر)ە

---

نیگبەتی مێشك کون وکۆر دەکا (کۆر: کوێر)

---

نەرم کێشی: لێ سەلماندن ولێبوردن ونەرمی نیشاندان

---

نەقارەو نەقارەخانە: مۆسیقاخانە. جێی مۆزیك ولێدانی ئامێری مۆزیك

---

نان و دۆ، خوڵق و خۆ

---

ناکەم لۆمە، هەر بۆ خۆمە

---

ناوی هەیە و ناوکی نییە

---

نوێژ لە سەر داوێنی بکە

---

نەدار نە پەردوو، لەعنەت لە هەردوو

---

نە بای دیوە نە باران، هەڵدەبەزێت وەك جاران

---

نە بووکی نزیك باوان، نە کوندەی نزیك ئاوان

---

نە بخۆیت نەبکەیت، تەماشای سای گەردنی بکەیت

---

نە پێت بکەویَ لە مێخ، نە بچۆ بۆلای شێخ

---

نە خانووی سەر شیو، نە ئاغا ژنی کچە تیو

---

نە دەرزیە بشکێت، نە دەزووە بپچڕێت

---

نەزان بەیەك پیَ، زانا بە دوو پیَ تیَ دەکەوێت

---

نە سەربانی لێژ، نە بانگیری گێژ

---

نەسیَ ماین لە دۆڵێك، نە سیَ ژن لەسەر مۆڵێك

---

نەمام بەخواری گەورە بێت، بە پیری راست نابێتەوە

---

نەرمە غار: غارێکی لەسەرە خۆو نەرمە وڵاخ وسوار ماندوو ناکات.

(کەلەپوری کودەواری-کۆکردنەوە وئامادەکردنی عەباس چنارانی-چاپی دووەم ل٨٨)

نوسخەی بیرو باوەڕی هیچ تاکە ئینسانێك لە مندا موتوربە نەبووە

ناڵ بێ بزمار نابێ.

نەخۆشە، شەکر وشیری پێ خۆشە.

نەدار دەبێتە ماشە، نەکەر دەبێتە پاشا.

نەرمۆکەی بن کایێ، ئاگرت بەردا دنیایێ.

نەسیرو نەپیاز، نە ئینسانی وەسواس.

نەقڵی کفر، کفر نییە.

نەقیزە دەزانێ کەر بەکوێدا ئەڕوا.

نە گوللەی هەیە ونەباروت. ماڵێکی هەیە ڕەق وڕووت.

ناوێرێ هیچی پێ برێ.

نەگەنمە نە جۆیە، وردە زەردەی بێ بۆیە.

(هەرزن)

نەقازە نەبازە، بولبولی خۆشی ئاوازە.

(تار)

نیشانەی ئاو شینایی یە

نەبارەبەرت جاش بی

نەترکەنت وەلاش بی

نان ودۆیە، دۆش بۆ سۆیە

ناخی مرۆڤ سفر نییە بۆ هەموو کەس بکرێتەوە

نیوەنمەك: پەپۆکەی ئاردبوو گەرم دەکرا وچەور دەکرا لەسەر قونێر.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٧٠)

ناوژۆکە: جۆرە تێلێکی سەرخڕی نێو زەنگوڵە لەگەڵ جووڵانەوەی زەنگوڵەکەدا دەجووڵێ وبەلێواری زەنگوڵەکە دەکەوێ ودەنگی دێت.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٦)

ناوشەنگ: ئەو بزنەیە کاری نەماوە وشیریش هەر دەدا.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩١)

---

نێرپڕ: ئەوەیە شوان نێر وبزنی بەپێش خۆی دەدات ومێگەلی مەڕیش دەکەونە دوای شوان ونێر وبزنەکان لەکاتێك شوان ئەوەی دەکرد کە پەلەی بووایە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٩٦)

---

نیر: دارێکی ئەسپێندراوە ومەتر ونیوێك درێژە وئەوەندەی مژانە ئەستوورە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل٢٨)

---

نانی ئیلەڵڵا: هیچ نەبوون لە ماڵ. تەنها نانی خوا پێداویشیان نەبێت نانی ئیلەڵڵایان نییە.

---

ناوپشتە: بنچینە وڕەگەز، ڕەچەلەك

---

ناودۆك: ئەو دوو دارەی لە هەردوو دەستەکان وپێیەکانی مەشکەی دەبەسترێ.

---

نابڕە: دیوارێکە لەنێوان دوو خێزانان دروست دەکرێت.

---

نەچی من ونەچی توو: کەسمان لەکەس

---

نەدیتی ونەناسی: غەریب

---

نەرمادە: ڕێزەی دەرکەو پەنجەرە. نەر (نێر)+مادە (مێ)بەهۆی ئەوەی وەکو شمشێرە دەچنە ناو یەکتری.

---

نەرمەغار: گورکە لۆقە

---

نەزانمە: لە وشەی نەزا نوما هاتووە واتە رابەر بۆ نەزانان، بریتییە لە بەنێك لەسەر دوو گورد بەباری پانی لەدەستگای مافور دەبەسترێت.

---

نۆکی: جۆرە ڕەنگێکە لەنێوان ڕەنگی سپی ورەنگی زەرد.

---

نیوداشت: بەکارهاتوور، هێشتا بەکەڵك بەکارهێنان دێت.

---

ناپرسێ پیس خۆر+لە ڕەش و لە لۆر.

---

ناز، دەرچوو لە ئەنداز+دەبێ بە لە قەو بە گاز.

نازانێ گوو بخواو کەوچك هەڵدەگرێ.

ناز پەروەردە- ڕەنگی زەردە.

نازی زۆر+سووکە و قۆر

ناشی تاشە؟- لەکوێ باشە.

ناعیلا جیمە، ناجی باجیمە.

ناکەس بکەی بە یار+ئەتگەزێ وەك مار.

نان دانرا، شەرمی ناوێ.

نان لە وەرد+ماڵ لە مەرد.

نان مەدە بە تەڕەس+ئابڕووت دەبا بە هەوەس.

نان کە ڕۆیی لە تەنوور+سەگەل خۆی کێشایە ژوور.

نانی بە ئاوی ناگا.

نانی جۆ دەخواو سمێڵی چەوور دەکا.

نانی جۆیە و پی خۆری دۆیە.

نانی ڕۆم دەخواو باجی دەدا بە عەجەم.

نانێك بدە بە برسی+نەوەك ئایەتولکورسی.

ناوت وون بێ- نەك قێزەون بی.

ناوکی کەواند.

ناوی خۆی بیستۆ تەوە.

ناوی گورگمان برد+خۆی بە ماڵا کرد.

ناوێرێ تڕ بدۆڕێنێ.

ناڕوانن لۆ کاری وردی+دەڕوانن لۆ دەست و بردی.

ناڕێکە زەوی؟ لێی هەڵدەکەوی.

ناڵ بە بێ بزمار ناوەستێ.

نالەی شەو، لە گوولە تیژ تر دەڕوا.

نۆ کێك دەکاتە نۆ تیکە.

نە باخکێڵەو نە دێبەر+ترێ دەخوا لە سێبەر.

نە بارە بەرت جاش بێ، نە ماڵت لە ڕێی ئاش بێ.

نە چێشتی ماش و نە پڵاوی ناو ئاش.

نە چێشتە چەورە و نە بێگاری گەورە.

نەکار لۆ ناکەس+نەگریان لۆ کەس.

نەماڵت نزیکی کانی و نەژنت نزیکی باوانی.

نەمێزی هەیە لۆ مشتم+نەڕێزی هەیە لۆ پشتم.

نەبێ لە دەرپێی شڕم، هەرگیز نابینێ کوڕم.

نە پشتی ئێشاوە+نە جەفای کێشاوە.

نە ترسای دژمن لاڵە+ترسای بە سەرتا زاڵە.

نەخشی سەر ئاوە.

نەخۆشین لە پیر +دەلکێ وەکو قیر.

نەدەترپێ، ترپاندیان.

نەئەس بێ کارە و نە کار دیارە

نەرمان جێ دێڵێ و ڕەقان دەکێڵێ.

نەرمەو ئێسقان پێکەوەن.

نەرمەقووت، هەموو کەس دەیخوات.

نەزان، سەری زێڕ بێت، بنی فافۆنە.

نێر بوو، دەیخۆی+مێ بوو، لۆ دۆی.

نێرەکەر بوو بە بەشکەر+بەشی خۆی دەباتە سەر.

نەفرەت لە سیاسەت، جا لە ئامانجی
میللەت ڕاو دەکا، بێ توولە وتانجی

(محەمەد دارياس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

نانی خۆ بخۆ بە ئاوێ. منەتی خەڵکی پێ ناوێ.

نانی خۆم وکوزەرەی کانی

میوانی هەی میوانی

---

نیسان گەیشتە بیستی. گا تێر دەخوا بەنوستی.

---

نان نانی گەنم، دین دینی موحەممەد.

---

ناوبژیکەر زەینی ڕۆنە

---

نەتڕییە، ئەو دەرێ بە کنرم. (دەرێ: دەڵێ)

---

نینۆکەکانم دەخورێنم. دوو کەسان بەشەڕ دێنم.

---

نە ئەم ونە ئەو، تف لەم. لەعنەت لەو.

---

نانێکی خواردییە، بەو ڕوونە، هەر دەچێتە ئەو شوونە.

---

نێرەی بێ کێرە.

---

نانەڕەق ودۆی ترش، دەخۆی بخۆ، ناخۆی چش!.

---

نان خۆشیان بوو: واتە نان بەزەحمەت دەستدەکەوت.

ژیانی ڕۆژانی بیرەوەریم ئەحمەد دڵزار ل٧٢)

---

نە موسوڵمانی بە حەقە. نە کافری موتلەقە.

---

نە هەر شتەی ماش، نە پڵاوی باش.

---

نەرمە بڕ نە سفرە دڕ.

---

نەمایە دەنگی دلێران.

چەقەڕاو دەکەن لە جێگای شێران.

---

نەمخواردیە لەو کاسە. درم ناکا وەسواسە.

(در: دڵ)

---

نەمر خودایە.

---

نە قوز بە کێر فێربی، نە گوێرەکە بە پەمۆ.

---

نە کۆنەکانی بە باغ کە، نە لە دوای چووان ئاخ کە، نەهەتیم بە چراخ کە.

نە ماستاو بە دۆیی، نە دۆستایەتی بە ئاکۆیی.

نە بە بەرخی تێر شیر بوو، نە بە مەڕی تێر گیا.

نە بەقا بەموو، نە وەفا بەشوو.

نەتڕی دەنگت بێ، نە فسی بۆنت بێ.

نە تووتنی جێ مین، نە کچی داك حیز.

نەبوویتە قۆچەقانی، فینگەی دێ.

نە گۆشتی کەروێشکم دەوێ، نە بۆن فسی تاژی.

نە زڕ داك دەبیتە داك، نە زڕ باب دەبیتە باب.

نوێژە و عومرێکی درێژە.

ناز بدە بە پیاز، دێتە گازە گاز.

نامەردت کەن.

نان بدە بە نانەوا، با نیوەی لۆ خۆی ببا.

نانی بدە بە نانکەرێ، کاری بدە بەکارەکەرێ.

نان بە تەمای چەلاوی خەرك تێ مەگوشە.

(خەرك: خەڵك)

نان و شەقی دەدەنێ.

نان ناس و خوانەناس.

نان و پیاز، بە قات و نیاز.

نانی بە دۆی ڕاناگات.

نانی بخۆ مەردانە، کاری بکە گورگانە

نانی خۆ بە ماستی خەڵکی دەخوات

ناوی خۆی بیستیتەوە.

ناوکی بە حیزی بڕایە.

ناوکی کەواند.

ناوکی هینایەوە.

نۆ بدە بە هەشت، هەشت بدە لە مشت.

ناتانن گونیشی بگرن
(ناتانن: ناتوانن)

نە ڕەنج بۆ ناکەس، نەشین بۆ مردوو.

نازداری دایکێ.

نامەرد تێر بکەی لەناو کەرە، هەر کەتێری خوارد پێت دەڵێ کەرە.

نەمریشکی ئاشەوان. نە کوڕی بێوەژن، نەکەری دەروێش.

نازداری داکی.

نەهێڵن دروێنە بکەن. خۆ داسەکەمان لێ ناستێن.

نان ودۆی ناگاتە یەك. هەمیشەش سەلامون عەلەیك.

نانی خۆتە هاتۆتە ڕێگات.

نازیشی هەیە وگازیشی هەیە.

نانەك کەمتر بخۆ، برسییەك تێرکە.

نە ئەوەندە ساردبە بتەزێنێ، نە ئەوەندە گەرم بە بسووتێنێ.

نەخۆشی، نان لە بن کۆشی.

نەبرسی بنێرە لۆ نانکرین، نەبێ ژن لۆ خوازبێنی، نەپیر لۆ کەر کڕین.

نەبۆن تسی تاژی و نەگۆشتی کەروێشك

نەخواردن لەسەر تێری.نەلباس لە بۆ کوێری

نانی شوانی چ لەمووری،چ لەتووری

نەلەڕ بەزستان،نەپیر بە چ وەختال

نە بەکاری تێر شێر بووم،نە بەمەڕی تێر گیابووم

نەبڕبی (بڕک)نەکودوور لەعنەت بی لەهەردوو

(نینۆك و گۆشت)

نەلەشایی کەرانین،نەلەشایش دەرانی

نۆ ڕۆژوان بگری لە ڕەجەبی،لەخوای بخوازی تەڵبی

نەمریشکی ئاشەوانان،نەکەری حەممالان،نەکچی بەقالان

نان و ماست چێشتی بە ڕاست، نان و دۆ چێشتی بە درۆ

نانی بە هیشکی، قوەتی مشکی

نانی تیری، ماری فەقیری

نانی تیری، بەپەنیری، لە پێش میری

نانی جۆ، بەبڕەکا دۆ، لە پێش ئاکۆ

نانی کەسێك بخۆ، نانی خواربی

نانی هەرزن، بەدۆی بزن، لە پێش مەزن

نەکیژی بێوەژنیٚ، نەگۆلکی پیرێژنی

نەلەکن دارکەری بە، نەلەکن گانکەریٚ بە

نەمرکی لە سەرچۆمی، نەئاشنایەتی دۆمی

نە هەورە نە سایەقەت هەتا جوان هەنە، لەگەر پیران مەنوون قەت

نووشتەی دەزانی، قورعانیٚ نازانی

نووهاتن، کەون خەراتن

نوێژکەری مانگی ڕەمەزانیٚ زۆر ترە، لە جاشك و گۆلکی گاڕانیٚ

نیوەی هەزار چوار سەدوبیست و پێنجە

نێك: یان لانێکی ڕاستە وچەپە

نیرگە (کاریتە): دارێکی درێژە وئەستوورە وبەقەد درێژایی خانووەکە درێژە ودەیخەنە سەر ناوەندی خانوو وگرانایی سەربانەکە دەکەوێتە سەر ئەو نیرگەیە.

(هەگبەی زاراوە ڕەسەنەکان-حەمید ڕەشاش-ڕێکخستن وپێداچوونەوەی: سەلاح سەعدی ل١٤٨)

نانیش لە نیو نانی. وەرگێڕان لەکابانی.

---

نەکەرە، نەبارە، بەهرەدوولا هەر خوارە

---

نـــە مــــارت لەســــەر شــــیو بــــێ، نــــە ژنــــت کچــــە تیــــو بــــێ.

(مار: ماڵ)

---

نە کردەی کارێ، کوو دەبا بارێ؟

---

نەشای بێشالیار، نەترۆزی بێکالیار.

لە خۆشیاندا تڕ بە قوونیەوە ڕاناوەستێ!

---

نێرەکەریان سەر پشك کرد،

کێری گەورەی لۆ خۆی هەربژارد.

---

نانی نەبوو بیخوا، داوای ماست و تەڕە پیازی دەکرد.

---

نە خۆی خواردی نە قۆناغی،

سەگان خواردیان بوو بە داغی.

---



هەتا پیرێك دەمرێ، هەزار گەنج دەمرێ

هەتا دار نەرمە، دەچەمێتەوە

هەتا دووری، سێوی سووری، هەتا دوری مام وپووری

هەتا نزیکی، لاتەریکی

هەتا ددانم هەبوو، نانم نەبوو

ئێستا نانم هەیە، ددانم نییە (ددان: دانی ناو دەم)

هەتا ژیربووم،پیر بووم

هەتا عاقڵ فکری کردەوە، شێت دەستی خۆی وەشاند

هەتا مانگا بەرەڵلا بێ، کەڵەگا حەژنیەتی

هەردەچنی وتێی دەئاخنێ: هەرتێی دەکات ودەخوات

هێلەپەپە: خواردنێکە، بەنان و هێلکە وتەماتە دەکرێ

هیلەوان: بانگەواز

هەرامە: هێن: فڵانەکەس، وانەك

دەڵێن: حەمەغای کۆیە ئەو وشەی زۆر بەکار دێنا

هەراو: هالاو، گەرمایی

هەنگێن: ئەو کاتی، ئەو وەختی

هێور: هێمن، لە کۆیە ناو وناوناو هەیە بەناوی (هێور)

هورژم: هێرش،پەلامار، هەڵمەت

کە هرووژمی کرد

پـــــۆلیس ویســــــتی قــــین وکینـــــە هورووژمەکـــــە بوەســــــتێنێت

(لە کاروانێکی دوورودرێژدا فاتیح رەسول ل٨٨)

هەراش: گەورە (منداڵەکەیان هەراش بووە)

هەراش: لەسەر دارە راچروو داندراوە بۆ خانوو پێی دەڵێن هەراش

هەراش کرایە هەموو دارەریٚ یەکە سەری پرکرایتەوە

(مێژووی شاری کۆیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل٥٩)

---

هاش وهووش: قرە وبرە وهەرەشە وگورەشە

---

هینجانە: ئەو گۆزەی گوڵی تێدا دەروێ

(ڕۆستەم حەوێزی ل٢٦٩)

ئەما گوم گومە وکوپە وەرکانە

جەرە وگۆزە ودیزە وهینجانە

ئەکوندە ومەشکە هیزە وهەمبانە

ئەستێ وبەرد وقاو خمخانە

---

هەیتە: پۆلیس، پاسەوانی میری

لەو وەختەی دا (هەیتە) خەڵکیان بە تۆبزی پێش خۆیان ئەدا.

(شەوچەرە ل٥٨)

---

هەیتە باشی: سۆزانی. قەحپە، لەشفرۆش

---

هەژدەری تەلەعفەر: سەر بەهەموو دەرگایەك دەکات

---

هەپرە گونی هەتا دەمری ژنی منی: گێل وگێژ

---

هۆقە چرمەکی بە کەپووەیەتی

---

هەری پرێوە: شی کردنەوە، لێك جوداکردنەوە: هەلی پەردێوە، هەلپەردافتن

---

هیربار: قاپ وقاچاغ

---

هێلە: نۆبەرەی هەنجیر

---

هێرەگدان: جێی قاپ وقاچاغ وئیستیکان

---

هەولێری، بە جووجکەکی ناوێری

---

هاوێژ: تلفظ (رێنووسی) (تایەر صادق ل١٨)

---

هەروو: برۆ، بچۆ

هەروو لە گۆڕی فلان مختاری گوڵێکی بکەوە

(شەوچەرە ل١٠١+١٠٢

مەلای گەورە:

بەباڵی عیلم بفرە وەك تەیران

بەهێزی عیلم هەڕوو بن بەحران

---

هاوگیان: خێزانی دوو برا پێی دەڵێن هاوگیانی یەکن

---

هەشت بێ، لەمشت بێ، نەك نۆ بێ نەبێ

---

هەوێ: دوو ژن خێزانی یەك پیاون، هەوێ ببتە کراس وکەوێ هەرنامەوێ

---

هەرگرتە: لە کەلایانێ بەکاردێت. کەلاتێ گرتن لە دورەوە

---

هۆدە: ژوور، چاوە

---

هیزە: دەفری ڕۆن

---

هیشك: وشك

---

هەراشی: بەو زەل وچیغ وپوشەش دەربن لەدوای گەڵا دارکردنی یانی پی دادە پۆش (هەراشی کردووە)

---

هاتینەوە لە دەشتێ، دوو کۆترەکەی بەهەشتێ

---

هێرۆ سۆران، خۆزگەم بە بزن وزۆران. واتە ئالیکی هەیە بزن

---

هۆری هۆری، هاتەوە سەر هینە بۆری، پەشیمان بۆوە، گەڕایەوە

---

هەر عەقرەی (عەقڵەی)لە خەسارەکی بەعاقڵ وژیران دەگوترێ

---

هەش: وەکو شەکر وایە ڕەنگی شینە، هەوێنی گرتنەوەی خمە المانی وبریتانی هەبوو نرخی زۆر گران بوو یەك کیلۆ بە (١) دینار بوو

سەر بەهەش چ دەکەی لێرە

لە هەشێت نێم واتە درۆ دەکەی

---

هاوارەبەرە: مەڕی بەتاڵان بردوو

---

هەترە: بڵاوەپێکردن وهەریەکە بەلایەك دا ڕاکردن بەسەر لێ شێواوی، مریشکەکەمان هەترە بووە، هەڵاتن بە ترسەوە

---

هەنوونێ وەمنوونێ کێری موسای بە قوونێ، ئەوڕۆ خۆشترە لە دوونێ (دوێنێ).

---

هەرزانی کردیە: واتا ماندوویەتی بێ ئافرەت بووە

---

**هۆی نەلی:** بێرتن یەل. گوڵ خواربۆتەوە

**هەوشنگ:** مەڕی بەرخ مردوو

**هەڵپەردراو:** دار هەڵپاچین، هەڵپاچینی دار

**هەڵپیتوو:** دارەك هەڵپاچرابێ وڕێك خرابێ

**هەڵخزاو:** گیانداری وشککراوە وکارلێکراو

**هۆپ:** سەرسوڕمان: ڕاوەستە

هۆپەکم لەخۆم زانی

**هەترەش:** زراوچوون. تۆقین

هەترەشی چوو

**هەڵەوەڕ:** زۆربلێ، چەنەباز

**هەرکەو:** ماقۆر، ئەو قۆرت وئەو چاڵە بەردانە ئاوی تێ دەکەوێ

**هەلقوم:** نوقڵ، نوقڵ شەکرۆکەیە

هەری تەکینە لە داکت کەوی، جارەکی دیکە وا هەر ناکەوێ

هەی تاتووکە تووکە

بردیان بەجۆتە بووکە (جۆتە بووکی میری بردیان بە یەخسیری)

کاك ئەحمەد وەك خرنووکە

هەر بە کیری منداری (منداڵی)دەمیزی

هەتا گندۆرگندۆر بوو. قەوم وقیلەمان زۆر بوو، گندۆر کەوتە بڕانێ خزم هاتە قڕانێ

هەویر لە شێلانێ، ئەنگوتك لە کابانێ، نان لەناو نانێ

هەندە رەزیلە هێلکەی پینە دەکا

هەستن لەسەرخۆ، لاقتان بدەنە بەرخۆ

هەر کەرەکەی جارانە کورتانی گۆڕایە (گۆڕاوە) کەر بچێتە بەغدایە نابێتە ئێستر

هەر ددانەکی بەچل ساران (ساڵان) هاتیە (هاتووە)، زۆر زان وفێڵباز

**هاکا:** زۆری نەماوە. لەپڕ، هەیبنە، هاکا قەوما

هەوێز: شوێنی ڕاگرتنی مەڕ وبزن

هەر ڕێیەك لۆ سەر جێیەك

هەقە هەقدارم، بەشە بەشدارم

هەمبوو هەمبوو هەمبانە، هەیتم هەیتم مەیدانە

هەیاران، هەر وەکو جاران، ئەی خودا

هات شێر بوو، گەڕایەوە ڕێوی بوو

هۆردوو: هەردووکیان

مریمـــی شـــێخ حەمـــە ســـاڵح کـــە کچـــەکانی شـــەهیدکران هـــاواری دەکـــرد: هۆردو کچم

هەرزە: زۆر بڵێ، چەنەباز

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت ئاینی لاچان

ئاهێستە برۆ نەك وەکو دێوانەی هەرزە

(دیوانی حاجی قادری کۆیی ل٩٦)

هەرکەسێ لەخۆی بەشکە

پڕ قوونی مار ومشکە

هەرەج ومەرەج: فیتنە وهەراو هۆریا

وەلێکین فائیدەی چی هەرەج و مەرەجن

لە وەعدا لەگەڵ یەکتر بەمەزحن

(دیوانی حاجی قادری کۆیی)

هەنبانە: لەپێستی ئاژەڵ دروست دەکرێ بۆ زەخیرە تێکردن

هەرزاوە: لە گۆشەی دیوار دروست دەکرا بە دار وقوڕوشتیان لێدادەنا پان وبەرین بوو

هەرەپاس: زۆر وەڕو چەنەباز

هەڵیتەکێنە بارت سەنگینە (خاوەن ماڵ)

نابەخوا تۆش ماڵت ڕەنگینە (دز)

هەرزەکار: مراهق. سەرەتای لاوی جوانکیلە، جاحێل

هەرەوەز: کاری بەکۆمەڵ

هەردێرا: خزی وکەوتە خوارێ

هەلاهەلا: هەپرون بەهەپرون

هەلوور بەلوور تەکامە

زەرد وسوور وشەمامە

ئارنجی بن بارنجی

سلیمان قینجی

لەخۆشناوان

دەگری چاوان

چاوان بەگوو

پێم تێوەرچوو

هەڵگرە ئەتوو

هەتا ئاو بۆشتربێ. ئاش خۆشتر دەبێ

هەتا خوا قەرەمی لێ دەدات

هەتا ئێوارێ دوو منداری حیزی هەیە

هێڕ: گێژو وێژ

هاتەهات: دەنگۆ. قسەوقسەلۆك

هێلکەی سەر کولاتکەی

هاوینان شل وەل

زستان جەوار لەمل

هەر پەڕە شاییە

بووکە بەخۆڕاییە

هێلینگی برا: زۆر ماندوو بووە

ژن لەکاتی جل شووشتن ونان کردن دا دەڵێن هێلینگم برا

دەڵێی دای ئەلسە ورێ یە

هەندە جوانە بەدەرکەوە ناچی  واتە قەڵەوە

هەندە شتی بەدەستە، بەرد بگوشی ئاوی لیٚ دیٚنی

هەروەك خەنجەری دەبان، ناوکالاٚن ناوەستیٚ، خەنجەری دەبان خوٚی لەکالاٚنیٚ ناگریٚ

هاوینە وزیٚرینە

هاوین بەرەی فەقیرە

هەناسەت بریم هەناسەت بریٚ جەرگت پساندم

جەرگت بریٚ تیٚچینە باراشەکم بدەیی خودا

(تیٚچینە: نوٚرە)

(میٚژووی شاری کوٚیە نەجیبە خانی جەلی زادە ل (١٢٥)

هەدار هەدارانیٚ:  گەمەیەکی منداڵانەیە، ئەماوە لەناو منداڵان دەکرا لە کوٚیە

هەی کەر هەی کەر:  گەمەیەکی ناو فەقیٚیان بووە لەبەر ئاگری ئاگردان دەیانکرد

هیٚلکە بەبوٚنیٚ:  کوڕ وکچ پیاو وژن لەدەوری ئاگردان لەزستانان دەکرا لە کوٚیە

هیٚلکە درزین-بن هەنگڵی:  گەمەیەکە لە زستانان لەبەر ئاگردانی هیٚلکە لەبن هەنگڵ دەشاریٚتەوە

هەندوٚکە هەندوٚکە، لەپیٚش خەڵکی دەڵیٚی بووکە

(چرا)یە

هەندوکە وهەندووکە، لیٚی دەباریٚ بەفروٚکە

-هیٚلەگە ئارد دەبیٚژیٚ-

هەتا دەروٚی نایگەیەی

(سیٚبەر)ە

هـــــــــەتا نـــــــــــەی بەســــــــــــتیەوە، نـــــــــــاروا

(کەوش، پیٚڵاو)ە

هەتا بمیٚنیٚ پراوو گوٚشت، قەوم دەمیٚنیٚ پشتاو پشت

پراو:  پلاٚو

هەتا شەو نەبی، قەدری مانگ نییە

هەتا نەتڕی، چارمەشقی دانەنیشت

هەتا بتڕی، قوونی خۆی دەدڕی

هەر قەومە، قوونی قەومی دڕییە

هەر پەنجەی خوونی خۆی لێ دێت

هەر خوایان یەکە

هەر ددانێکی بەسەد ساڵ هاتییە

هەر ڕۆژە یەکێ، ددانی لۆ تیژ دەکاتەوە

هەر سەرێك، سرێکی هەیە

هەر چاوێکی چل جندووکەی تێدایە

هەر گورەی (گوڵ) بۆنی خۆی لێ دێ

هەر چار (چاڵ) هەر قەنی لۆ مەخلووقی خوا

هەر خۆی دەکەوتێ بە تۆفیقی خوا

چار: چاڵ

هەرقەنی: هەڵکەنی

لۆ: بۆ

هەرکەسی باوڕکات بە باوەڕی ژن

مار وێران دەبێ وەك مارەکەی من

باوڕ: باوەڕ

مار: ماڵ

هەر لەعەرش هەتا قورش

کەس بەدۆکەی خۆی نارێ ترش

نارێ: ناڵێ

هەر مەردێ، بەردێ

هەروەك مارمیلۆك، دەچێتە هەموو کونێکی

هەر چەند ژیر وخەرك شوناسی، تالێت نەقەومێ خەرك ناناسی

خەرك: خەڵك

هەرچی باهێنای، با بردی

هەرچی مێرووڵەی كردی بەساریٚ
حوشتر لێسی دا هەر بەقەپاریٚ
ساریٚ:ساڵیٚ
قەپاریٚ: قەپاڵیٚ

هەرچی نازانی برۆ بپرسە
پرس عەیب نییە برۆ مەترسە

هەركەس بەرز بفڕیٚ، نەوی دەنیشیٚ

هەزار چەقوو دروست دەكا، دەسكی تیٚ ناخا

هەركەس سیرنە خوات بۆنی سیری لیٚ نایێ

هەراتن عەیبە لۆ پیاوی شەڕكەر
بەرام هەندیٚ جار پێی دەڕێن هونەر

هەموو كەس لە شەرواری خۆی پیاوە

هەركەسیٚ نیشتمان پەروەربیٚ، یان دەبی بمریٚ یان دەربەدەبیٚ

هیچ دوكەرەك بیٚ ئاگر نییە
دوكەر: دوكەڵ

هەنگوینە، لە پێستی سەی

هەوای بەری، دای لەسەری

هەویر بپەڕیٚ، مێوان پەیدا دەبیٚ

هەی هەی داوای قوزی لووس وبیٚ تووك دەكا

هەڕە وبڕەی لێك ناكاتەوە

هیچ كەس لەزگی دایكییەوە فێر نەبووە

هێواش رۆیشتن، نابتە هۆی نەگەیشتن

هەشت چاوی هەیە، جوان نای بینیٚ (جاڵجاڵۆكە)

هەر پەلێکی بەدەست ئیزراعیلێکەوەیە

هەنگوینی بێ مێش هەنگوینە

واتە: مفت وئاسانە

هاوڕێی ئەو زەمانە، هی سەر خوانە

هەتا خوا هەق دەکا، دڵ شەق دەباو تەق دەکا

هەتا نەیدا لەتەبەق، نەیگۆت ئەلاهوسەدەق

هەتا هەوراز نەبڕی، قەدری نشێو نازانی

هەر بڕێ (بڵێ) ئەو نانە بەو ڕوونە

هەر ئیمان سزێ، دین سزێکی هەیە

هەر نایە نایە سارێ جارێ دێ

یان لۆ گلەیی یان لۆ کارێ دێ

هەزار دوژمنی مەردت هەبێ، دۆستێکی نامەردت نەبی

هەر هەموویان گۆلکی مانگایەکن

هەق بەهەق، حاجی لەق لەق

هەر هەموویان جاشی کەرێکن

هەڵمگرت هەنبانە ئاردی

ماوەیەك پێم ڕابواردی

بەخۆشی لێم دەخواردی

هەموو خشەیەك مار نییە

هەورە ڕەشەکە فێربوو بێمان

هەر لەخۆیەوە سەر دەدا لێمان

هەر بوونەکی: حتمی

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٦٦)

هەلخواز: انتهازی

(کۆمەڵزانی وکورد-فوئاد تاهیر سادق ل٢٦٦)

یوسف، بەجوانی کردار +خودا کردی بە سەردار.

یەك گرن ڕێوی وچەقەڵ+دەبنە پاشای جەنگەڵ.

یەکیان نۆبەرە+یەك پاشەبەرە.

یەکێ پڕ دەکا+یەکێ قڕ دەکا.

یەکێ دەڵێ ماتمە+یەکێ دەڵێ میراتمە.

یەکێ لە برسا زگی دێشێ و یەکێ لە تێریدا.

یەکەم مووشتەری خۆت مەڕەوێنە.

یا ئیلاهی گەردیلەیەکی وەك من

دەبێ چیبم تا ببمە دۆست و دوژمن!

(محەمەد داریاس: هەندێ لە وتەکانم، ٢٠١٩)

یومە ویابە، یەك حیسابە.

یەك چاوی سەد چاو بوو.

یەك عادەتە، دوو مەحەبەتە، سێ قەبیحەتە.

یاخوا قەت پیر نەبی.

یەك دەمرێ، یەکێکی تر جێ دەگرێ.

یەك دەکات و یەك دەبات

یەك بێ چەقڵی چاوی دوژمنێ، تەك بێ حەلوای لۆ خواردنێ.

یەك لە خۆی شەیدا بوو. ڕفیقی لۆ پەیدا بوو.

یەك و دووی لێ ناکا.

یەکیان دەبرد لۆ سێدارەی، ژنەکەی دەیگۆت هاتیەوە خەنەم لۆ بێنی.

یەکێ مرد و یەکێ مردار بوو،

یەکێ بە دەردی خودا گرفتار بوو.

یەکێ نانی نیە داوای دۆ دەکا.

یا دەبم بە خانی خانان یا دەبم بەشەرتی شوانان.

یاخوا نەچێتە خەوی کەس.

---

یاخوا بەشت هەر ئەوە بێ.

---

یاخوا توونچی، نەبێ بە حەمامچی.

---

یاخوا کەر و بارت بەخێر بێ.

---

یاخوا نینۆکت نەبێ، خۆتی پێ بخورێنی.

---

یاڕەبی کەس نەکەوێتە سەر دەم و زاری خەڵکی.

---

یا لەگەر دایکی منداران،

یا لەگەر بووکی گەورە ماران.

---

یاڕەب لەسەر عومرم هەرگری، لەسەر عەقڵم داینێی.

---

یاسەمەن دەمرێ لۆ نانێ،

دوو ڕبە گەنم دەدا لۆ گانێ.

---

یاسین لۆ کەر دەخوونی.

---

یەکەم تەخت ویەکەم بەخت.

---

یەکەم دەست کار وبارە، دووەم دەست ژەهری مارە.

---

یەکێ خاسە، خاڵۆ ئەلیاسە.

---

یەك لە جافان بمێنێ -هەقی خۆی هەر دەستێنێ

یا یدە لەمردنە.تەتکە لە گەردنە

---

یایە بەکتانی،کاك بەگونانی

---

یاسینی گۆلکی

---

یایە لۆمەی منی کرد،لۆ خۆی رشکە ڕنی کرد

---

یەك پا لەدەشتێ،دووپای گەیشتی.دایە بەرنەقلاَن خستیە سەر پشتێ

---

یـــارم: جـــاران وشـــەی بـــارم لەگـــەڵ قســـان زۆر بـــەکاردەهات.

(هەگبەی زاراوە ڕەسـەنەکان-حەمید ڕەشـاش-ڕێکخسـتن وپێداچوونەوەی: سـەلاَح سەعدی ل٣٠٢)

---

یەکەم بەکارهێنانی (کانزا)بۆ دروستکردنی ئامرازی ساکار بە کوتانی (مسی سارد)لە کوردستان بووە. بەپێی پشکنین ولێکۆڵینەوەی شوێنەوارەکانی.

(فوئاد تاهیر/لەنێو شانازییەکانمان سلێمانی ٢٠١٧)

---

یەکەم جار لە کوردستان کشتوکاڵ دەستی پێکردووە، کشتوکاڵ لە ئەو شوێنانەی کوردستان ٨٨٦٢ ساڵ پێش ئێستا بووە

(فوئاد تاهیر/لەنێو شانازییەکانمان سلێمانی ٢٠١٧)

---

یەکێ دەیگۆت ئای گونە،

یەکێکی تر دەیگۆت لە توو بەد تر منم.

---

(حەفت ترینگە)چێشتێکی تێکەڵ لە باینجان و کوولەکە وتەماتە وپیاز و...حەوت جۆرە کەرەستەیە تێکەڵ دەکرێ لە بابەتی چێشتی مجەورە(مزەوەرە).

ئەو وشەو وتە وپەند وزاراوانە، زیاتر وراتی کۆیە دەگرێتەوە، بەخۆشناوەتی ومەنتکایەتی وئۆرمزیار وجاف وشێروانی وئاکۆیی ولوڕیی وهەمەوەند وسورچی ومەنگوڕ وبڵباس وبابان ومامەش ومەنمی وپالانی وشێخانی وجولەکە ودیان وزەردەشت...لەوێ ژیاون.

زۆر لە بنەماڵەکان لە باکوور وڕۆژهەلاتی کوردستانەوە هاتوون بۆیە بەرفراوانە شارو دەشت ولادێیەکان وپیشەوەرەکان دەگرێتەوە!. جاران شەقڵاوە وهیران وخەلەکان وبناری کۆسرەت و... سەر بە وراتی کۆیە بوون، کۆیە کاروان سەراو جێی بازرگانی وبازاڕێکی بەهەرمێن وپڕتەکیەوخانەقای شێخەکان ودیوەخانی ئاغایەکان وخوێندن وحوجرەی فەقێیان وخان وکەسایەتی گەورە بوو ئەو تێکەڵیە وایکردبوو فراوان بێ لەڕووی زمان وکەلتوور وکۆمەلایەتی وپێشکەوتن ورەوشەنبیرییەوە.